ساڵی چواردەهەم زستانی ٢٠١٣
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# سەردەم
73

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

راوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی

ئیمەیڵ
govarysardam@yahoo.com

www.serdem.net

# ناوەڕۆک

## فیکرو فەلسەفە ٤ ـ ٧٣


* پلاتۆن | میشائیل برۆت | و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال | ٥
* هێزی یاسادانان... | د. محمد تۆفیق گولسۆی | و. لە تورکییەوە : ڕەسوڵ حەسەن | ٢١
* هەڵاتن لە ئەقڵ... | د. حسێن بەشیریە | و. لە فارسییەوە: کارزان محەمەد | ٤٣
* لە سوریاوە بۆ پاریس | هاشم ساڵح | و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع | ٥١
* هێرمێنۆتیک لەسەرەتاوە... | د. بهرام مقدادی | و. لە فارسییەوە: بابەک سەحرانەوەرد | ٦٧


## وتارو لێکۆڵینەوە ٧٤ ـ ١١٣


* شێوەکانی لێکۆڵینەوە... | فرانس نۆیمان | و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی | ٧٥
* عەدالەت و دیموکراسی | خۆسێ ساراماگۆ | و. لە فارسییەوە: کاوە گولکار | ٩٥
* ماف | ریچارد فاک | و. لە فارسییەوە: ب. باران | ١٠٣
* ئەوروپا چۆن... | هاشم ساڵح | و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع | ١٠٩


## گفتوگۆ ١١٤ ـ ١٣١


* گفتوگۆ لەگەڵ ئورهان پاموک | و. لە سویدییەوە: هیوا قادر | ١١٥
* گفتوگۆ لەگەڵ فرانسیس فۆکۆیاما | سازدانی: ممدوح المهینی | و. لە عەرەبییەوە: سەردەم | ١٢٣


## ئەدەب و هونەر ١٣٢ ـ ١٧١


* هەوری پەمەیی | عەلی ڕەزا مەحمودی ئێران میهر | و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر | ١٣٣
* شیرە خۆرەکە | ئەلبێرتۆ مۆراڤیا | و. لە عەرەبییەوە: دڵسۆز حەمە | ١٤٣
* چەند شیعرێکی | واڵت ویتمان | و. لە ئینگلیزییەوە: ئازاد بەرزنجی | ١٥١
* نامە بۆ میلنا | فرانز کافکا | و. لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد | ١٦٣

## نووسەرانی نۆبڵ ١٧٢ ـ ١٧٩


*خوان ڕامۆن خیمەنێز ڕۆبەرت بلیی و. لە ئینگلیزییەوە: هێرش سەعید ١٧٣


## وێستگەکان ١٨٠ ـ ١٩١


*ماڵئاوایی دواهەمین بیرمەندی... ئامادەکردنی: سەردەم ١٨١
*برا گەورەکەمان و. لەعەرەبییەوە: باوکی پایان ١٨٥
*چیرۆکە سەیروسەمەرەکان... و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ ١٨٨
*ئەوان کتێب دەسوتێنن و. لە عەرەبییەوە: فرمێسک ١٩٠


## بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم ١٩٢


ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

# پلاتۆن

بەشی دووەم

میشائێل برۆت

و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

## لێچواندنی هێڵ

لێچواندنی هێڵ ئەو دیدە سەرجەمییەی کردەکێتی ئـاوەڵا دەکـات کە لە لێچواندنی خـۆردا تەنیا ئاماژەی بۆ درا. ئێمە لە لێچواندنی هێڵدا ئەزموونی هیچ شتێکی نوێ لەبارەی ئیدێی چاکە ناکەین، بەڵام ئەم لێچواندنە بەواتایە، چونکە پلاتۆن لێرە هەندێک روانگەی ئەو تێڕوانینە کە ناونراوە تیۆریی ئیدێکان، دادەڕێژێت و دەشێت پێکەوە لەتەک دیالۆگەکانی مێنۆن، فایدۆن و سیمپۆزیۆندا دیدێکی سەرجەمیمان بۆ فەلسەفەی پلاتۆن لە دیالۆگەکانی قۆناغی ناوەڕاستدا پێبگەیەنن. بۆیە لەبار دەبێت کە مەبەستەکانی پلاتۆن، گریمانەی بناغەیی و گرنگترین ئەرگومێنتەکانی ئەو بۆ ئەم دیدەی



میشائیل برۆت




کردەکێتی، لە لێچواندنی هێڵەوە دابڕێژین، لێرەشدا دەبینین کە ئێمە تەنیا لە سنوورێکی دیاریکراودا دەتوانین پڕمەغزایانە لە تیۆرییەکی ئیدێکان بدوێین. پلاتۆن سۆکرات نابزوێنێت بۆ ئەوەی گۆڕان بە سیستەمێکی فەلسەفەیی – دۆگمایی بدات، سیستەمێک کە ناوبنرێت ڕێبازی پلاتۆن، نەخێر ئەو نەخشەیەکی دیدی ئێمە بۆ کردەکێتی دەکێشێت کە وەڵامی پرسیاری تایبەتی دەداتەوە و کێشەگەل چارەسەر دەکات، بەڵام پرسیارگەلی دیکە دەخاتەوە و زۆر کەم ڕۆشنە کە داخۆ یان چۆن ئەو پرسیارانە شیاوی وەڵامدانەوە بن.

سۆکرات داوا لە هاوگفتوگۆکەرەکەی دەکات پێشبینیی هێڵێک بکات کە بەسەر چوار بەشی نایەکساندا دابەشیوە. هەر یەکەی ئەم کەرتە جیاوازانە نیشانەیە بۆ بەشێکی کردەکێتی و بۆ جۆر و شێوازێکی مەئریفەی بابەتەکانی ئەو کایەیەی کردەکێتی. پلاتۆن لە لێچواندنی خۆردا جیاوازیی کرد لە نێوان جیهانی دەرککردن و ئەو شتانەدا کە بە هزر شیاوی ناسینن، بەم جیاوازیکردنە جیاوازیکردنێک لە نێوان کایەکانی (CE) و (AC) دا دەگونجێت. با سەرەتا رووبکەینە کایەی ئەو شتانە کە بە هزر شیاوی ناسینن. کەرتی (AB) تەرخانکراوە بۆ کایەی ئیدێکان، فۆرمی مەئریفەی ئەم کەرتە بریتییە لە ئاوەز، واتا ئەوە ئاوەزە کە دەتوانێت ئیدێکان بناسێت. کەرتی (BC) تایبەتە بە کایەی بابەتەکانی ماتماتیک، واتا ژمارەکان و فیگورە ئەندازەییەکان. ئەمان بەرێی زەینەوە (Verstand ملكە الفهم) دەناسرێن. چ ئیدێکان و چ بابەتە ماتماتیکییەکان سەر بە کایەی ئەو شتانەن کە دەشێت لەبارەیان بزانرێت. بەرانبەر ئەمە مرۆ لەبارەی بابەتەکانی هەردوو کایەی (CD) و (DE)، کە بریتین لە کایەی بابەتەکانی جیهانی ئەزموونمان و سێنسیانە شیاوی دەرککردنن، تەنیا پێی دەکرێت بۆچوون (Meinung) چێبکات. کەرتی (CD) تایبەتە بە بابەتەکانی جیهانی دەرککردن. ئێمە هەر گریمانەیەک لەبارەی ئەوان بکەین، گریمانەکە شتێکە کە تەنیا دەتوانین بروامان پێی هەبێت. کەرتی (DE) تایبەتە بە کایەی سێبەر و وێنەدراوەکان، بە دیدی پلاتۆن تەنیا وادانان (Mutmassung) لەبارەی ئەوان شیاوە.

بۆ راڤەی لێچواندنی هێڵ درێژییە جیاوازەکانی تاکە کەرتەکان گرنگن. کایەی ئەو شتانە کە تەنیا بە هزر شیاوی ناسینن(AC)، دوو ئەوەندەی کایەی جیهانی دیارە (CE).هەر یەکەی ئەم دوو بەشەهێڵە جارێکی دی بە هەمان رێژەی ٢:١ دابەشێنراوە. کایەی ئیدێکان (AB) دوو ئەوەندەی کایەی بابەتەکانی ماتماتیکە(BC)، کایەی بابەتەکانی جیهانی دیار (CD) دوو ئەوەندی کایەی سێبەرەکانە(DE). پلاتۆن نایەوێت درێژیی کەرتەهێڵەکان وەک دەسوێژێک وەربگرێت و بەرێیەوە گۆتەی (مەقولە) چەندێتی لەبارەی کردەکێتییەکەمان (Wirklichkeit/ Aktualität) چێبکات، بەڵکو دەیەوێت شتێک لەبارەی پابەندی کایەیەک بە کایەیەکی دیکەوە، پێشتربوونی کایەیەک لە کایەیەکی دی دەرببڕێت. بەگشتی دەشێت ئەو پابەندییە کە لە لێچواندنی هێڵدا بە پەیوەندییە جیاوازەکانی درێژی پێشان دەدرێت، بە واژەکانی سەوێنە و دەروێنە دیاری بکرێت. سێبەر و وێنەدراوەکان تەنیا دەروێنەی جیهانی دیارن، بابەتەکان سەروێنەن و دەروێنەکان دەخەنەوە. پلاتۆن سۆکرات دەبزوێنێت بۆ ئەوەی ئەم پەیوەندییەی سەروێنە – دەروێنە کە لە نێوان بابەتەکان و سێبەرەکاندا هەیە، بەسەر پەیوەندیی نێوان ئیدێکان یان بابەتە ماتماتیکییەکان و جیهانی دەرککردندا بەکارببات. پەیوەندیی (CD) بە (DE) هاوشێوەی پەیوەندیی (AC)ـە بە (CE). جیهانی دیار هیچی دیکە نییە جگە لە دەروێنەی ئیدێکان و بابەتە ماتماتیکییەکان. کێ جیهانی ئەزموونمان بە کردەکێتی و سەرجەم و راستەقینە دابنێت، ئەو کەسە بەسەهووداچووە بە هەمان شێوەی کەسێک کە دەبێژێت، گۆیا لە جیهانی دەرککردندا سێبەر

و وێنەدراوەکان کردەکێتیی راستەقینەن – پلاتۆن ئەم وێنەیە لە لێچواندنی ئەشکەوتدا دەیهێنێتە بەر باس.

پەیوەندیی سەروێنە بە دەروێنەوە دەشێت وەک دوو روانگە جیابکرێنەوە و لێرە بەدواوە بەتایبەتی روویان تێدەکەین: پەیوەندییەکە جیابکرێتەوە بۆ روانگەی پێشتربوون و پابەندیی هەبوون (Existenz) ، ئەوجا روانگەی پێشتربوونی (ئەولەویەتی) ناسینی بابەتەکانی کایەبابەتێک لە کایەبابەتێکی دی و پابەندیی شیمانەکانی ناسینی بابەتەکانی کایەبابەتێک بە کایەبابەتێکی دیکەوە. یەکەمیان ناودەنرێت روانگەی ئۆنتۆلۆگیانە. تێگەی پێشتربوونی ئۆنتۆلۆگیانە لە واژەی گریکیی «تا ئۆنتا»وە، واتا «بوونەوەرەکان»ـەوە دێتەئاراوە. مرۆ دەیەوێت بەم تێگەیە ببێژێت کە هەبوون و جۆری هەبوونی کایەکردەکێتییەک بەندە بە هەبوون و جۆری هەبوونی کایەکردەکێتییەکی دیکەوە. ئەم پابەندییە لەوەدایە کە بەبێ هەبوونی کایەکردەکێتیی یەکەم بە هیچ شێوەیەک ناشێت کایەکردەکێتیی دووەم هەبێت. بۆیە لە رووی ئۆنتۆلۆگییەوە


سوقرات

کایەکردەکێتیی یەکەم بەرانبەر کایەکردەکێتیی دووەم سەرەکییە. پابەندیی سێبەرەکان (DE) بە بابەتەکانی جیهانی دیارەوە (CD) پێشانی دەدات کە رەوشی تەواو بێکێشە و رۆشن هەن بۆ پێشتربوونی ئۆنتۆلۆگیانە: هیچ گومانی تێدا نییە کە هەبوونی سێبەرێک بەندە بە هەبوونی ئەو بابەتەوە کە سێبەرەکە دەخاتەوە (گەر بابەتێک نەبێت کە بتوانێت سێبەر بخاتەوە، ئەوا نەشیاوە سێبەر هەبێت)، ئەوجا ئەو جۆر و شێوازە کە چۆن بابەتێک هەیە، سێبەری ئەو بابەتەش دیاری دەکات. پلاتۆن سۆکرات دەبزێوێت بۆ ئەوەی ئەم تێروانینە رابگەیەنێت: ئەم پێشتربوون و پابەندییە ئۆنتۆلۆگییە هەروەها لە نێوان جیهانی دیار (CE) و ئەو بابەتانەشدا هەیە کە بە هزر دەناسرێن. کردەکێتیی جیهانی دەرککردن بەندە بە کردەکێتیی ئیدێکان و بابەتەکانی ماتماتیکەوە - ئەمە تێزێکی کێشەمەندە و ناچارمان دەکان خۆمانی بە فراوانی پێوە خەریک بکەین. دووەم روانگەی پابەندی ناودەنرێت روانگەی «ئێمپیستێم»ی. ئەم تێگەیە لە وشەی گریکیی مەئریفەوە (ئێپیستێمێ) دەبرێتەوە. پێشتربوونی ئێپیستێمی ئەو واتایە دەگەیەنێت کە مەئریفەی بابەتەکانی کایەیەک سەرەکیترە لە مەئریفەی بابەتەکانی کایەیەکی دیکە، هەروەها پابەندیی مەئریفەی بابەتەکانی کایەیەک بریتییە لە پابەندیی مەئریفەی بابەتەکانی کایەیەک بە بابەتەکانی کایەیەکی دیکەوە. سەرلەنوێ دەتوانین بە نموونەی پەیوەندی لە نێوان مەئریفەی سێبەرەکان و مەئریفەی بابەتەکاندا کە سێبەرەکان دەخەنەوە، پێشانی بدەین کە پرمەغزا و بێکێشە دەبێت گەر لە پابەندیی ئێپیستێمی بدوێین: گەر کەسێک بییەوێت سێبەرێکی دیاریکراو بناسێت، ئەوا دەبێت ئەو بابەتە بەڕوونی بناسێت کە ئەو سێبەرە دەخاتەوە. بەبێ زانینی ئەو بابەتە کە سێبەرەکە دەخاتەوە، نەشیاوە زانینێکی راستەقینە لەبارەی سێبەرەکە هەبێت. گەر کەسێک بیەوێت سێبەرەکان سەربەخۆ لە بابەتەکان دیاری بکات، ئەو کەسە ناچار دەبێت پشت بە وادانان ببەستێت. تێزەکەی پلاتۆن ئەمەیە: بۆ ئەوەی تێگەیشتنمان لەبارەی جیهانی ئەزموون هەبێت، دەبێت بە ناچاری پشت بە زانینی ئیدێکان ببەستین - ئەمەش سەرلەنوێ تێزێکی پڕکێشەیە کە گەرەکە لێی تێبگەین.

## کایەی بابەتە ماتماتیکییەکان

بۆ ئەوەی لە تێزی پابەندیی ئۆنتۆلۆگیانە و ئێپیستێمیانەی جیهانی دەرککردن بتوێژینەوە، باشتر دەبێت بە پرسیارێک لە جیهانی ئیدێکان و بابەتە ماتماتیکییەکانەوە دەسپێبکەین: ئایا بابەتە ماتماتیکییەکان بەگوێرەی لێچواندنی هێڵ چین و چۆن دەناسرێن؟ پلاتۆن دەبێژێت، بابەتی ماتماتیکی سەر بە کایەی ئەو شتانەیە کە تەنیا بە هزر شیاوی ناسینن، بەڵام مرۆ دەتوانێت دژبێژیی ئەم تێڕوانینەی پلاتۆن بکات و رایبگەیەنێت کە فیگورە ئەندازەییەکان زۆر چاک شیاوی بینین و دەرککردنن، مرۆ دەتوانێت ئاماژە بۆ ئەوە بدات کە ئێمە بۆ نموونە دەتوانین بە پەرگال و راستە سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاو یان بازنەیەک دروست بکەین، لێرەشدا دەزانین کە سێگۆشە یان بازنە چییە، چونکە ئێمە پێشتر سێگۆشە و بازنەمان بینیوە، کەواتە سێنسیانە دەرکمان کردووە.

پێدەچێت پلاتۆن بە جیاوازیکردنێک وەڵامی ئەم دژبێژییە بداتەوە: ئەوە کە ئێمە دەیبینین، تەنیا دەروێنەی بازنە و سێگۆشەیە، بەڵام ئێمە هەرگیز ناتوانین خودی بازنەیەک یان سێگۆشەیەک ببینین. یەکەم، پلاتۆن دەگات بەم تێڕوانینە، چونکە فیگورە ئەندازەییەکان کە شیاوی بینین نین، هەرگیز ئەو مەرجانە بەدیناهێنن کە دەبێت خودی فیگورە ئەندازەییەکان لە بنەڕەتدا بەدییانبهێنن، تەنانەت بازنەیەک کە بە پەرگال کێشراوە، هەرگیز بەڕاستی بازنەیەک نییە کە هەر پنتێکی سەر چێوەکەی هەمان دووریی لە چەقی بازنەکەوە هەبێت. بۆ پاڵ ئەمە روانگەیەکی دیکە دێت، کە دەتوانین بە نموونە بە چاکترین شێوە روونیبکەینەوە: ئێمە بەوردی سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاومان بە پەرگال و راستە کێشاوە، ئەوجا گەر بمانەوێت بە نموونەی ئەم سێگۆشەیە بیردۆزی پیتاگۆراس («کۆی چوارلایەکسانەکانی سەر لاکان بەقەد چوارلایەکسانی سەر ژێیە») بسەلمێنین، ئەوسا خودی سەلماندنەکەمان بۆ ئەو سێگۆشە وێنەکێشراوە نییە. ئێمە بە هیچ شێوەیەک نامانەوێت لە رەوشی ئەم سەلماندنەدا پێشانی بدەین کە گۆیا بیردۆزی پیتاگۆراس چواندنی بۆ ئەو سێگۆشەیە هەیە کە ئێمە وێنەیمان کێشاوە، بە پێچەوانەوە دەمانەوێت بەو وێنە دروستکراوە پێشانی بدەین کە بیردۆزی پیتاگۆراس چواندنی بۆ هەموو سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاو هەیە، بەڵام ئەمە واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گوایا بیردۆزی پیتاگۆراس چواندنی بۆ هەموو سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاوی وێنەکێشراو هەیە، چونکە هیچ کام لە سێگۆشە وێنەکێشراوەکانمان بەڕاستی گۆشەوەستاو نییە. پلاتۆن گریمانە دەکات کە ئێمە بە یاریدەی دەروێنەیەک یاسایەکی ئەندازەیی دەسەلمێنین، یاسایەک کە چواندنی بۆ سەروێنەی هەر سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاوی وێنەکێشراو هەیە و خۆی لە بنەڕەتدا سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاوی ئیدیالە (نموونەییە). ئەم سێگۆشەیە ئیدیالە، چونکە هەموو ئەو مەرجانە بەدیدەهێنێت کە دەبێت لە بنەڕەتدا سێگۆشەیەکی گۆشەوەستاو بەدییانبهێنێت، بێگومان گەر هاتوو بەڕاستی سێگۆشەی گۆشەوەستاو بێت. ئەم سێگۆشە ئیدیالە نەشیاوە بە سێنسەکان دەرکبکرێت، بەڵکو تەنیا بە هزر شیاوی ناسینە. سۆکرات دەبێژێت: ماتماتیکییەک دەخوازێت بە وێنە (بە رەسمی دروستکراو) شتێک بناسێت کە لە راستیدا تەنیا بە زەین شیاوی بینینە (Rep. 511a1).

بەڵام کە دەبێژین بابەتە ئەندازەییەکان شیاوی دەرککردن نین، ئەوا ئەم دەربڕینەمان واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت کە گۆیا ئەوان کردەکی (wirklich) نین و هیچ شێوەیەکی هەبوونیان (Existenz) نییە. ماتماتیکی گریمانە دەکات کە ئەوان هەن، ئەو لەو یاسایانە دەتوێژێتەوە کە چواندنیان بۆ فیگورە ئەندازەییە ئیدیالەکان هەیە. ئەو بێگومان پتر لەوە ناهزرێت کە داخۆ هەبوونی بابەتە ئەندازەییەکان چ واتایەک بگەیەنێت، بەڵام ئەو گریمانەیەک لەبارەی کردەکێتیەکەمان دەکات، ئەمەش گریمانەیە سەبارەت بەوە کە نەک تەنیا شتێکی شیاوی بینین کردەکییە و کردەکیانە هەیە، بەڵکو هەروەها شتگەلی دیکە هەن و ئەوانیش کردەکین، ئەم شتانەش فیگورە ئەندازەییەکانن (یان ژمارەکانن). ئەم روونکردنەوە و راڤەیەی

بابەتە ئەندازەیی و ماتماتیکییەکان ئەمڕۆش بۆ ئەو ماتماتیکی و فیزیکیانە راکێشەرە کە گرنگیدانی فەلسەفەییان هەیە. ڤێرنەر هایزنبێرگ و کارل فریدریش فۆن ڤایتسزێکەر - با تەنیا ناوی ئەم دوو زانایە بهێنێن- پەیڕەوی راڤەیەکی پلاتۆنیانەی ژمارە و فیگورە ئەندازەییەکان دەکەن، ئەمەش هاوشێوەی هەندێک فەیلەسوفی هەنووکەیی کە خۆیان بە پرسیارە بناغەییە مێتافیزیکییەکانەوە خەریکدەکەن، لێرەشدا ئاشکرایە کە پرسیاری هەبوونی ژمارەکان تەنانەت ئەمڕۆ بەناچاری سەر بەو پرسیارە مێتافیزکیانەیە.

## کایەی ئیدێکان

١) ئایا ئیدێ چییە؟

ئایا ئەو ئیدێیان چین کە لە کایەی (AB)دا دانراون؟ وەڵامەکانی پلاتۆن لە دیالۆگی «کۆمار»دا بەس نین بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، جگە لەمە ئەو لە لێچواندنی هێڵدا تەنیا وەک ئاماژە وەڵامەکانی دەردەبڕێت، لەبەر ئەم هۆیە هەوڵ دەدەین بۆ تەواوکردنی وەڵامەکانمان هانا بەرین بۆ هەندێک بڕگەی گرنگ لە دیالۆگەکانی قۆناغی ناوەڕاستی ئیشکردنی پلاتۆندا.

جیاوازییەکی کرۆکی لە نێوان دیالۆگەکانی سەرەتا و ناوەڕاستدا ئەوەیە کە پلاتۆن لە دیالۆگەکانی دووەمدا گریمانەی ئیدێ ناکات تەنیا بۆ ئەدگارە بەهاییەکان. ئەو بۆ نموونە لە دیالۆگی «کۆمار»دا لە ئیدێی مێز یان زین دەدوێت، واتا لە ئیدێی ئەو بابەتانە کە بۆ بەکارهێنان دروستکراون. ئەو لە «فایدۆن»دا، لەپاڵ هەندێک ئیدێی دیدکەدا، ئیدێکانی قەوارە و یەکسانی دەهێنێتە بەر باس. ئەو لە «تیمایۆس»دا لە ئیدێی زیندەوەر و رووەک دەدوێت. لێرەدا گریمانەی ئیدێیەکی دادپەروەری بەچڕی بەندە بە گریمانەی ئیدێی مێز یان ئیدێی جوانەوە. ئێمە نەک تەنیا دەتوانین لەبارەی پێناسەی رەوشتەکان بپرسین، بەڵکو هەروەها لەبارەی پێناسەی ئەدگارەکان، لەبارەی پێناسەی بابەتی یان زیندەوەری تایبەتیش. بۆ نموونە: ئایا مێز چییە؟ ئێمە زۆر بابەتی بەکارهێنان دروستدەکەین و بەشێکیان بریتین لە مێز. بەڵام ئایا ئیدێی مێز چییە، واتا ئەو شتە کە وا دەکات مێزێک مێز بێت؟ پلاتۆن لە دیالۆگەکانی سەرەتادا چەند پێوەرێکی دانا بۆ ئەوەی کرۆکی شتێک بەگوێرەی ئەوان دیاری بکرێت. پرسیارەکە روودەکاتە ئەو مەرجە پێویست و ساتارکەرانە کە مێزێک دەکەن بە مێز، بەڵام لێرەدا گەرەکە رەچاوی لایەنێک بکەین: دەشێت هەندێک واژەی جیاواز لە کشاندا (ئێکستێنزیۆندا) وەک یەک بن، بەڵام دەشێت واژەکان مەبەستی جیاوازیان هەبێت. ئێمە پەیوەند بە لێچواندنی خۆرەوە لەوە هزرین کە هەتا چەند زانینی ئیدێی چاکە پێشمەرجە بۆ زانینی ئیدێی مێز.

تەنانەت گەر ئەو تێڕوانینە راست بێت کە ئێمە دەتوانین تێگەگەلی وەک تێگەی مێز پێناسە بکەین، سەرەڕای ئەمە گریمانە فرەلایەنەکەی پلاتۆن، کە دەڵێت تێگەکان و فۆرمولی پێناسە بە راستی شتێک (واتا ئیدێیەک) دیاری دەکەن کە ریالە و هەیە، گریمانەیەکی ناڕۆشنە و پێویستە پتر لێی وردبینەوە. پلاتۆن لە دیالۆگەکانی قۆناغی ناوەڕاستدا سۆکرات دەبزوێنێت بۆ ئەوەی نەک تەنیا دانوستانی ئەو تێزە بکات کە ئیدێکان وەک هەبوو

دادەنێت (لێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێت کە سۆکرات بە حــەزەرەوە ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت کە بۆ کام شتانە گریمانەی ئیدێ بکات و بۆ کام شتانەی دی نەیکات)، بەڵکو بۆ ئەوەش کە ئیدێکان ریالتر و کردەکیترن لە بابەتەکانی جیهانی ئەزموونمان، بەڵێ هەبوونی ئیدێکان جیهانی ئەزموون دەشێنێت، تەنانەت خودی بابەتەکانی جیهانی ئەزموون تەنیا بەشدارن لەو ئیدێیانەدا. کێ بییەوێت تێبگات کە پلاتۆن لە دیالۆگەکانی قۆناغی ناوەڕاستدا چ تێڕوانینێکی سەبارەت بە ئیدێکان هەیە، ئەو کەسە دەبێت لە گریمانەی تەحەداکەری پێشتربوونی ئۆنتۆلۆگیانە تێبگات، هەروەها لەو گریمانەیەش تێبگات کە ئیدێکان بە کردەکیتر و ریالتر لە جیهانی ئەزموون دادەنێت.

٢) ئایا جیهانی ئەزموون چییە؟

بۆ ئەوەی لەم کێشەیە نزیکبکەوینەوە، پێویستە سەرەتا تێڕوانینی پلاتۆن سەبارەت بە جیهانی ئەزموونمان بە فراوانی دابڕێژین، لێرەشدا باشترە لەو جیاوازییەوە دەستپێبکەین کە لە نێوان جیهانی ئیدێکان یان بابەتە ماتماتیکییەکان و جیهانی ئەزموونیدا دەکرێت. پلاتۆن سۆکرات دەبزێوێت بۆ ئــەوەی نوێنەرایەتیی ئەم تێزە بکات: نەشیاوە لەبارەی جیهانی ئەزموون زانینی جەخت هەبێت، بەڵکو لەبارەی ئەو تەنیا بۆچوون (Meinung) هەیە. زانینی جەخت تەنیا لەبارەی ئیدێکان هەیە. ئەم تێزە دەچرسێنێت، چونکە ئێمە وەک باوە وای بۆ دەچین کە بەڕاستی بتوانین شتێک لەبارەی جیهانی ئەزموون بزانین (کەواتە نەک تەنیا بۆچوونمان لەبارەی ئەو هەبێت). ئێمە بۆ نموونە لە یاریگاری تۆپی پێ تەماشای گەمەیەکمان لە نێوان یانەکانی (TSV 1860) و بایەرن میونشندا کــردووە، ئەوجا گەر سەئاتێک دوای جێهێشتنی یاریگاکە پرسیارمان لێبکرێت، داخۆ بزانین کام تیپەیان گەمەکەی بردۆتەوە، ئەوسا یەک سات ماتڵ نابین و دەبێژین، بەڵێ دەزانین کامیان بردوویەتییەوە. ئێمە دەزانین کە دووەم جەنگی جیهانی ساڵی ١٩٤٥ کۆتایی هاتووە، هەروەها گەر من ئێستا لە پەنجەرەی ژوورەکەمە بڕوانم، دەزانم کە ئێستا لە دەرەوە بارینی باران دەستپێدەکات. پلاتۆن چواندن بەم داواکارییە بەرزکراوانە نادات. ئەوە کە ئێمە دەری دەبڕین، بە دیدی پلاتۆن بۆچوونە نەک زانین. پلاتۆن تێڕوانینی خۆی بەم شێوەیە ڕووندەکاتەوە: گەر کەسێک بەڕاستی شتێک بزانێت، ئەو کەسە هاوکات دەزانێت کە ئەوەی ئەو دەیزانێت، نەشیاوە بە جۆرێکی دی دەربکەوێت. ئێمە بەبێ مەرج لەتەک ئەم تێڕوانینەدا یەکناگرینەوە، چونکە ئێمە لەو بڕوایەداین کە کەسێک دەتوانێت لەبارەی ئەو شتانەش بزانێت کە مەرج نییە بە جۆر و شێوازێکی تایبەتی دەربــکــەون. هزرینی پلاتۆن جیاوازە. ڕەنگە ئەم ڕوانگەیەی خوارەوە ڕوونتر تێڕوانینی ئەومان تێبگەیەنێت: گەر کەسێک بەڕاستی شتێک بزانێت، ئەوسا ئەو کەسە دەبێت بە دیدی پلاتۆن لێڕوانینێکی پڕی بۆ ئەو ڕەوشە هەبێت کە ئەو دەیزانێت، ئەو دەبێت تێبگات، بۆچی ئەوەی ئەو دەیزانێت بەو چەشنەیە نەک بە شێوەیەکی دی. بۆ نموونە ئەوە بەس نییە کە بگوترێت، لەبەرئەوەی هەوری ئەستوور بەسەر میونشنەوەیە، هەروەها جادەکە تــەڕە و خۆیشمان لە پەنجەرەکەوە لە

دەرەوە دەڕوانین، ئەوا دەزانین باران دەباریت. ئیمە دەبیت بە پیچەوانەوە تیبگەین، بۆچی جیهان بەو چەشنەیە کە ئیتر ئیستا لە میونشن باران دەباریت، یان، گەر لە لیچواندنی خۆرەوە بڕوانین، ئیمە گەرەکە تیبگەین، بۆچی ئەوە بۆ میونشن چاکترینە کە ئیتر ئیستا لە دەرەوە باران ببارێت. زەحمەتە مرۆ بتوانیت وەڵامیک بۆ ئەم پرسیارە بدۆزێتەوە. ئیمە نازانین بۆچی جیهانەکەمان ئەوهایە، وەک چۆن ئەو هەیە (it is what it is) بۆیە پلاتۆن دەبێژێت، ئیمە بە گۆتەکانمان لەبارەی جیهانی دەرککردن تەنیا لە کایەی بۆچووندایین.

هەر داواکارییەکی زانینی جیهانی ئەزموون رابگەیەنریت، پلاتۆن رەتیدەکاتەوە. هۆی ئەمە لە ڕوویەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەڵوێستە گوماناوییە کە پلاتۆن پەیوەند بە شیمانەی مەئریفەی جیهانی ئەزموونەوە وەریدەگریت. ئیمە لە هەموو ئەو شتانەدا کە دەرکیان دەکەین یان دەیانهێنینەوە یاد، دەشیت لە پرنسیپەوە بەسەهوودا بچین. پیسیی سەر پەنجەرەکەم دەشیت بەسەهوومدا بەریت و ئەو پەڵانە بە باران دابنیم کە دوای سڕین بە پەنجەرەکەوە ماونەتەوە. دەشیت چیدی بەڕاستی ژمارەی ساڵی ١٩٤٥ نەیەتەوە یادم یان من بە هەڵە متمانەم بە کەسێک کردبیت کە پێی گۆتووم گۆیا ساڵی ١٩٤٥ دووەم جەنگی جیهانی کۆتایی هاتووە. تەنانەت لە پرنسیپەوە نەشیاوە نییە کە من هەردوو تۆپی پێی بایەرنم لێ گۆڕرابن. بەڵام گرنگتر لەم هەڵوێستە گوماناوییە ئەوەیە کە پلاتۆن گریمانەیەکی ئەوتۆ لەبارەی جیهانی ئەزموونمان دەکات کە پێش ئەو هێراکلیتێسی پێشسۆکراتی پەیڕەویی کردبوو: ئاشکرایە کە دەربڕینەکانی «هەموو شتێک لە لێشاودایە» و «مرۆڤ دوو جار ناچێتە نێو هەمان ڕووبارەوە» بە ئافۆریزمی هێراکلیتێس دادەنرێن. پلاتۆن هەمیشە لەنوێوە سۆکرات دەبزوێنێت بۆ ئەوەی ئەم تێزە رابگەیەنێت: جیهانی ئەزموونمان بەبێ بڕانەوە لە گۆڕاندایە و بەهۆی ئەم گۆڕانە بەردەوامەوە هەرگیز ناتوانین بەراستی لەبارەی ئەو بزانین. پلاتۆن دەبێژێت: جیهانی ئەزموونمان جیهانی ئاراییە و تێیدا شتەکان تایبەتن بە لەناوچوون. شتەکان دروست دەبن و لەناودەچن، لەنێو ئەم جیهانەدا هیچ شتێکی هەمیشەیی نادۆزینەوە. جیهانی ئیدێکان بە پێچەوانەوە جیهانی بوونە. ئەوجا بە وەسفکردنی جیهانی ئەزموونەوە وەک جیهانی ئاراییی روانگەیەکی دی گرێدراوە: هەر شتێک لەبارەی جیهانی ئەزموون بگۆترێت، بەڕەهایی ڕاست نییە. گەر یەکێک بۆ نموونە لەبارەی کەسێک ببێژێت «ئەو کەسە جوانە»، ئەوا ئەم رستەیە بە دیدی پلاتۆن هەرگیز بەتەواوی ڕاست نییە. هەمیشە ڕووی دیکەی ئەو کەسە هەن و گەر لە ڕوانیندا لەو کەسە ڕەچاو بکرێن، ئەوسا ئەو کەسە جوان نابێت. ڕەنگە یەکێک هەست بکات کە ڕوخساری دڵگیری ئەو کەسە رایدەکێشێت، بەڵام دوای ئەوە کە گفتوگۆی لەتەکدا دەکات، دەبینێت کە ددانەکانی ڕێک نین، یان بۆی دەردەکەوێت کە بە دەستەکانی ئەو کەسە هۆشسام نییە. نەشیاوە لەبارەی هیچ کەسێک و هیچ شتێکی نێو جیهانی ئەزموون بگۆترێت کە بەڕاستی لە گشت ڕوویەکەوە جوانن. جوانبوون بە هیچ کەس و هیچ شتێک بەڕەهایی نادرێت. تەنیا ئیدێی جوان بەڕاستی جوانە، هەر بۆیە بوون، واتا جوانبوون، بە ئەو دەدرێت نەک بە شتەکانی جیهانی ئەزموون.

لەبەر ئەم هۆیەیە کە ئێمە ناتوانین لەبارەی جیهانی ئەزموون بزانین. ناشێت گوتەی «ئەو کەسە جوانە» رستەیەکی راست بێت، چونکە هەروەها رستەی «ئەو کەسە جوان نییە» هەمیشە راستە. بەڵام لەبەر ئەوەی زانین بەزەرووری بەندە بە راستییەوە، ئەوجا مرۆ تەنیا دەتوانێت ئەوە بزانێت کە راستە (ئاخر گەر وا نەبێت، ئەوسا تەنیا وایبۆدەچێت کە دەیزانێت، بەڵام لە بنەڕەتدا نایزانێت)، ئەوا مرۆ ناتوانێت بگات بە زانین لەبارەی شتەکانی جیهانی ئەزموون کە بەوە تایبەتن ئەدگارێکیان هەبێت یان نەبێت. بۆیە لە لێچواندنی هێڵدا بروا تەرخان دەکرێت بۆ توانستی مەئریفەی کایەی (CD). بە پێچەوانەوە کایەی بابەتە ماتماتیکییەکان جیاوازن. بۆ نموونە دەربڕینی «سێگۆشە سێ لای هەیە»، بەزەرووری راستە. گەر کەسێک تێگەیشتبێت کە سێگۆشە چییە، ئەوسا ئەو کەسە دەزانێت کە ئەم فیگورە ئەندازەییە بەزەرووری سێ لای هەیە. هەروەها لەبارەی ئیدێکانیش دەگوترێت کە ئەوان شیاوی زانینن، چونکە هیچ روانگەیەک نییە کە بە رەچاوکردنی بۆمان دەربکەوێت، ئیدێیەک بەتەواوی ئەوها نییە وەک چۆن ئەو هەیە. بۆ نموونە پەیوەند بە ئیدێی جوانەوە، کەواتە پەیوەند بە سەروێنەی ئەوەوە کە جوانە، هیچ روانگەیەک نییە کە گەر رەچاو بکرێت، ئیتر ئەو شتە کە لە مەغزای واتای تێگەدا جوانە، جوان نەبێت. تەنیا ئیدێی جوان ئەو پێورانە بەدیدەهێنێت کە پلاتۆن بۆ دیاریکردنی زانین دایناون. ئێمە بێگومان پەیوەند بەو دژبێژییانەوە کە پلاتۆن خۆی لە دیالۆگی «پارمێنیدێس»دا بەرانبەر گریمانەی ئیدێ دەیانکات، دەبینین کە بەم گریمانەیەوە کێشە لکاوە.

### ٣) زانینی ئاپریۆری و یادهێنانەوە (مێنۆن)

روانگەیەکی دیکە بەندە بەو تێڕوانینەوە کە زانینی راستەقینە تەنیا لەبارەی بابەتە ماتماتیکییەکان و ئیدێکان وەک شیاو دادەنێت. گەر ئێمە لەبارەی جیهانی ئەزموونمان بدوێین، ئەوا تێگەی تایبەتی بەکاردەهێنین و واتای ئەو تێگانە تەنیا لە جیهانی ئەزموونەوە هەڵنەهێنجراوە، بەڵکو بۆ نموونە بەڕێی دەرککردنەوە فێری بووین. پلاتۆن سۆکرات دەبزوێنێت بۆ ئەوەی ببێژێت: ئێمە تەنیا کاتێک دەتوانین هەر بڕیارێک بەسەر جیهانی ئەزمووندا بدەین، گەر وایدابنێین کە ئێمە لە بنەڕەتەوە خاوەنی زانینی ئاپریۆرین، واتا زانینێک کە لە ئەزموونەوە نەدراوە. توانستی مەئریفەی ئێمە بریتی نییە لە تابولا رازا، واتا لە لەوحەیەکی بەتاڵ و بەڕێی ئۆرگانەکانی دەرککردنەوە تۆمارگەلی هەستەکی بێنەئاراوە، ئەوجا کار لەو تۆمارانەدا بکەین و بیبیانکەین بە وێنەی ئاڵۆزتر لەسەر کردەکێتییەکەمان. بە پێچەوانەوە، توانستی مەئریفەمان لە بنەڕەتەوە فۆرمی پێدراوە و بە شێوەیەکی چالاک بونیاد بە تۆمارە سێنسییەکانمان دەدات. پلاتۆن بەتایبەتی لە دیالۆگی «فایدۆن»دا گۆڕان بەم روانگەیەی زانینی ئاپریۆری دەدات، ئەمەش بە نموونەی ئەوە کە ئێمە دەزانین هاوشێوەیی شتەکان چ واتایەکی هەیە (78b1-Phd 72e1) گەر ئێمە لەبارەی جیهانی ئەزموونمان بدوێین، ئەوسا دەتوانین بڕیار بدەین، ئەوجا بۆ نموونە کاتێک بڕیار بەسەر دوو شتدا دەدەین، ئەوا لەم رەوتەدا دەبێژین، کە ئەوان هاوشێوەی یەکترین. پلاتۆن لە زاری سۆکراتەوە سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت

که ئێمه «به هەر شێوەیەک بێت» دەزانین که هاوشێوەیی دوو شت چ واتایەک دەگەیەنێت، بەڵام نەشیاوە لە دەرککردنی جیهانی ئەزموونەوە بەم زانینە گەیشتبین، چونکە هەرگیز شتگەلی بەڕاستی هاوشێوە لە جیهانی ئەزموونیدا نین. بەڵام گەر ئەم زانینە لەبارەی هاوشێوە لە جیهانی ئەزموونەوە نەهاتبێت، کەواتە لەکوێوە هاتووە؟ هەمان کێشە دێتە ئاراوە، گەر ئێمە لەبارەی کەسێک ببێژین که گۆیا ئەو کەسە جوانە یان هەر ئەدگارێکی دیکەی پێبدەین. ئێمە پێشتر بینیمان، بۆ هەر شتێک که ئێمە لە جیهانی ئەزموونیدا بە جوانی دابنێین، ئەو تێڕوانینەش راستە کە ئەو شتە – بە رەچاوکردنی گۆشەنیگایەکی دیکەی تایبەتی – جوان نییە. ئێمە ناتوانین لە ئەزموونەوە بزانین، داخۆ ئەو شتە چی بێت که دەمان بزوێنێت بۆ ئەوەی ببێژین «کەسێک جوانە»، چونکە ئەزموون فێرمان دەکات کە هەموو شتێکی جوان هاوکات ناجوانە.

پلاتۆن لە دیالۆگی «فایدۆن»دا بە ئەفسانەیەک زانینی نائەزموونیی هاوشێوە ڕووندەکاتەوە، ئەو لە دیالۆگی دیکەشدا هانا بۆ ئەو ئەفسانەیە دەباتەوە: ئەفسانەی یادهێنانەوە (بە گریکی: ئانامنێزیس). ئەم ئەفسانەیە پەیوەندە بە گریمانەی تایبەتییەوە لەبارەی دەروون، کە پلاتۆن – ڕەنگە لە یەکەم سەردانیدا بۆ باشووری ئیتالیا و سیسیلیا – لە پیتاگۆراسییەکانی وەرگرتووە. پیتاگۆراسییەکان گریمانەی دۆنادۆنی دەروون و پەیوەند بەمەشەوە گریمانەی نەمریی دەروونیان کردبوو. پلاتۆن بە ئەفسانەی یادهێنانەوە پێشانی دەدات کە چۆن دەروونـــی نەمر، پێش چوونی بۆ نێو لەشێک، ئەوجا پێش زایینی مرۆڤێک وەک سەرەنجامی ئەو کردارەی دەروون، لە ئیدێکان دەڕوانێت– بۆ نموونە لە ئیدێی هاوشێوە دەڕوانێت. لەبەر ئەم هۆیەیە کە مرۆڤ سـەرەڕای ئەزموونکردنەکانی لە ژیانی جەستەیی خۆیدا، سەربەخۆ لەو ئەزموونانەی (واتا بە ئاپریۆری) دەزانێت هاوشێوە چییە. بەڵام بەهۆی زایین و ئەو شۆکەوە کە بەندە بە زایینەوە، ئەم زانینەی دەروون تاریک دەبێت. گەر کەسێک ئێستا، دوای یەکگرتنی دەروون لەتەک لەشدا، بکەوێتە بـەردەم پرسیاری هاوشێوە، ئـەوا هـەوڵ دەدات ئەوە بهێنێتەوە یاد کە ئەو پێش زایینی خۆی لێی روانیوە. لەبەر ئەم هۆیە فێربوون هیچی دیکە نییە جگە لە یادهێنانەوە.

پلاتۆن لە دیالۆگی «مـێـنـۆن»دا بە یاریدەی ئەفسانەی ئانامنێزیس (یادهێنانەوە) هەروەها زانینی یاسا ئەندازەییەکان (جیۆمەترییەکان) روونـدەکـاتـەوە. پلاتۆن سۆکرات دەبزوێنێت بۆ گفتوگۆ لەتەک کۆیلەیەکدا کە هیچ پێگەیاندنێکی فێرگەیی لە ماتماتیک یـان ئـەنـدازەدا نەبووە. سۆکرات لەبارەی شیتەڵکردنی بابەتێکی ئەندازەیی پرسیاری لێدەکات. (Men. 82b9- 85b7) سۆکرات تەنیا بە پرسیارکردن بۆی دەلوێت کۆیلەکە بگەیەنێتە ئاستێکی ئەوتۆ کە ئیتر ئەو خۆی سەربەخۆ شیتەڵکردنی راستی بابەتەکە بدۆزێتەوە. ئەو کۆیلەیە زانینی بابەتە ئەندازەییەکانی لەکاتی ژیانیدا وەرنەگرتووە، ئەو دەبێت پێش زایینی ئەم زانینەی وەرگرتبێت و ئێستاش دەیهێنێتەوە یادی خۆی.

ئەوە جەخت نییە کە داخۆ پلاتۆن چ پێگەیەکی بە تیۆریی یادهێنانەوە دابێت. پلاتۆن لە «مێنۆن»دا ئەم تیۆرییە دەهێنێتە نێوانەوە بۆ ئەوەی مێنۆنی

هاوگفتوگۆکەری سۆکرات کە ویستی بۆ توێژینەوەی تێگەیی نییە، بۆ بەدووداگەڕانی دیکە ببزوێنێت. مێنۆن دوای چەند هەوڵێکی بێسوودی پێناسەکردنی رەوشت کۆڵدەدات و نایەوێت پێناسەی دیکە بکات، ئەو دژبێژی دەکات، کە گۆیا بە هیچ شێوەیەک نازانێت بەدووی چیدا بگەڕێت. ئاخر گەر ئەو پێشتر زانینێکی لەبارەی چییەتیی رەوشت نەبووبێت، ئیتر چۆن بتوانێت پێناسەی رەوشت بکات؟ گەر مرۆ بە هیچ شێوەیەک شتێک نەناسێت، ئەوسا ناتوانێت ئەو شتە پێناسە بکات. سۆکرات لەم پەیوەندییەدا بە تیۆریی ئانامنێزیس مۆدێلێک دەهێنێتە پێشەوە تاکو مەغزای گەڕانی پتر بەدووی فۆرمولێکی پێناسەدا روونبکاتەوە: مێنۆن لە بنەڕەتدا دەزانێت رەوشت چییە، چونکە ئەو پێش زایینی لە ئیدێی رەوشتی روانیوە. ئەو لەیادهێنانەوەدا بەدووی ئەوەدا دەگەڕێت کە لەیادیچۆتەوە. پلاتۆن هەروەها لە دیالۆگی «فایدۆن»دا تیۆریی ئانامنێزیس دەهێنێتە نێوانەوە، بەڵام نەک تەنیا بۆ ئەوەی پێشانی بدات، بەڵکو هەروەها دەیەوێت بە نموونەی یادهێنانەوە ئەرگومێنتێک بۆ نەمریی دەروون بخاتە بەردەم. پێشبینیی ئانامنێزیس گەرەکە روونی بکاتەوە کە دەروونی مرۆڤ دەبێت لایەنیکەم پێش زایینی ئەو هەبووبێت، چونکە گەر ئەوها نەبێت، ئەوسا ناتوانین روونی بکەینەوە کە مرۆڤ لەکوێوە بە هاوشێوەیی شتان دەزانێت. ئەفسانەی ئانامنێزیس گەرەکە روونی بکاتەوە کە ئێمە لە بڕیارەکانماندا بەسەر جیهانی ئەزموونداا تا رادەیەک بە تێگەی ئاپریۆری کاردەکەین و ناشێت لە دەرککردنی سێنسییەوە گەیشتبێتین بە واتای ئەو تێگانەمان. بەڵام ناڕۆشنە کە داخۆ دەبێت ئێمەی خوێنەر لەم تێڕوانینەوە چ سەرەنجامێک بۆ تێگەیشتنمان لە کردەکێتی دەربکێشین.

٤) ئیدێکان وەک هۆکار (فایدۆن)

لە لێچواندنی هێڵەوە دیاریکردنێکی دیکە سەرهەڵدەدات بۆ جۆری ئەو پابەندییە کە جیهانی ئەزموون بە جیهانی ئیدێکانەوە هەیەتی: ئیدێکان هۆکاری جیهانی ئەزموونن. چۆن شتەکانی شیاوی دەرککردن هۆکاری سێبەرەکانن، بە هەمان شێوە ئیدێکان هۆکارن بۆ کردەکێتیی شیاوی دەرککردن. پلاتۆن لە دیالۆگی «کۆمار»دا تەنیا ئاماژە بۆ ئەم هۆکاربوونەی ئیدێکان دەدات، بەڵام لە دیالۆگی «فایدۆن»دا فراوانتر روونی دەکاتەوە. پلاتۆن لەم دیالۆگەدا سەرەتا نەخشەی تێگەیشتنێکی کردەکێتی دەکێشێت کە ئێمە پێشتر پەیوەند بە راڤەی لێچواندنی خۆرەوە روومان تێکرد. ئێمە لە جیهان تێدەگەین، بە مەرجێک لە جیهان وەک ئاڕاستەگرتوو رووەو ئامانجێک (چاکە) تێبگەین. چاکە هۆکاری ئەوەیە کە شتەکان ئەوهان، وەک چۆن ئەوان هەن. ئێستاش پلاتۆن سۆکرات دەبزوێنێت بۆ ئەوەی ببێژێت: ئەو زۆر هەوڵی داوە لەم هۆکارەوە کە چاکەیە، لە جیهان تێبگات، بەڵام ئەوەی بۆ نەلواوە، بۆیە تەنیا توانیویەتی لە توێژینەوەی فەلسەفەییدا هەنگاو بنێتە نێو «دووەم باشترین سەفەر»ەوە (Phd. 99c9 - d1) سۆکرات بە «دووەم باشترین سەفەر» وێنەیەک وەردەگرێت کە یەکێک لە هاوگفتوگۆکەرانی نێو دیالۆگەکە بە ناوی سیمیاس هێنایە نێوانەوە. سیمیاس لەو رەوتەدا گوتی کە مرۆ پێویستە لە توێژینەوەی

فەلسەفەییدا تا ئەو کاتە کە خاوەنی هیچ شتێکی باشتر نییە، واتا خاوەنی زانینی راستەقینە نییە، پەیڕەویی جەختترین و مسۆگەرترین بۆچوون بکات. ئەم ناچارییە بۆ متمانەکردن بە بۆچوون هاوشێوەی ناچاریی مرۆڤێکە کە دەیەوێت بەسەر دەریادا بپەڕێتەوە، بەڵام خاوەنی پاپۆڕێکی دامەزراو و مسۆگەر نییە، بەڵکو تەنیا سەوڵی پێیە. لەبەر ئـەوەی ئەو کەسە ناتوانێت بە پاپۆڕێک دەست بە باشترین سەفەر بکات، ئەوا ناچارە «دووەم باشترین سەفەر» ئەنجام بدات: بە سەوڵ (Phd. 85b10– e2) بەڵام دووەم باشترین سەفەر بۆ سۆکرات ئەم واتایە دەگەیەنێت: واز لەو پرسیارە بهێنرێت کە داخۆ چۆن هەموو شتێک لە چاکەوە شیاوی تێگەیشتن بێت، ئەوجا لەبریی ئەو پرسیارە پێشمەرجێکی دی، لەپاڵ هەندێک پێشمەرجی دیکەدا، دابنرێت: ئیدێکان هەن، هەروەها گەرەکە وەک هۆکاری جیهانی ئەزموون وەربگیرێن.

با ئەم تێزە بە دوو نموونە لە دیالۆگی «فایدۆن»ـەوە روونبکەینەوە. ئایا لەبەر چ هۆیەک سیمیاس کە بە هێندەی قەوارەی سەر لە سۆکرات هەڵکشاوترە، لە سۆکرات باڵابەرزترە؟ ئێمە دەتوانین لە دیدی پلاتۆنەوە ئەم وەڵامە بدەینەوە: سیمیاس بەهۆی ئیدێی قەوارەوە لە سۆکرات باڵابەرزترە. لەم وەڵامەدا دوو روانگە گرنگن: یەکەم، پلاتۆن جەخت دەکات، کە نەک شتی داکەوتی – ئەمپیری، بەڵکو ئیدێ هۆکارە بۆ ئەوە کە شتێک ئەوهایە، وەک چۆن ئەو هەیە. پێدەچێت هێنانەنێوانی ئەم روانگەیە کە ئیدێیەک وەک هۆکاری شتە داکەوتیەکان وەردەگرێت، بەو هۆیەوە بێت کە وشە گریکییەکەی هۆکار، ئایتیا (aitia) لە زمانی دادگاوە هاتووە. مرۆ لە پرۆسەیەکی دادگاییدا دەپرسێت، کە داخۆ کێ ئایتیا بێت، واتا کێ بەرپرس بێت لەوە کە تاوانێکی تایبەتی ئەنجامدراوە. مرۆ ناتوانێت پشت بە فاکت ببەستێت بۆ ئەوەی وەڵامێکی راستی ئەم جۆرە پرسیارە بداتەوە، بەڵکو وەڵامی راستی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە مرۆ کەسێک وەک هۆکار، بۆ نموونە وەک تاوانبار، ناودەبات– ئەمە تەنانەت لەو کاتەشدا کە دەشێت ناوی ژمارەیەکی فرە فاکت ببرێت کە بەرپرسیارن لە روودانـی تاوانەکە، بۆ نموونە ئۆتۆمۆبیلەکە زۆر خێرا ئاژوتووە یان جادەکە بەهۆی بەفر و شەختەوە لـووس بـووە. دووەم، پلاتۆن لەم وەڵامەدا دەیەوێت لایەنێک بەدەر بکات: ئەو نایەوێت کەسێک گریمانەی بەشێکی لەش، واتا گریمانەی سەر بکات وەک هۆکار بۆ قەوارەی (باڵای – و) سیمیاس. سۆکرات دەبێژێت: سەر هیچ شتێک روونناکاتەوە، چونکە سەرجەم باڵای لەش قەوارەی سیمیاس پێکدەهێنێت نەک تەنیا سەری. مۆرکی سەر ئەوە نییە کە مرۆڤێک گەورەتر بکات. قەوارەی سەر مەرجی زەرووری و ساتارکەر نییە بۆ ئەوە کە سیمیاس گەورەترە. گەر ئێمە سیمیاس بە مرۆڤێکی گەورەتر بـەراورد بکەین، ئەوسا دەشێت سیمیاس بە هێندەی سەر بچووکتر بێت لەو مرۆڤەی دی. سەر وەک سەر هیچ مرۆڤێک گەورەتر یان بچووکتر ناکات و هەرگیز ناشێت هۆکار بێت بۆ گەورەتربوونی کەسێک لە کەسێکی دی. سیمیاس بەهۆی ئیدێی قـەوارەوە گەورەترە لە سۆکرات. نموونەیەکی دی: ئایا جوانیی وێنەیەکی تایبەتی چ هۆکارێکی هەیە؟ هۆی ئەم جوانییەی وێنەکە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە گۆیا ئەو وێنەیە رەنگی تایبەتی یان بونیادێکی تایبەتیی هەیە.

وێنەکە بەهۆی ڕەنگ و بونیادەکانەوە جوان نییە، بەڵکو بەڕێی ئیدێی جوان-ـەوە جوانە. پلاتۆن ئەم تێڕوانینە بەم چەشنە ڕووندەکاتەوە: هەمان ڕەنگ و بونیادگەل کە ئەو وێنەیە وەک جوان دیاردەهێنن، دەشێت وێنەیەکی دی وەک ناشرین دیاربهێنن. تەنیا خودی جوان دەشێت هۆکار بێت بۆ جوانیی ئەو وێنەیە. گەر کەسێک بییەوێت تێبگات کە بۆچی وێنەیەکی تایبەتی جوانە، ئەوسا هیچ سوودێکی نابێت لە ڕەنگ و فۆرمەکان بهزرێت، چونکە ئەوە ڕەنگ و فۆرمەکان نین کە وێنەکە جوان دەکەن. مرۆ پێویستە لەبریی ئەوە ڕووبکاتە ئەو پرسیارە کە داخۆ خودی جوان چی بێت. تەنیا گەر مرۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، ئەوسا دەزانێت بۆچی وێنەیەکی تایبەتی جوانە.

پلاتۆن بەم نموونانە دەیەوێت ببێژێت: ئیدێکان هۆکارن بۆ ئەوە کە شتێک ئەوهایە، وەک چۆن ئەو هەیە. ئیدێکان، وەک ئیدێی یەکسانی، جوانی یان قەوارە وەڵامی ڕاستەقینەی پرسیاری هۆکارەکان دەدەنـەوە: ئیدێکان هۆکارن بۆ ئەوە کە شتەکان ئەوهان، وەک چوچن ئەوان هەن. بەڵام هۆکاربوونی ئیدێکان پێشتربوونێکی ئێپیستێمی و ئۆنتۆلۆگیانەی هەیە. ئیدێکان لە ڕووی ئێپیستێمییەوە سەرەکین، چونکە ئێمە تەنیا کاتێک لە ڕەوشێک (بۆ نموونە «وێنەیەک جوانە») تێدەگەین، گەر تێگەیشتبێتین کە جوان چییە، کەواتە لەو جوانە تێگەیشتبێتین کە وێنەکە بەڕێیەوە جوانە. هەروەها ئیدێکان لە ڕووی ئۆنتۆلۆگییەوە سەرەکین، چونکە شتێک تەنیا کاتێک هۆکارە بۆ هەبوونی ڕەوشێک (بۆ نموونە ئەو ڕەوشە کە وێنەیەک جوانە)، گەر ئەم هۆکارە بەڕاستی هەبێت. بەبێ هۆکارەکە نەشیاوە ڕەوشەکە هەبێت، چونکە پرسیارکردن لەبارەی هۆکار پرسیارکردنە لەبارەی ئەوە کە داخۆ چی بەرپرس بێت لە هەبوونی ئەو ڕەوشە. بەڵام ئەم هۆکارە دەبێت کردەکی (wirklich/aktual) بێت، چونکە گەر وا نەبێت، ئەوسا ناتوانێت بەرپرس بێت لەو ڕەوشە کە ئەو خۆی هۆکارێتی.

بـەهـەرحـاڵ، لە خـودی تێڕوانینی پلاتۆندا بۆ ئیدێکان وەک هۆکار پرسیارگەلی پڕواتا بەکراوەیی دەمێننەوە. پلاتۆن دەبێژێت، کە ئەم ئیدێیانە هەن، بەڵام ئێمە هێشتا بەوە نازانین. بەڵام ئایا ئەم تێڕوانینەی ئەو چ واتایەک دەگەیەنێت؟ تەنانەت دەشێت لەدژی گریمانەی هۆکاربوونی ئیدێ گومان بکرێت. پلاتۆن لە زاری سۆکراتەوە گریمانە دەکات کە F بەهۆی ئیدێی F هەیە، ئەمەش گریمانەیەکی سـادە و جەختە، بـەڵام ئـایا ئـەمـە بەڕاستی زانیارییبەخشە؟ ئایا ئاماژەکە بۆ ئیدێی F کارایی ئەو ڕوونکردنەوەیە بەدیدەهێنێت کە پێویستە وەڵامی پرسیاری هۆکارەکان بەدیبهێنێت؟ بێگومان پلاتۆن لە «فایدۆن»دا دەبێژێت، کە کاتێک ئێمە لە ئیدێ دەدوێین، ئەوا لێرەدا ناتوانین هەمیشە لەسەر نموونەی سانای «ئیدێی F بریتییە لە هۆکار بۆ ئەوەی شتێک بریتی بێت لە F » بڕۆین. ئەو بۆ نموونە سۆکرات دەبزوێنێت ئاماژە بۆ ئەوە بدات کە هۆکاری گەرمبوونی شتێک ئیدێی گەرمی نییە، بەڵکو ئاگرە، یان هۆکاری نەخۆشیی مرۆڤێک ئیدێی نەخۆشی نییە، بەڵکو تا هۆکاری نەخۆشییەکەیە. سەرەڕای ئەمە هێشتا هەر ناڕۆشنە کە کەی بتوانین دروسـت «ئیدێی F » وەک هۆکاری ئـەوە کە شتێک بریتییە لە F، وەربگرین و کەی نەتوانین وەریبگرین. هەروەها ئـەوەش ناڕۆشنە کە داخۆ

ئیدێ چ جۆرێکی هۆکار بێت. کاتێک ئێمە دەبێژین درەختێک هۆکاری سێبەرێکە یان ڤایرۆسێک هۆکاری نەخۆشییەکە، ئەوا ئەم دەربڕینەمان واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە درەختەکە سێبەری خۆی دەخاتەوە یان ڤایرۆسەکە هۆکارێکە بۆ ئەو نەخۆشییە. ئێمە لێرەدا دەتوانین لە هۆ - ئەنجام بدوێین. بەڵام ئایا گەر ئێمە هۆکاربوونی ئیدێ وەک هۆئەنجام وەربگرین، ئـەوا ئەم کارەمان هیچ مەغزایەکی دەبێت؟ ئایا ئیدێی قەوارە لە چ مەغزایەکدا ئەو کاریگەرییە دەنوێنێت کە ئیتر سیمییاس بە هێندەی قـەوارەی سەر لە سۆکرات باڵابەرزتر بێت؟ گەر نەشێت ئیدێ لە مەغزای هۆئەنجامدا هۆکار بێت، ئەی لە چ مەغزایەکی دیکەدا دەتوانین ئاوەزمەندانە ببێژین کە ئیدێ هۆکارە؟

وەرگێڕراوە لە:

Michael Brodt: Platon. Freiburg im Breisgau 1999

### فەرهەنگۆك

ئافۆریزم: گۆتەی پڕمەغزا، هزرۆکەیەک کە کورت و پڕ دەربڕراوە.

ئاپریۆری: پێشئەزموون، بەدەر لە ئەزموون، لە دەرککردن.

دەروێنە: دیـاردە یان رواڵـەتی کـرۆک، دیـاردەی سەروێنە

ئێپیستێم: زانین، ناسین

فۆرمولی پێناسە: فۆرمی پێناسە بریتییە لە: F = P. F هێمایە بۆ ئەو تێگەیە کە گەرەکە پێناسە بکرێت (بۆ نموونە رەبەن). «P»فۆرمولی پێناسەیە بۆ «F» و بەرپێیەوە پێناسەی «F» دەکرێت، واتا پیاوێک کە هاوسەرگیریی نەکردووە. (بڕوانە، بەشی یەکەمی ئەم وەرگێڕانە لە: گۆڤاری سەردەم، ژ ٧٢، ٢٠١٢)

کردەکێتی: بە گریکی «ئێنێرجێیا»، بە لاتینی «ئەکتوالیتاس»، بریتییە لە تێگەی گشتگیری ئەوە کە بەڕاستی هەیە، لەگۆڕێیە سەربەخۆ لە مرۆڤ، هـەروەهـا مەبەستی تێگەکە روودەکـاتـە کرۆکی هەبووەکە. بە پێچەوانەی کردەکییەوە، هێزەکی یان شیمانەیی (پۆتێنسیالێتی) هەیە کە هێشتا کردەکی نییە.

کشان (ی تێگە - واژە): واتای چێوەی تێگە یان واژە دەگەیەنێت، سەرجەم ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەشێت تێگەیەک لەبارەیان دەرببڕرێت.

سەروێنە: ئیدێ یان نموونەی سەرمەدیی دەروێنەکان یان دیاردەکان.

سێنس: ئۆرگانەکانی دەرککردن، کە بریتین لە سێنسەکانی بینین، بیستن، چێژتن، بۆنکردن، گرتن.

# هێزی یاسادانان و دەستەواژە بنەڕەتیەکانی تیۆری سیاسی جۆن لۆک

د. محمد تۆفیق گولسۆی
و. لە تورکییەوە : ڕەسوڵ حەسەن

جۆن لۆک لە ساڵی ١٦٣٢ لە دایک بووە و لە ساڵی ١٧٠٤ کۆچی دوایی کردووە. ساڵانی شەڕی نێوخۆ و شۆڕشی بێ خوێن ونوێبونەوە و لیبرالیزم سەرەتای گەنجێتی جۆن لۆک بوون. لە تەمەنی ئەوکاتەی لە ئینگلتەرا دوو گروپی پادشاکان (قراڵەکان) و لیبراڵەکان لە دروستبوندابوون. جۆن لۆکیش لە ریزی لیبراڵەکاندا بوو .

جۆن لۆک لە سیاسەتدا لایەنگری زانستی بوون بوو و لایەنگری لە بەڕێوبەرایەتی دەستوری دەکرد و کردبوویە بژار بۆ خۆی. دوای (کرۆمویل) (ستوارت) چووە سەر دەسەڵات کە خانەدانێکی دەمارگیر و ڕەهاگەرایەکی کوێرانەبوو، جۆن لۆک لە دژی ئەمە لەمیانی باوەڕی بە شەفافیەت و سیستەمی نوێنەرایەتی و پەرلەمان ودیموکراسی , پشتگیری لە شۆرشی بێخوێن کرد. لۆک



کە پارێزگاری لە چینی ناوەڕاست و بازرگان و خاوەن زەویەکان دەکرد و مافی موڵکایەتی دەپاراست و لیبراڵێکی راستەقینە بوو.
ئەگەر ئەو هەلومەرجانەی کەمایەی سەرنجدان بوون لەو قۆناغەی کە (جۆن لۆک) تیایدا ژیاوە لەبەرچاو بگیرێت ئـەوا وەکـوو سەرکردەیەکی رۆشنبیری لیبرالیزم لەقەڵەم دەدرێت.
جۆن لۆک کەسێک بوو کە لەکێشە ئابووری و سیاسی و پەرێوەبەرایەتیەکان تێدەگەیشت و بەهۆشیاریەوە دەیخستنە روو. شتێکی دیکەش کە گرنگیەکەی لەمانە کەمترنیە ئەوەیە کە کەسێکی بە ئەزموونی پراکتیکی بوو.
پەرتوکی (Two Treatises of Government) کە بیرو بـاوەڕەکـانـی جـۆن لـۆک سـەبـارەت بە سیاسەت و دەوڵەت دەخاتە روو, لە ساڵی ١٦٩٠ چاپ کرد. پەرتوکەکە لە دوو بەش پێکدێت. بەشی یەکەمی (The first Treatise of Government) وەڵامێکە بۆ بەرهەمی (سیر رۆبەرت فیلمەر)بە ناوی (Patriarchal or The natural Power of kin) کە ویستویەتی ئەوە بخاتە روو کە پێغەمبەر ئادەم

راستەوخۆ دەسەڵاتی لە خوداوە وەرگرتووە و ئەم دەسەڵاتە لە باوکەوە گواستراوەتەوە بۆ کوڕ و تا لە جاخی نوێدا گەیشتۆتە پادشاکان (قراڵەکان)
جۆن لۆک دوای ئەوەی لە یەکەمین توێژینەوەیدا بیرو بـاوەڕەکـانـی سـەبـارەت تایبەتمەندیەکانی میتافیزیک بۆ بەدیهێنانی باڵادەستی , بێ بەرهەم و مایە پوچ بـوو. لە دووەم توێژینەوەیدا (The second treatise of Civil Government) بیروبۆچونەکانی خۆی سەبارەت بە سەرچاوەی بەرێوەبەرایەتی و چۆنایەتیەکەی لەچوارچێوەی بیردۆزیی سیاسیدا دەخاتە روو. دووەمین توێژینەوەی هەم وەکوو یەکێک لەو بەرهەمانە پەسند دەکرێت کە بەشێوەیەکی هەرەباش فەلسەفەی سیاسەتی لیبراڵیانەی بەکارهێناوە و کاریگەری گەورەی هەبووە هەم وەکوو یەکێک لە بەرهەمە هەرەگرنگەکانی تیۆری سیاسی پەسند دەکرێت.
(جـۆن لـۆک) تایبەتمەندی بوونی بە یەکێک لە سیما هەرە گرنگەکانی مێژووی بیر (فکر)ی سیاسی لە میانی گرنگی دان بە ئازادی مرۆڤ و خستنە ژێر پرسیاری شەرعیەتی ئەو دەزگایانەی کە ئەم

ئازادیانە سنوردار دەكەن، بەدەستهێناوە. زۆرشت دەربارەی لۆک گوتراوە. لێرەدا ئێمە دەمانەوێت دەستەواژە بنچینەیەكانی تیۆریەكەی و ئەو رۆڵەی كە بەشێوەیەكی ریشەیی گێراوێتی بۆ دیاری كردنی سنور و سەرچاوەی دەسەڵاتی یاسایی بخەینە روو.

هۆبز



## ١ - تێگەیشتنی بۆ مرۆڤ و كۆمەڵگە

(جۆن لۆک) دوای ئەوەی لە یەكەم توێژینەوەیدا چەمک و بیرۆكەی باڵادەستی میتا فیزیكیانەی سەبارەت بەوەی كە دەسەڵاتدارێتی لە ئادەمەوە تا پادشاكان هاتووە , شكستی هێنا. باس لە ناچاری دۆزینەوەی رێگایەكی تر دەكات لە پێناو هاتنەكایەی بەرێوەبەرایەتی و لە پێناو روونكردنەوەیەكی تری هێزی سیاسی (دەوڵــەت) و لە پێناو ناسینی سەرچاوەیەكی ترو ئەوانەی ئەو هێزە سیاسیەیان گرتۆتە دەست. دوای ئەوە دەبینین (جۆن لۆک) هێزی سیاسی پێناسە كـردووە. بەبۆچوونی ئەو هێزی سیاسی مافی خۆیەتی یاسا دابنێت بۆئەوەی دەوڵەت دابمەزرێنێ لە بەرامبەر هەڕەشەی بیانیەكان وە هەروەها بۆئەوەی گوڕەپانی موڵكیەت رێكبخات و سزای مردن یاخود سزای كەمتر توند دابنێت. لۆک كە هێزی سیاسی بەمشێوەیە پێناسە كردووە، بۆئەوەی چۆنایەتی ئەو هێزە سیاسیە بسەلمێنێ. هــەروەكـوو (هۆبز (Hobbes كـردی ئەویش بارودۆخی سروشت دەكاتە بنەماو بیردۆزی خۆی و بەمشێوەیە خستۆتە روو.

### ا - بارودۆخی سروشت.

لە مێژووی بیری سیاسیدا دەستەواژەی (سروشت) تابلێی شوێنێكی گرنگی داكیركردووە. بەڵام دیسان ئەم دەستەواژەیەش وەكوو گەلێک لە دەستەواژەكانی تـری تیۆری سیاسی وەک پێویست روون نیە.

لەگەڵ ئەوەی کە دەستەواژەی (سروشت) لە چەند واتایەکدا بەکاردەهێنرێت. (جامیس مۆری James moore) ئەو بۆچونانەی کە پێیانوایە بنچینەی کۆمەڵگە پشت بە سروشت دەبەستێ دابەش دەکاتە سەر سێ گروپی سەرەکی.

یەکەم: قوتابخانەی هەست و سۆزی سروشتی مۆراڵیەکان یاخود قوتابخانەی هەست و سۆزی سروشتییە. کە فەیلەسوفەکانی گەلی ئینگلیز (شافتیسبوری Shaftesbury و هوتچیسۆن Hutcheson) نوینەرایەتیان کردووە

دووەمـیـان: قوتابخانەی حقوقی سروشتی یە Stoacilar کە بیری کۆنی یۆنانە لە رێگەی مافناسانی رۆمان و مافناسانی هۆڵەندا گەیشتۆتە سەردەمی جۆن لۆک بەشێوەی چەندین قوتابخانە خۆی نیشانداوە.

هەرچی سێهەمیانە: (جۆن لۆک)ی وەکوو کاریگەرترین نوێنەری دیاریکردووە لەگەڵا قوتابخانەی حقوقی سروشتی ئاوێتەی یەکتربوون ئەویش قوتابخانەی مافە سروشتیەکانە.

تیۆرەکانی حقوقی سروشتی لە میانی گریمانەی بارودۆخی سروشت و سروشتی مرۆڤەوە دەست بەکار دەکـات. سروشتی مرۆڤ خاڵی کارکردن و دەستپێکردنی تیۆری کۆمەڵایەتیە، لێرەدا گریمانەی سەرەکی ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێت یا باش یا خراپ بێت وە یا ئاشتی خۆش بوێت یا شەڕ.

مافناسانی سروشتی هەرچۆنێک بێت کاتێک ویستویانە تیۆرێک دابنێن سروشتی مرۆڤیان بە واتای باش (وەکوو لە لۆک) وەیا لە واتای خراپ (وەکوو لە هۆبز) کردۆتە بیرۆکە. بەڵام با یەکسەر ئەوەش دەستنیشان بکەین بەشێوەیەکی گشتی مافناسانی سروشت کە دەڵێن (سروشت یا سروشتی) مەبەستیان قانونێکی ئەقلی سروشتییە. ئەو حقوقە سروشتیەی کە سەرچاوەی لە ئەقلا گرتووە ئەبەدیە، ناگۆرێت هەروەکوو چۆن هەموو کاتێک لەسەروی حقوقی پۆزەتیفە، حقوقی پۆزەتیف پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ بنەماکانی حقوقی سروشتی.

بە بۆچوونی (لـۆک) بـۆئـەوەی لە سـەرچـاوەی ئافراندنی هێزی سیاسی تێبگەین پێویستە سەیری ڕەوشی هەموو مرۆڤەکان بکەین لە سروشتدا. لە بارودۆخی سروشتی (هۆبز)دا، مرۆڤ دروستکەری مرۆڤە. کاتێک هەلومەرجی سروشتی لە بارودۆخی سروشتدا قورسایی دایە سەرکاردانەوە سەرەتاییەکان مرۆڤەکان کەوتونەتە نێو شەرێکی باوەرنەکراو لەبەرامبەر یەکتر.

هـۆکـاری ئـەو تێکۆشانە لە نێوان مرۆڤەکاندا، پێشبرکێ (منافسە) و بێ باوەڕی و مەیلی باڵادەست بوونە. لەبەرامبەر ئەمەدا بەبۆچوونی (لۆک) مرۆڤ تەواو ئازادە لە بارودۆخی سروشتدا ئەمە لەهەمان کاتدا بارودۆخێکی یەکسانیشە. مرۆڤ ئازادە چونکە لەنێو سنورەکانی یاساکانی سروشتدا بەهیچی ترەوە پەیوەست نیە و دەتوانێت بەویستی خۆی چالاکی ئەنجام بدات و کەسایەتی و سەروەت و سامانی خۆی بەکاربهێنێت. بەڵام رەوشی ئەو ئازادیە وانیە کە بڵێی سەری ئاوەڵایە. سەرپەرشتی یاخود کۆنترۆڵی کەسایەتی و سەروەت و سامانی مرۆڤ ناکات.

بەڵام مرۆڤ بۆ پاراستنی ئەمانە خاوەنی ئازادیەکی وەها نیە کە خۆی یا ئەو هەبوونەی کە لە بەردەستیدایە لەناوببات. یاسای سروشت کە بارودۆخی سروشت و هەموو کەسێک پەیوەست دەکات لە بەرئەوەی ئازاد و یەکسانە بۆ هەموو مرۆڤایەتی , ئەوە فێر دەکات کە نابێ زیان بە ژیان و تەندروستی و ماڵی کەسانی تر بگەیەنرێت. هەرچی سەبارەت بە یەکسان بوونی مرۆڤەکانیشە لە بـارودۆخـی سروشتدا پێویستە هەموجۆری هێز و دادوەری بەرامبەربن و پێویستە

ئەمانە لە دەست هیچ کەسێک زیاتر نەبن لە کەسانی تر.
بە بۆچوونی (داهل) لەگەڵ ئەوەی (جۆن لۆک) لە روانگەی چەندین هەلومەرجەوە بۆ مرۆڤەکان پەسندنیە , بەڵام جۆرە یەکسانیەکی سروشتی بۆ گەراندۆتەوە کە بۆ ئامانجە دیاریکراوەکان دەبێتە مایەی گرنگی. (لۆک) لایەنی کەم باوەریەکی بنچینەیی گەردوونی داهێناوە کە مرۆڤەکان یەکسانن وە یاخود پێویستە وای پەسندبکەین کە یەکسانن لەو بابەتانەی کە پێویستیان بە بڕیاری هەرەوەزیانە (کۆلەکتیف) هەیە. ئەم ئاماژەیەی لۆکە لە هەمان کاتدا. نیشاندانی سروەی بیروباوەری هاوبەشی ئاینە پیرۆزەکانە.
بە بۆچوونی لۆکە ئەوە کاری خوداوەند (تانری) یە کە مرۆڤەکان هەموویان باڵادەست و خاوەنی هێزی رەهان. هەموومان بەهەمان شێوە نەخشێنراوین و یەک بارودۆخی سروشتیشمان هەیە. بیر لە هیچ پلەبەندیەک لە نێوانمان ناکرێتەوە کە دەسەڵاتی یەکتر لە ناوبردن بێنێتە ئاراوە. ئەگەر وەهابێت ئەوا پێویستە هەمووکەسێک رێز لە یەکتر بگرێت. بنەماکانی ئەمە لەلایەن یاساکانی سروشتەوە دیاریکراوە. ئەگەر لەبارودۆخی سروشتدا کەسێک ماف پێشێل بکات , ئەوا لەبەرئەوەی مرۆڤ خاوەنی مافی سزا دانە هەموو کەسێک مافی ئەوەی هەیە هێرشکار سزابدات و یاساکانی سروشتی بەسەردا جێ بە جێ بکات. بەڵام کە مرۆڤەکان لە بارودۆخی سروشتدا بوونەتە خاوەنی مافی سزادان بەهۆی بوون بە دادوەر بۆ داوای مرۆڤەکان و لە هەستی تۆڵە سەندنەوە و لاوازیە مرۆڤایەتیەکان و بریاردان لە خزمەت خۆیی و کەسانی نزیکی خۆی لەوانەیە رەوشێکی زێدەرۆییانە و سنور بەزێن بێنێتەکایەوە. هەرچی ئەنجامی ئەمەشە بریتی یە لە تێکەڵا و پێکەڵی و ناڕێکی. ئیتر ئەو رەوشە بۆتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان کۆمەڵگەی سیاسیانە دابمەزرێنن. ئەمە لە هەمان کاتیشدا خاڵی دەستپێکردنی دیاریکردنی سنورەکانی دەسەڵاتی سیاسیشە.

### ب - بارودۆخی شەڕ

ئێمە دەبینین (لۆک) تەنیا بە بارودۆخی سروشت نەوەستاوە وەکوو هۆکارێک بۆ چوونە نێو مەسەلەی کۆمەڵگەی سیاسی. دوای بارودۆخی سروشت لۆکە باس لە بارودۆخی شەڕ دەکات. بەبۆچوونی (لۆک) بارودۆخی شەڕ بارودۆخی دوژمنایەتی و لە نێو بردنە.
لە میانی یاسای بنچینەیی سروشتدا تابکرێت دەبێت مرۆڤ زۆر بپارێزێت، ئەگەر هەمووشی نەپارێزرێت ئەوا پێویستە ئاسایشی بێ تاوانەکان بکاتە بژار، بەم هۆیەوە ئەوەی بە لەنێوبردن هەرەشە لە من دەکات ئەوا دەبێت من مافم بۆ لەنێوبردنی ئەو هەبێت و ئەمەش گونجاوە لەگەڵ عەقڵ و عەدالەت. هەندێک لە کەسەکان جیاوازی نێوان بارودۆخی سروشت و بارودۆخی شەڕ تێکەڵاو دەکەن. مرۆڤەکان لە سەر رووی زەویدا خاوەنی دەسەڵاتی هاوبەشن لە لێپێچینەوەی نێوان خۆیان.
کەس لەسەرووی ئەوی تر نیە و هەرکەس بەگوێرەی یاساکانی ئەقڵ ژیان دەگوزەرێنێ , ئەمە بەتەواوی بارودۆخێکی سروشتیە. لەبەرامبەر ئەمە بەپێی بوونی بەرپرسیارێتی هاوبەش کە بەپیر یارمەتیدانیانەوە بچێت و یەکێک گوشار بخاتە سەر کەسایەتی یەکێکی تر وە یا نیەتێکی بەمشێوەیە بخاتە روو ئەوا بارودۆخی شەڕە.
شیمانەی ئەوە هەیە (لۆک) ئەم بۆچوونەی لە بەرامبەر بۆچوونەکانی (هۆبز) پێش خستبێت.

چونکە (لۆک) نابێت وەکوو ئەوبێت و هەڵدەستێت بە گوزارشت کردنێکی جیا لە بارودۆخی سروشتی و بارودۆخی شەڕ کە (هۆبز) باسی لێوە کردووە.
بە بۆچوونی (لـۆک) مرۆڤەکان بۆ ئـەوەی لە بارودۆخی شەڕ رزگاربن بارودۆخی سروشت بەجێ دەهێڵن و بەرەو بارودۆخی کۆمەڵگەیی دەچن، واتە هۆکاری دورکەوتنەوە لە بارودۆخی سروشت و چونە نێو رەوشــی کۆمەڵگەیی هەوڵەکانی رزگاربونە لە بارودۆخی شەڕ. چونکە دۆزینەوەی هێزێکی سەروتر بۆ فەراهەمکردنی یارمەتی لەسەر رووی زەوی بـۆخـۆی. کۆتایی هێنان بە شەڕ فەراهەم دەکات و هەر ئەو هێزەش بریار لەسەر رێکنەکەوتنەکان دەدات. بەم شێوەیە (لۆک) گوزارشت لە دروست بوونی ئەو هێزە باڵایە دەکات کە بەسەردەکرێتەوە. یاخود بەم شێوەیە باس لە دامەزرانی کۆمەڵگەی سیاسی دەکات کە لەبەرامبەر هاتنە ئارای بارودۆخی شەڕێک کە دەتوانێت لە هەر چرکەیەکدا هەڕەشە بێت بۆسەر بارودۆخی سروشت و ئازادی و یەکسانی و ئاسایشی هەیی دروست بووە. هەرچی واتای ئەوەشە هۆکاری هەبوونی هێزی باڵا بۆ پاراستنی گیان و ماڵ و ئـازادی کەسەکانە لە بەرامبەر هەر هێرشێکدا.

## ج - کۆیلایەتی.

بۆچوونەکانی لۆک سەبارەت بە کۆیلایەتی، لە روانگەی دیاریکردنی هێزی یاسادانانندا گرنگە. بە گوێرەی بۆچوونی ئەو ئازادی سروشتیانەی مرۆڤ، پێویستە بەخشرابێت لە پەیوەست بوون بە ویستی و دەسەڵاتی مرۆڤ بۆ یاسا دانان بۆ مرۆڤەکان و هەموو هێزێکی باڵا لە دنیادا. ئازادی سروشتیانەی مـرۆڤ تەنها پەیوەستە بە بنەمای یاساکانی سـروشـت. هەرچی لە حاڵەتی کۆمەڵگەیشدایە ئازادی مرۆڤ دەتوانرێت پەیوەست بکرێت بەهێزی یاسادانانی دەوڵەت کە بە دەنگ یاخود زۆرینەی دەنگ دامەزراون. بەڵام ئەم هێزەی یاسادانان نابێ لەژێر کاریگەری هیچ ئارەزوو و یاسایەکدا بێت و بەگوێرەی ئەو دەسەڵاتەی پێی دراوە دەتوانێت بریاربدات.
ئەو شێوازەی (لۆک) لێرەدا پەیرەوی لێکردووە، لەوەی زیاتر کە (یەکسانی سروشتی) چی دەگەیەنێ، باسی لـەوەکـردووە کە یەکسانی سروشتی چی ناگەیەنێ. بۆیە لە گوتاری کۆیلایەتی ئەو ئەنجامە دەردەخین کە ئەمە یەکسانیەکی سروشتی نیە. بارودۆخی شەڕ لە نێوان دەستبەسەرێک و فەتحێکی یاساییانە بەردەوام دەبێت. تایبەتمەندێتی تەواوی کۆیلایەتی ئەوەیە کە کاتێک هەڵەیەکی کردووە شایانی سزای کوشتنە و خاوەنەکەی سزای نادات ئەویش هەڵدەستێت بە خزمەتکردنی خاوەنەکەی. تەنگەتاوی کۆیلایەتی لەوکاتە دەردەکەوێت کە لە دژی ئارەزوەکانی خاوەنەکەی بەرخودان بکات. ئەگەر وابێت لەسەر هەموو کەسێکدا لە ئان و ساتێکدا ئەو پەیمانەی کە لە پێناو هێزێکی سنوردار کراوە کۆتایی هات , ئەوا بارودۆخی شەڕ و کۆیلایەتی رادەوەستێت. بۆیە هیچ کەسێک پەیمان نابەستێت بۆ ئەوەی هێزی خۆی بدات بە کەسێکی تر. رەوشێکی پێچەوانەی ئەمە بە تەواوی دەبێتە کۆیلایەتی. بەم شێوەیە (لۆک) گۆڕەپانی شەڕی دەسەڵاتی گشتی سنوردار دەکات لە میانی ماف و ئازادیەکانی تاک لە سەرووی هەموشیاندا مافی موڵکایەتی، کە لەمیانی بارودۆخی سروشت و یاسای سروشت دیاریکراوە.

## ١ - تێگەیشتنی بۆ موڵکیەت.

ئەوشتەی کە بنەمای فکری (لـۆک)ی پێکهیناوە

موڵکیەتە. چونکە موڵکیەتی تابڵێی لە واتایەکی فراواندا بەکار هێناوە.
لۆک وشەی (Estate , property) بەکاردەهێنێت کە مانای موڵکیەت دەدات. وشەی (property) لەگەڵا موڵکیەت هەندێک جار ژیان و ئازادیش لەخۆوە دەگرێت. لەواتایەکی فراواندا باس لە موڵکیەت دەکات کە مرۆڤێک خاوەنێتی. هەرچی (Estate) شە، بۆ موڵکیەت بەکار دەهێنرێت لەواتایەکی تەنگ. لە بەرهەمێکیدا بە ناوی (نامەیەک لەسەر لێبوردەیی) (لۆک) موڵکیەت لە واتایەکی فراواندا پێناسە دەکات. بەبۆچوونی ئەو دەوڵــەت لە کۆمەڵەیەک مرۆڤ پێکدێت تەنها بۆ ئەوەی کە بەرژەوەندی مەدەنی مرۆڤەکان فەراهەم بکات و بپارێزێت و پێشبخات. ئەم بەرژەوەندیانە، ژیان، ئازادی و تەندروستی و موڵکیەتە دەرەکیەکانی وەکوو پارە، زەوی، خانو و شتومەکن.
هەروەها دیسان (لۆک) لە بەرهەمی بەناو (Two Treatises of Government) دەڵێت موڵکیەت بریتی یە لە گیان و ئازادی و ماڵا.
بەگوێرەی بیرو بۆچوونی (لۆک) خاوەنێتی ژیان و ئــازادی و مــاڵ لەیەکتری جیا ناکرێتەوە و هەموویان یەکێکن وە بەشێوەیەکی گشتی لە میانی دەستەواژەی موڵکیەتەوە گوزارشتیان لێدەکات. لەگەڵ ئەمەدا ئەمە یەکێکە لــەو کــارانــەی کە فەلسەفەکەی (لۆک)ی ئەنالیز کردووە. لە میانی بەکارهێنانی ڕۆژانەوە واتای مولکیەتی دەرخستۆتە پلانی یەکەم.
لە تەک ئەمەدا (لۆک) باوەری وایە کە مولکیەت لە ڕێگەی کارەوە بەدەست دەخرێت. بەبۆچوونی ئەو رووی زەوی نیعمەتێکە لەلایەن خواوە بە مرۆڤ دراوە , بۆ ئەوەی بە هاوبەشی سودی لێ ببینن. مرۆڤ کە خولقێنراوێکی ئاقلمەندە بۆ بەکارخستنی ئەو نیعمەتەوە کار دەکات. بەرهەم دێنێت و بە رەنج خۆی دەخاتە نێو سروشت و ئەو نعمەتە دەبێتە ماڵی ئەو , لێرەدا سەرچاوەی راستەقینەی مولکیەت هەوڵ و کۆششی مرۆڤ دەبێت. سەبارەت بە کردنە ماڵ یاخود بە دەستهێنان لە دەرەوەی کار هیچ پەیمان و یاسا و یاخود دەسەڵاتێک مەیسەر نابێت.
(لــۆک) ئــەوە دەخــاتــە روو کە ئــەو شتانەی لە میانی رەنجی مرۆڤەوە بەرهەم دێن دەبێتە مافێکی سروشتی ئەو. مولکیەتی تایبەت لەبەرئەوە لە دایک بووە چونکە ئەو شتەی بە رەنجی مرۆڤ بەرهەم هاتووە و بۆتە مایەی پەلهاوێشتنی کەسایەتی خۆی. مرۆڤ لە میانی بەکارهێنان و خەرجکردنی هێزی خۆی ئەو شتەی بەرهەم هاتووە دەکاتە بەشێک لە خۆی.
سودەکانی ئەمانەش بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەو رەنجەی کە دراوە بەرامبەر و هاورێژەن. لەلایەکی ترەوە مرۆڤ ناچارە ئەمە بکات بۆئەوەی بژیت. بۆیە پێویست بە رەزامەندی کەسانی تر ناکات , چونکە چاوەروانی کردنی رەزامەندی مرۆڤەکانی دی، لەوانەیە چاوەڕوانی ئەو رەزامەندیە هاوبەشەی کە لەوانەیە هیچ کاتێک نەیەتە ئاراوە دەبووە هۆی گیان لە دەستدانی.
ئەگەر کۆی بکەینەوە سەریەکتری ئەوا دەریدەخاتە روو کە مافی موڵکیەتی مرۆڤ لە بارودۆخی سروشتدا لە دووجێگەدا سەرچاوەی گرتووە.
١ - رەنجەکەی، بۆیە شتومەک دەکاتە پارچەیەک لەخۆی.
٢ - هەڵوەستە لەسەر خاوەندارێتی کردن بۆئەوەی بژیت , واتە بوون بەخاوەنی شت. یەکەمیان مافێکە پشت بە پەیمان دەبەستێت و هەموو کەسێک مافی ئەوەی هەیە هەمان شت بکات. هەرچی لە روانگەی دووەمیشیانە لەبەرئەوەی لە سروشتی مرۆڤ



روسێل

سەرچاوەی گرتووە مافێکی سروشتیە.
(لۆک) هەوڵی داوە سنورەکانی مافی موڵکیەتیش دەستنیشان بکات. بەگوێرەی ئەوەی کە خوا خاکی بە مرۆڤ بەخشیوە مافی موڵکیەت پیرۆزە. کەس دەستدرێژی ناکاتە سەر خاک و موڵکی کەسێکی تر. لەبەرئەوەی خوا (تانری) کە خاکی بەمرۆڤداوە و دەیەوێت هەموو مرۆڤێک لەو نیعمەتە سودمەند بێت، مافی مرۆڤە کە بە رادەی دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی موڵکی هەبێت. لەم ڕەوشـەدا مافی موڵکیەتی هەرکەسێک لەگەڵ کەسەکەی تر سنوردارکراوە. بەر لە کۆمەڵگە پاراستنی ئەو مافەی کە هەیە دەکەوێتە سەر یاساکانی کۆمەڵگە. دەسەڵاتی سیاسی دەسەڵاتێکە کە خاوەندارێتی موڵک داویانە بەخاوەن موڵک.

سەبارەت بەتێگەیشتنی (لۆک) بۆ موڵکیەت راستی بیروڕای جیاواز دێین. هۆکاری ئەمەش لەو واتا و گرنگیەوە سەرچاوە دەگرێت کە داویەتی بە دەستەواژەی موڵکیەت. بۆنمونە روسێل (Russel) هەندێک رەخنە پێش دەخات سەبارەت بە چەمکی موڵکیەتی (لۆک) کە پێی وایە هەندێکیان ناتوانرێت جێ بە جێ بکرێت و هەندێکیان کەموکورتیان هەیە و هەندێکیان لەسەر نمونەی چەوت بونیادنراون. لە سەرودا بە بۆچوونی (روسێل) قسەکانی سەبارەت بە بیروڕاکانی (لۆک) دەربارەی موڵکیەت ئەوی وەک پاڵەوان بەشێوەیەکی کاپیتالیستیانە راگەیاند: دەیتوانی وابیربکاتەوە ئەو پاڵەوانێتیە هەم بەگوێرەی کاپیتالیستەکان لە کۆمەڵگەدا سەرکەوتووە هەم دەشیتوانی وابیربکاتەوە کە ئەم پاڵەوانێتیە لەبەرامبەر ئەوانەی کە لە ئاستی خوارەوەدان سەرکەوتووە. ئەمە بە تەواوی دەبووە بیرورایەکی راست.

له بەرامبەر ئەمەدا هەروەکوو سارتۆری (Sartori) گوتویەتی تەنانەت لە ڕۆژکاری ئەمرۆشماندا چەندین نوسەر لیبرالیزم لەگەڵا لیبرالیزمی ئابوری تێکەڵا دەکـەن. ئەمە ناهەقیەکی گـەورە یە دەرحـەق بە لیبرالیزم دەکـرێـت. وەک ئـەوەی بیردەکرێتەوە لیبراڵیەتی (لۆک)، بیردۆزی ئابوری (لایسێس فایری Laisses faire ) نیە. بەگوێرەی ئەو بیرکردنەوانە دەوڵەتی حقوقی لیبراڵ بە واتای دەوڵەتی دەستور (یاسای بنەڕەتی) دێت. بەتایبەتی بازرگانی ئازاد لە ئابوری ئازاد دا ئەگەر بەواتای ئەوە نەیەت هەرە بەهێز بژیێنێ ئەوا واتای ئازادی سیاسی دەدا.

له ئەنجامدا هەروەکوو (بـاری Barry) ئاماژەی پێداوە، تێورە ئەخلاقیە سافەکان بوونەتە خاڵی دەستبێکردنی فۆرمۆلاسیۆنی (فۆرمیلەکردنی) (لۆک) سەبارەت بە کۆکردنەوەی موڵکیەت. چونکە وەکوو دوو وڵات بۆ جیاکردنەوەی دەزگاکان یاسا و بنەمای وا کە مافی موڵکیەت دیاریدەکەن، بنەمای ئەو فۆرمۆلاسیۆنە پێکدەهێنن. بەڵام لەوانەیە ئەو تێگەیشتن و چەمکە لە دنیای هاوچەرخدا وانابینرێت کە بتوانرێت زۆر جێ بە جێ بکرێت، چونکە خاک. زەوی ئەوشتەی کە (لۆک) بەشێوەیەکی سەرەکی قسەی دەربارە کردووە ماوەیەکی درێژە جێگای باس نیە بۆ خاوەندارێتی کەسی. هەروەها موڵکیەت هەموو کاتێک بەشێوەی تر دەخولقێندرێت یا دادەهێنرێت و لەو ڕەوشانەدا جۆرێک لە لۆژێکی شوێنکەوتوی (لۆک) جێگەیەکی زۆرباشی دەبێت.

### ٣ - پەیمان و کۆمەڵگەی سیاسی

#### ا -پەیمان

لۆک سەرەتا لە سیستەمی بیرکردنەوە بارودۆخی سروشتی وەک بارودۆخی ئاشتی و هاوکاری بەرامبەر یەک وێناکرد، دوای ئەوە دەبینین مافە سروشتیەکانی بە گوێرەی نمونەی مافی موڵکیەت لە شێوەی ماف کە بەر لە کۆمەڵگە هەبووە پێناسە کردووە. دوای ئەوە (لۆک) کاری لەسەر دروستبونی کۆمەڵگەی شارستانی کردووە بەرەزامەندی ئەندامانی.

هەروەکوو هۆبز Hobbes و ڕۆوسو Rousseau و هەندێک بیرمەندی تر (لۆک)یش هەڵوەستەی لەسەر پەیمانی دامەزرانی کۆمەڵگەی شارستانی کردووە. هەروەکوو لەلای (هۆبز و ڕۆوسو)دا بووە گریمانەی بـارودۆخـی سروشت و «پەیمانی کۆمەڵایەتی» ئەویش دەتوانین تەنها وەکوو خاڵی دەستپێکردن لە دانانی تیۆرە سیاسیەکەی پەسند بکەین. ئەو شتەی ئەو بیرمەندانە ویستویانە نیشانی بدەن دۆزینەوەی وەڵام نیە بۆ پرسیاری «سەرچاوەی دەوڵەت چی یە» بەڵکو گەڕانە بە دوای پرسیاری ئەوەی «ئەو گردکۆیە سیاسیەی پێی دەڵێن دەوڵەت پێویستە بنەماکانی چی بن» (لـۆک) بەم شێوەیە بیانو دەهێنێتەوە لەسەر تێپەربوون لە بارودۆخی سروشتی بۆ کۆمەڵگەی شارستانی. لەگەڵ ئەوەی مرۆڤەکان لە بارودۆخی سروشتدا ئـازاد و یەکسان بوون , دووربوون لە دڵنیایی بەکارهێنانی ئەو مافانەی کە خاوەنی بوون و هەمووکاتێک لەوانەبوو رووبەڕووی هێرشی کەسانی تر ببنەوە. چونکە هەموو بە رادەی ئەو پاشان و هەموو یەکسانن لەگەڵ ئەو. لەبەرئەوە بەکارهێنانی ئەوشتانەی کە خاوەنێتی بەخواستی خۆی تابلێی نەپارێزراو و نادیار بوو. ئەم ڕەوشە سەرەرای ئەوەی ئازادیە بۆ مرۆڤ , بەڵام پڕە لە ترس و کارەسات بۆیە دەستبەردان لە بارودۆخی سروشت دەکاتە پێویستی. بۆیە مرۆڤەکان بە ئامانجی ئـەوەی کە موڵکیەتی خۆیان (گیان و ئازادی و ماڵی خۆیان) بپارێزن، لە دەوڵەتدا یەکیان گرتۆتەوە و بەرێوەبەرایەتیان بۆ خۆیان داناوە.

مرۆڤەکان کاتێک کۆمەڵگەی سیاسیان دروستکردووە لەبەرئەوەی بە پێویستیان بینیوە پەیماننامەیەکیان ئەنجام داوە. ئەم پەیماننامەیە لەنێوان ئەو کەسانەی کە بەشدارن لەو دەوڵەتەدا یاخود لە نێوان ئەو کەسانەی کە دەوڵەتیان دروستکردووە ئەنجام دەدرێت. بۆ ئەمەش زۆرینەی دەنگی مرۆڤی ئازاد بە رادەی پێویست پێویستە. ئیتر لەسەر رووی زەویدا ئەم رەوشە بۆتە سەرەتای حکومەتی یاسایی. بەڵام مرۆڤەکان کاتێک کۆمەڵگەی سیاسیان دروستکردووە ئەو هێزانەشیان دەورکردووە کە پێویستن.

بە بۆچوونی (لۆک) لە بارودۆخی سروشتدا، لەکاتی بچوکترین سەرگەرمیدا ئەگەر ئازادی بخرێتە لایەکەوە ئەوا دوو ئەرکی هەیە: یەکەم: ئەرکی ئەنجام دانی هەر شتێک لەپێناو پاراستنی خۆی و کەسانی تر لەنێو سنوری یاساکانی سروشتدا. دووەم: ئەرکی سزادانی ئەو تاوانانەی لەبەرامبەر یاسای سروشت ئەنجام دراو .

یەکەمین ئەرک بەورادەیەی کە پێویستە بۆ پاراستنی خۆی و کۆمەڵگە وازی لێ دەهێنرێت بۆ ڕیکخستنی بەو یاسایانەی کۆمەڵگە دایناوە .هەرچی دووهەمیانە (ئەرکی سزادان)بەتەواوی وازی لێدەهێنرێت.

لەگەڵ ئەوەی (لۆک) پەیماننامەی کۆمەڵایەتی و ناوەرۆکەکەی بەم شێوەیە باس دەکات، بە ئاشکراش باس لەوە دەکات کە ئەو «رێککەوتنە سەرەتاییە» لەلایەن کۆمەڵگەوە یا لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیەوە ڕێگەی لەبەردەم کراوەتەوە بۆئەوەی بێتە ئاراوە. بیرمەندانی وەکوو (ئاڵتوسیوس Althusius و پوڤەندۆرف puffendorf کە تابلێی بەوردی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لەسەر تیۆری پەیماننامە کردووە ئەوەیان پەسندکردووە کە دووجۆر پەیماننامە هەیە. یەکەم: ئەوەیە کە لەنێوان تاکەکان ئەنجام دراوە و کۆمەڵگەی پێکهێناوە، دووەمیان: ئەو پەیماننامەیە کە لەنێوان کۆمەڵ و بەرێوبەرایەتییدا ئەنجام دراوە. ئەگەر بتوانین بشڵێین (لۆک) ئەم هەڵوێستەی پەسندکردووە. ئەوا لەبەرئەوەی لە رووی شێوەوە بۆ (لۆک) چۆنایەتیەکی خاوەن بەها نیە، بە هێنانەلای یەکتری هەردوو روانگە و بۆچوون رازی بووە. (لۆک) لەمیانی گوتنی لە کۆتایی شۆڕشی سیاسیدا بە روخانی بەرێوەبەرایەتی کۆمەڵگە لە ناو ناچێت و دەمێنێت ئەوە دەخاتە روو و هەڵدەسەنگێنێ کە کۆمەڵگە و بەرێوەبەرایەتی هەمان پەیماننامە پەیوەستیان ناکات.

## ب - کۆمەڵگەی سیاسی و ئامانجی بەرێوەبەرایەتی

سەرەڕای ئەوەی لە بارودۆخی سروشتدا مرۆڤەکان ئازادن بەڵام سیستەمێکیان دەوێت کە بتوانێت ئەوە قەبوڵ بکات کە ئازادی بەواتایە و لە میانی ئاراستە کردنی دادوەری موڵکیەت پارێزراو دەبێت.

بە بۆچوونی (لۆک) لەبەرئەوە مرۆڤەکان کۆمەڵگەی سیاسیان دامەزراندووە، بەڵام ناچاریەکانی یاسای سروشتی لە بارودۆخی کۆمەڵگەدا کۆتایی پێ نایەت. چونکە ئامانجی یاسا فراوانکردنی ئازادی و پاراستنێتی نەک ڕێگرتن لە پیادەکردن و لە کارخستنی. لۆک بەم شێوەیە پەرەی بە لۆژیک «منطق» داوە لە سروشتی پەیماننامەدا هەروەکوو لە لۆژیک «منطق»ی مرۆڤدا دەستنیشانی کرد نابێ دامودەزگای سیاسی بدرێتە تاکە هێزێک بەڵکوو دەبێت بدرێتە کۆمەڵگە کە کارایی و زیندویی دەوڵەت دیاری دەکات.

ئۆرگانی دادگە و یاسا کە بەهاوبەشی هێنراوەتە کایەوە دەسەڵاتی سزادانی تاوانی هەیە، بۆ بەسەرکردنەوە لەپێناو یەکلایی کردنەوەی ئەو لە یەکتر تێنەگەیشتنەی کە لەنێوان مرۆڤەکاندا

دروست دەبێت لە کۆمەڵگەی سیاسی , وە ئەمەش جیاوازی هەرە گرنگە لەنێوان بارودۆخی سروشت و کۆمەڵگەی شارستانی یاخود کۆمەڵگەی سیاسی. ئەوانەی کە شوێنی بەسەرکردنەوەی هاوبەشیان نیە تا ئێستا لە بارودۆخی سروشتیدان.
لەبەرئەوە بۆئەوەی بتوانین باس لە کۆمەڵگەیەکی سیاسی یا کۆمەڵگەیەکی شارستانی بکەین، پێویستە کۆمەڵێک مرۆڤ بە تەواوی دەست لە هێزی بەڕێوەبردنی یاسای سروشت بەردەن و ئەمە بە کۆمەڵا ببەخشن و لەنێو کۆمەڵگەیەکدا یەکبگرن. ئەمەش بە دامەزراندنی کۆمەڵگە لەلایەن گووپێک مرۆڤ یاخود بە چوونەپاڵی هەر کەسێک بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکی دروستکراو و یەکگرتنی لە گەلیدا ئەنجامگیر دەبێت.
(لۆک) کە کۆمەڵگەی سیاسی یاخود کۆمەڵگەی شارستانی وەک ئەوە پێناسە کرد کە دەبێت شوێنی بەسەرکردنەوەی هاوبەشی مرۆڤەکان بێت، بەم پێیە گوزارشت لەوە دەکات کە دەسەڵات پادشاهی رەها «قرالیتی» بەراستی لەگەڵ کۆمەڵگەی شارستانی ناگونجێت، چونکە لە حوکمی پاشایەتیدا شوێنێکی نیە بۆ هیچ کەسێک بۆ بەسەرکردنەوە. هیچ دادوەرێک نابینرێت کە لایەنگری نەکات و بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵا حەق بڕیاربدات.
بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەمانە دەتوانین بڵێین، یاخی بوون لەو باوەڕەی کە پێی وایە کە مافی بەڕێوەبردنی هەڵەی پادشاکان پیرۆزە و، سووربوونی بەڕێوەبەرایەتی لەسەر ئەو کاراکتەرەی کە پشت بە متمانە دەبەستێت، هەستیاری گشتی (لۆک) بووە.
لەبەرئەمەیە (لۆک) مافی بەڕێوەبردنی بەڕێوبەرایەتی وەکوو پەیوەست بوون بە یەکێتی دەنگ و لایەنی



باشی مرۆڤەکان وەکوو پاداشتێک بەناو دەکات بۆ متمانەی مرۆڤەکان.
چونکە بە بۆچوونی (لـۆک) ئامانجی سەرەکی مرۆڤەکان لەوەی کە لەگەڵ دەوڵەتەکان یەکبگرن و خۆیان بخەنە ژێر سایەی بەڕێوەبەرایەتیەوە ئەوەیە کە موڵکیەتەکەیان (گیان و ئازادی و ماڵ)ی خۆیان بپارێزن. کەوایە ئەوەی لە بارودۆخی سروشتیدا فەراهەمی دەکات زۆر شتی کەمە. ئەوانە: یاسایەکی باشی پێناسەکراو، دادوەری وا کە ئەو یاسایە بەبێ لایەنی جێ بە جێ دەکات هێزێکن.
کۆمەڵگەی سیاسی بەهۆی نەبوونی ئەمانەوە دامەزراوە کاتێک هیچ ئاقڵمەندێک بیر لە ویستی گۆڕینی ئەو هەلومەرجەی کە تیایدا بەڕێوەبەرایەتی خولقاوە بەرەو خراپتر ناکاتەوە و بەڕێوەبەرایەتی ئەوە پەسند ناکات کە لە چاکەی گشتی زیاتر گۆڕەپانێکی تری کاریگەر بوونی دەبێت. بۆیە پێویستە بەڕێوەبەرایەتی لە بەرامبەر ئەم چەوتیانە موڵکیەتی هەموو کەسێک بپارێزێت. لەبەرئەوە دەوڵـەت کە هێزی هەرە باڵا هێزی یاسا دانانی گرتۆتە دەست پێویستە لە میانی ئەو یاسایانەی کە پیادە دەکرێت و لە یەکتر تێنەگەیشتنەکانی خەڵک بە بریار پەیوەست دەکات، لە ڕێگەی دادوەری بێ لایەن و دروست، درێژە بە بەڕێوەبەرایەتی بدات. بەڕێوەبەرایەتی ناچارە ئەو یاسایانە پەیڕەو بکات بۆ ئەوەی هێزی کۆمەڵ لە نێوخۆدا بەکاربهێنێت بۆ پاراستنی ئاسایشی خەڵک و کۆمەڵگە لە بەرامبەر ئەو زیانانەی یاخود لەو مەترسیانەی کە لە دەرەوە دێن. پێویستە ئامانج لەمانە جگە لە ئاشتی و ئاسایش و چاکەی گشتی شتێکی ترنەبێت.
لێرەدا سـەرەڕای ئـەوەی دوای ئـەوە عونسوری (چاکەی گشتی) لەلایەن بیرمەندانی لیبرالیەوە بەتوندی ڕەخنەکرا، (دەوڵەتی بچوکترین) و یاخود (دەوڵەتی پاسەوانی شەو) کە لیبرالیزمی کلاسیکی پشتگیری لێ کرد لەمیانی پاراستنی نێوخۆیی و دەرەکی، چالاکیەکانی دادگەی گرتە ئەستۆ و تابلۆی شوێن پێی دیار بووە.

### ج - جیاکردنەوەی هێزەکان لە بەڕێوەبەرایەتیدا.

لە تیۆرەکەی (لـۆک) لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی سیاسی ئەنجامی پەیماننامەیەکی هێزی سیاسیە بەڕێوەبەرایەتیەکانیش دەبنە خاوەنی ڕەزامەندی. لەبەرئەوەی ئەم هێزە سیاسیە بە ئامانجی پاراستنی مافی موڵکایەتی دامەزراوە، بیر لەوە ناکاتەوە ئەمە لە ناوبەرێت یا لە ئارادا نەیهێڵێت. پێچەوانەی ئەمە شەرعیەتی دەسەڵاتی سیاسی لە ئارادا نامێنێ و مافی بەرخودانی خەڵک لە دایک دەبێت. بەڵام پشت بەستنی دەسەڵاتی سیاسی تەنها بە ڕەزامەندی بەس نیە بۆ ئەوەی بتوانێت دەسـەڵات کۆنترۆڵ بکات. بۆیە پێویستە بە شێوەیەکی بەرجەستەتر دەسـەڵات سنوردار بکرێت و ڕێگەی ئەمەش بە جیاکردنەوەی هێزەکاندا تێدەپەڕێت.
بە بۆچوونی (لـۆک) لە دەوڵەتێکدا سێ هێز دەبینرێت. ئەمانە هێزی یـاسـادانـان و هێزی بەڕێوەبردن و هێزی فیدراڵیەکانن.
هێزی یاسادانان گردکۆی هێزی دەوڵەتە وە بۆ ئەوەی ئەو گردکۆیە ئەندامانی خۆی بپارێزێت، خاوەنی مافی ڕاگەیاندنی چۆنێتی بەکارهێنانە. لە بەرامبەر حاڵەتێکی وەها کە ئەوانەی هێزی یاسادانانیان لە دەستدایە وە هەوڵی خستنە دەستی هێزی بەڕێوەبردنیش دەدەن، لە دەوڵەتێکدا کە بەباشی ڕێکخرابێت هێزی یاسادانان دوای ئەوەی یاساکانی

دانا پێویستە بیداتە دەست ئەوکەسانەی کە خۆیان بەو یاسایانە پەیوەست کردووە و چاکەی گشتی لەبەرچاو دەگرن. ئەو یاسایانەی بەمشێوەیە دانراون بۆئەوەی بە بەردەوامی هێزێک بگەیەنێ و بەبێ وچان پیادەبکرێت , ناچاریە کە هێزی بەڕێوەبردن بوونی هەبێت. بەمشێوەیە هێزی یاسادانان و هێزی بەڕێوەبردن لەیەکتر جیادەبنەوە.

هەرچی ئەو هێزی فیدراڵیانەشە، هەموو کۆمەڵگەیەک لە روانگەی کەسان و وڵاتانی دەرەوەی خۆی دامەزراوەیەکە وەک ئەوەی لە بارودۆخی سروشتیدا هەیە. بۆیە دەتوانرێت وەکوو هێزێک و وەکوو دەوڵەت گوزارشتی لێ بکرێت کە کارێکی لەشێوەی شەڕ و ئاشتی و یەکێتی و رێککەوتن لەگەڵ هەموو کۆمەڵ و کەسێکی دەرەوەی دەوڵەت ئەنجام دەدات.

لەگەڵ ئەوەی (لۆک) هێزی فیدراڵی و هێزی بەڕێوەبردنی بە جیا جیا بەناو کردووە و شیکردۆتەوە، بەڵام هەڵوەستەیەکی وا دەخاتە روو کە زەحمەت دەبێت ئەم هێزانە لە دەستی جیاواز دابن و پێویستە بەم شێوەیەش نەبێت. هێزی بەڕێوەبردن پەیوەستە بە یاسادانان و ئەوانەی ئەو هێزەش بەکاردەهێنن بەرپرسیارن بەرامبەر بە یاسادانان. کاتێک پێویست بکات یاسادانان ئەو دەسەڵاتە وەردەگرێتەوە کە داویەتی بە بەڕێوەبردن , ئەگەر دەسەڵاتی بەشێوەیەکی خراپ بەکارهێنابێت ئەوا سزای دەدات. یاسادانان هێزی باڵای دەوڵەتە. هەرچی هێزی فیدراڵیە پەیوەستە بە هێزی بەڕێوەبردن و یاسادانان و لە ژێر فەرمانی ئەواندا ئەرک رادەپەڕێنێ.

جیاکردنەوەی هێزەکان لەلای لۆکە واتا جیاکردنەوەی هێزی یاسادانان و بەڕێوەبردن لە پێناو ئەو ئامانجەیە کە هەردوو هێز ئەو ئەرکانەی کە دەکەوێتە سەرشانیان بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ یاسا و مافی تاک رایبپەڕێنن.

## ٤ - هێزی یاسادانان

### ا - سەرچاوەی یاسادانان

لە سەرەوە ئەوەمان دەستنیشان کرد کە هێزی یاسادانان لەلای (لۆک) وا پێناسەکراوە کە هێزێکە مافی راگەیاندنی چۆنێتی بەکارهێنانی گردکۆی هێزی دەوڵەتی هەیە لە پێناو پاراستنی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە. ئەو هێزەی یاسادانان سەرچاوەی چیە و چۆن دێتە ئاراوە؟

بە بۆچوونی (جۆن لۆک) دەوڵەت هێزێکی سزادانی ئەوانەیە کە لە دەرەوە زیانیان بە هەریەکێک لەئەندامانی کۆمەڵگە گەیاندووە. ئەمە لە هەمان کاتدا هێزی ئاشتی و شەڕە، هەروەها دەوڵەت لەبابەتی سەرلێشێوان و گومرابوندا سەبارەت بەوەی کە کام سزای گونجاو دەدات لە بەرامبەر ئەو تاوانە جۆراوجۆرانەی کە لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگە ئەنجام دراون , بە هێزێکەوە دێتە مەیدان. ئیدی ئەو هێزە هێزی یاسادانانە هاتنە ئارای هێزی یاسادانان بۆئەوەیە تابتوانێت هەموو موڵکیەتی ئەندامانی کۆمەڵ بپارێزێت. بەڵام ئەوەی پێویستە لەبیرنەکرێت ئەوەیە کە هەرکەسێک چوبێتە نێو کۆمەڵگەی شارستانی و ئەندامی هەر دەوڵەتێک بوبێت ئەوا دەستبەرداری هێزی سزادانی ئەو تاوانانە بووە کە لە بەرامبەر یاسای سروشت ئەنجام دراون، بۆیە دەسەڵاتی دادگەیی کردنی تاوانی داوەتە ئۆرگانی یاسادانان. ئۆرگانی یاسادانان لەلایەن خودی کۆمەڵگە یا نوێنەرەکانی کۆمەڵگە پێکهێنراون , ئەمە واتای ئەوەیە کە دادگەی دەوڵەت لە بنەڕەتدا دەبێت دادگەی خۆی بێت. لەبەرئەوە سەبارەت بە بەکارهێنانی هێزی خۆی مافی بە دەوڵەت داوە کە ئەوکاتەی خۆی دەیخوازێت بەکاری بهێنێت. ئیتر سەرچاوەی هێزی یاسادانان و (لەهەمان کاتدا هێزی

بەڕێوەبردن) لێرەوە دێت. مرۆڤەکان کە کۆمەڵگەی سیاسیان دامەزراندووە دەیانەوێت لە نێو ئاشتی و ئاسایشدا چێژ لە موڵکەکانیان وەرگرن. بۆئەمەش پێویست بە ئامرازی هەرە گەورە هەیە کە بتوانێت دروستکردنی یاسا لە کۆمەڵگەدا فەراهەم بکات. ئیدی ئەمە دامەزراندنی هێزی یاسادانانە کە لە هەمان کاتدا دەبێتە یاسای پۆزەتیفی بنچینەیی هەموو دەوڵەتەکان. ئەمە وەکوو بنچینە و یەکەمین یاسای سروشتی وایە کە یاسادانانیش ئاراستە دەکات بۆ پاراستنی چاکەی گشتی و کۆمەڵگە و هەموو تاکێک لە کۆمەڵگەدا.

(لۆک) سەرچاوەی دەسەڵاتی یاسادانان و هێزی بەڕێوەبردن دەگەڕێنێتە بۆ خەڵک. واتە (لۆک) شێوەی لە دایک بوونی بەڕێوەبەرێوەتیەکی شەرعی بە لەدایک بوونی کۆمەڵگەی سیاسیەوە گرێدەدات کەپشت بە ویست و ئیرادەی مرۆڤە ئازادەکان دەبەستێت.

**ب - سنوور و چوارچێوەی چۆنایەتی یاسادانان.**

مێژووی لیبرالیزم کە هەمان مێژووی لایەنگریە بۆ یاسای بنەڕەتی , لایەنی کەم لەدوای (لۆک) وەکوو مێژووی تێکۆشان لە دژی چەمکی دەوڵەتی رەها لەقەڵەم دەدرێت هەرچی ئەو رەوشەیە کە لە ریشەی ئەو گوزارشتانەدا خەوتووە، بۆچوونەکانی (لۆک)ن سەبارەت بەهێزی دانان.

بە بۆچوونی (لـۆک) هێزی یاسادانان تەنها هێزی باڵای دەوڵەت نیە. لە هەمان کاتدا خاوەنی شوێنێکی پیرۆز و نەگۆڕە لە دەستی گردکۆکان (کۆمەڵگە) هێزی یاسادانان سەر بەو دەسەڵاتەیە کە لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵگەدا دامەزرێنەران بە رەزامەندی کۆمەڵگە پێکیان هێناوە. جگەلەمە سەر بە هیچ کەس و هێزێکی تر نیە. دەسەڵاتی شەرعی ئەو ئۆرگانەیە کە لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵگە دا دەسەڵاتی بەکارهێنانی ئەو هێزەی پێدراوە. کاتێک مرۆڤەکان بە مەراسیمێکەوە بە کۆمەڵگەوە گرێدراون مرۆڤەکان چونەتە ژێر باری قەرزی گوێڕایەڵی لە بەرامبەر گومەڵگەدا. تەنها ئەو هێزە باڵایەی کە لە دامەزراندنی کۆمەڵگەدا بڕیاری لەسەر دراوە و لەلایەن یاسا راگەیانراوەکانەوە دەتوانێت ناچاری جێ بە جێ کردنی ئەمەی بکات. نە هیچ هێزێکی بیانی و نەهیچ هێزێکی لاوەکی کۆمەڵگە ناتوانێ هیچ یەک لە ئەندامانی کۆمەڵگە لە گوێڕایەڵی ئەو یاسادانانە دابڕێت کە بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئاسایشی ئەندامانی دامەزرێنراوە. ڕەوشی کەسێک بەهەند وەرناگیرێت کە پەیوەستی هێزێکە کە لە کۆمەڵگەدا باڵا نیە. هێزی یاسادانان کە هێزی باڵایە لەهەر کۆمەڵگەیەکدا دەتوانرێت بە شێوەیەکی کاتی



یا بەردەوام بدرێتە کەسێک یا زیاتر لە کەسێک.
(لۆکە) کە هێزی یاسادانان بەم شێوەیە بەناو دەکات و لێکدەداتەوە لەبەرهەمێکی بە ناوی (نامەیەک سەبارەت بە لێبوردەیی) بەم شێوەیە باس لەوە دەکات کە یاسادانان هێزێکی سنوردارە: سەرەڕای ئەوەی مرۆڤەکان بە ئامانجی پاراستنی ماڵی خۆیان چونەتە نێو کۆمەڵگایەک کە هـاوکـاری کردنی یەکتری فەراهەم کردووە، لەوانەیە بەهۆی فروفێڵی هاوڵاتیانی خۆی یاخود توندوتیژی دوژمنکارانەی بیانیەوە، ئەمانە لە دەسـت بـدات. چارەسەری بەربەستکردنی ئەمانە کۆمەڵگەیەکی هاووڵاتی وریا و زەنگینی و چەکە (لەبەرامبەر هێزەکانی دەرەوە) و (لەبەرامبەر مەترسیەکانی ناوخۆش) یاسایە. بەرپرسیارێتی هەموو ئەمانە لەلایەن کۆمەڵگە دراوە بە بەرێوەبەرایەتی سڤیل. ئەمە بنچینەیە و مافی بەکارهێنانە، لە هەر دەوڵەتێکدا هێزی هەرە باڵا کە دانەری یاسایە سنورەکانی هێز پێکدێنن.
(لۆکە) بەوە ناوەستێت کە بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا و یەکلاکەرەوەی باس لەوە بکات کە هێزی یاسادانان دەسەڵاتێکی بێ سنور نیە، بەڵکو لەبەرامبەر کەیفیەتی یاسادانان چوار سنور بەندی بە ئاشکرا دیاری دەکات.

یەکەم: یاسادانان بە ئارەزووی خۆی مامەڵە لەگەڵ ماڵ و ژیانی خەڵک ناکات. لە بارودۆخی سروشتدا هیچ کەسێک خاوەنی هێزێکی ئیختیاری نیە لەسەر ماڵ و ئازادی و گیانی کەسانی تر. بۆیە ئەوە جێگای باس نیە کە هێزێکی وەها ئیختیاری کە هیچ کەسێک خاوەنی نیە بدرێتە دانەرانی یاسا کاتێک گواستنەوە بۆ کۆمەڵگەی سیاسی روو دەدات. لەبەرئەوە کاتێک مرۆڤەکان کۆمەڵگەی سیاسی دادەمەزرێنن ئەو ماف و دەسەڵاتەی کە هێزی یاسادانان هەیەتی سنوردارە. هەرچی سنوری هەرە گەورەشە چاکەی گشتییە. بەگوێرەی ئەوەی کە ئەرکی یاسادانان پاراستنی گیان و موڵک و ئازادیەکانی مرۆڤەکانە، ئەو یاسادانانەی کە بەو ئامانجە دامەزرێنراون مەحاڵە خاوەنی مافی بە کۆیلەکردن و نەدارکردنی کەسەکان بێت. زەحمەتیەکانی یاسای سروشت لە حاڵەتی کۆمەڵگەییدا تەواو نابێت و کۆتایی پێ نایەت. یاسای سروشت بنەمای مانەوەی مرۆڤەکانە لە سەرپێیان بە بەردەوامی لەپێش هەمووشتێک بەگوێرەی ئەوەی کە بنەمای یاسای سروشت ئەوەیە کە مرۆڤەکان بپارێزێت، دانەری یاسا لە رەوشێکدایە کە بنەما و یاسای گونجاو بە یاسای سروشت دابنێت.
دووەم: یاسادانان یەکسەر هێز بەکارناهێنێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەی کە بە ئارەزو دراوە. یاسادانان بە دابەشکردنی دادپـەروەری سنوردارە لە رێگەی ئەو دادوەرانەی کە بە یاسا دەسەڵاتیان پێدراوە و مافەکان لە ژێر فەرمان پیادە دەکرێن. بەهۆی ئارەزوەکانی مرۆڤەوە دەتوانرێت یاسای سروشت بە هەڵە بەکاربهێنرێت. وە لەو شوێنەی کە دادگـە دانـەمـەزراوە شتێکی ئاسان نیە کە بتوانرێت سەبارەت بە هەلەکانی قەناعەت بە مرۆڤ بهێنرێت. هیچ وتوێژ و پێکهێنەرێکی هێزی یاسادانان بەتایبەتی دادوەر لە هیچ شوێنێکدا بە شێوازی سنوردارکردنی ماف و موڵکیەت کە پەیوەستن بە ژیانی مرۆڤەکانەوە خزمەت ناکات. ئەگەر وایە ئەوا ئامانجی بنەڕەتی خزمەتکردنە. کاتێک مرۆڤەکان لە بارودۆخی سروشتیەوە پەڕیونەتەوە بۆ کۆمەڵگە لە پێناو پاراستنی موڵکیەت و ئاسودەیی خۆی ئاشتی بە پێویستی زانیوە و بیرکردنەوە بە هەمان ئەو هەستەی کە خۆی خۆی بەرێوە دەبات هێزی یاسادانانی لە کۆمەڵگەدا داناوە.
سێهەم: یاسادانان بەبێ مۆڵەتی مرۆڤەکان هیچ پارچەیەک لە موڵکی ئەوان نابات , مرۆڤەکان کاتێک

چونەتە نێو کۆمەڵ پاراستنی موڵکەکانی خۆیان کردۆتە ئامانج و ئامانجی بەڕێوەبەرایەتیش ئەمەیە. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا خەرجی بەڕێوەبەرایەتی هەیە، بۆئەوەی ئەم خەرجیانە دابین بکات لەسەر مرۆڤەکان پێویستە وەک بەرامبەرێک بۆ پاراستنی موڵکەکانی بەشێک لە سەروەت و سامانی خۆیان بدەن بە بەرێوەبەرایەتی. ئەگەر ئەوە نەبێت ئەوا بەرێوەبەرایەتیەکان لەسەر پێ نامێنن. بەڵام ئەمە بە رەزامەندی مۆڵەتی خۆی یاخود مۆڵەتی ئەو نوێنەرانەی کە هەڵی بـژاردون ئەنجام دەدەرێت. ئەگەر روخسەتی مرۆڤەکان نەبێت، هیچ کەسێک بە زۆر باج لە خەڵک وەرناگرێت. بە پێچەوانەی ئەمە دەبێتە هێرش لەسەر یاسای بنچینەیی موڵکیەت.

چـوارەم: یاسادانان هێزی دارشتنی یاسا دەوری کەسێکی تر ناکات. چونکە تەنها خەڵک خاوەنی مافی دیاریکردنی بەکارهێنەرانی هێزی یاسادانانی هەیە.

ئەمانەن سنوری یاسادانان لە هەموو شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتی لە هەر دەوڵەتێکدا. ئەمە یاسای سروشت و خـوداوەنـدە خـراوەتـە نێو کۆمەڵگە. مرۆڤەکان بەبێ ئەوەی جیاوازی لەنێوانیاندا بکرێت لەلایەن یاسای پیادەکراوەوە بەرێوەدەبرێن. پێویستە ئامانجی ئەو یاسایانە چاکەی خەڵک بێت. وەرگرتنی باج پێویستە بە مۆڵەتی راستەوخۆی خەڵک بێت. وەرگرتنی باج پەیوەستە بە مۆڵەتی راستەوخۆی خەڵک یا نوێنەرەکانیان. یاسادانان هێزی دارشتنی یاسا دەوری یەکێکی تر ناکات دەسەڵاتی دیاریکردنی ئەو هێزە لە دەستی خەڵکدایە.

(لۆک) بەم شێوەیە باس لە هێزی یاسادانان دەکات و پێی وایە کە دانانی یاسا هێزێکی بێ سنور نیە، بە پێچەوانەوە دەسەڵاتی یاسادانان دەسەڵاتێکە کە بەشێوازێکی دیاری کراو دەجوڵێتەوە و کاردەکات.

ئـەوانـەی دەسـەڵاتـی یاسادانانیان لە دەستدایە پێویستە تەنها بنەما و یاسا گشتیەکان ساز بکەن. ئـەو بـۆچـوون و پشتگیریەی (لـۆک) بەتایبەت لەبەرئەوەیە کە پەرلەمان لە کاتی شەڕی نێوخۆی ئینگلیزدا دەسەڵاتی خۆی بە خراپ بەکارهێنا. ئەم هەڵویستەی پەرلەمان بوەهۆی لەدایکبونی چەمکی سنوردار کردنی ئەنجومەنی یاسادانانیش کە دۆکترینی پاشا کۆنەکان بوو تا سەدەی هەژدەهەم. هەرچی ناودارترین گوزارشتی ئەم بۆچوونەیە (لۆک) لە میانی گوزارشتەکانی سەرەوەی باسی لێوەکردووە. بە بۆچوونی ئەو هێزی یاسادانان دەسەڵاتێک دەبێت کە بەشێوەیەکی دیاریکراو دەجولێتەوە، لە رەوشی دیاریکراودا ئەگۆرێت و پێویستە لەمیانی یاسای جێگیری راگەیەنراودا کار بەرێوە ببرێت.

## ج - شێوەکانی بەرێوەبەرایەتی - پەیوەندی یاسادانان.

بە بۆچوونی (لۆک) ئەوشتەی کە لەسەرەتادا لەسەر مرۆڤەکان یەکی گرتووە لەکۆمەڵگەدا ئەوەیە کە کۆمەڵگە بۆتە خاوەنی زۆرینەی هەموو هێزەکان. کاتێک لەپێناو کۆمەڵگە یاساکان پێکهێنراوە ئەو یاسایانە لەلایەن ئەو فەرمانبەرانە دانراون و لەتوانایاندا هەیە ئەو هێزە بەتەواوی بەکاربهێنن، بەرێوەدەبرێت. ئەم شێوەی بەرێوەبەرایەتی بەتەواوی دیموکراسیە. ئەگەر هێزی یاسادانان بە دەستی میراتگر یا کەسانی دوای ئەوانەوە بێت ئەوا ئەمە ئۆلیگارشیە، یا ئەگەر لە دەستی کەسێک بهێڵرێتەوە ئەوا مۆنارشیە، ئەگەر لە دەستی ئەو میراتگرەکانی بێت ئەوا مۆنارشیەکی میراتیە: ئەگەر بە مەرجی تا هەتایی بێت و دوای مردن هێزی جێنشین کردن بۆ خەڵک بگەرێتەوە ئەوا مۆنارشیەکی لەمیانی هەڵبژاردن جێگای باسە.

کاتێک مرۆڤەکان بیریان لە باشترکردنی کردەوە کۆمەڵگە دەتوانێت دەستکاری شێوەی بەڕێوەبەرایەتی بکات و شێوە بەڕێوەبەرایەتیەکی تێکەڵە لە میانی یەکخستن دیاربیکات.
ئەگەر هێزی یاسادانان لەلایەن زۆرینەوە بە درێژایی ژیانیان یا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە کەسێک یا چەند کەسێک درا، ئەوا دوای ئەوە هێزی باڵا دووبارە بۆ مرۆڤەکان دەگەڕێتەوە. کاتێک بەم شێوەیە دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا کۆمەڵگە ویستی دەتوانێت لە نوێوە ئەو هێزە بداتەوە و بەم شێوەیە دەتوانرێ شێوەیەکی نوێی بەڕێوەبەرایەتی دابمەزرێنرێت. لەمە بەدواوە شێوەی بەڕێوەبەرایەتی بە ئەرک پێ سپاردنی هێزی یاسادانانە وە پەیوەست دەکرێت. مەحاڵە هێزێکی پلە دوو ئەمە دابڕێژێت. لە دەسەڵاتی فەرماندانی داڕێژەری یاسای باڵا زیاتر هیچ دەسەڵاتێکی تری فەرماندان نیە. لەبەرئەمە ئەو هێزەی شێوەی دەوڵەت بەم شێوەیە دیاری دەکات هێزی داڕێژەر و بونیاتنەری یاسایە.
بەم شێوەیە (لۆک) کاتێک شێوەی بەڕێوەبەرایەتی دیاریدەکات وەکوو پێوەر هەڵوەستە لەسەر ئەو کەس یا ئەو کەسانە دەکات کە هێزی یاسادانان بەکار دەهێنن. بەم شێوەیە تاکەکان کە کۆمەڵگەی سیاسیان پێکهێناوە و یا خۆیان یا نوێنەرەکانیان و هێزی یاسادانانیان پێکهێناوە، لە ناوەندی سیستەمێکی سیاسی وەهادا بنەماکانی شەرعیەتی مۆنارشیەتی رەها ڕەتدەکرێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بنەما و یاسای زۆرینە لە میکانیزمی بەڕێوبەرایەتی دیموکراتیانە ڕەخنەکراوە. بە بۆچوونی (روسێل) کۆمەڵگەی شارستانی لەلای لۆک پێویستی بە ڕێزێکی گەورەتر نەبووە، لەم بابەتەدا نەسازاین، نزیکایەتی ئەو سەبارەت بەوەی کە بنەما و یاسای زۆرینە راستە لە رووکاردا دیموکراسیانەیە، چونکە (لۆک) ژنان و نەدارانی لە دەرەوەی مافی هاووڵاتێتی هێشتۆتەوە. سەرەڕای ئەمانە پێشبینی کردنی هێزی یاسادانان و بەڕێوبەرایەتی بە پشت بەستن بە رەزامەندی هاووڵاتیان لە هەموو روویەکدا دیموکراتیە و بۆئەوەی مافی هاووڵاتێتی سنوردار نەمێنێ هێشتا زووە.



**٥ - مافی شۆڕش و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوبەرایەتی.**

(لۆک) ئەو پێوەرانەشی خستۆتەروو کە هەلومەرجی شەرعیەتی بوونی بەڕێوبەرایەتیەکان دیاری دەکات، لەکاتی ئەنجام دانی ئەمە هێزی یاسادانان لە ناوەندی پێوەرەکان دادەنێت. لێرەدا لۆک باس لە دوو بەڕێوبەرایەتی نا شەرعی دەکات. دەستگرتن بەسەردەسەڵات واتە پاوان کردنی دەسەڵات و ستەم کاری.

**ا - پاوانکردنی دەسەڵات.**

(لـۆک) وەکــوو ڕەوشـــی سیستەم و ئاشتی هەڵوەستەی لەسەر ژیانی سروشتی کـردووە. وە لە میانی سنوردارکردنی دەستەواژەی پەیماننامەی کۆمەڵایەتی لە خزمەتی ئـازادی واتایەکی بەمە داوە. بۆ ئەوەی کۆمەڵگە دابمەزرێت پێویست بە ڕێککەوتنی مرۆڤە ئازادەکان دەکات کە بتوانن لەژێر ناوی زۆرینە قسەبکەن و بەڕێوبەراتیەکی شەرعی جێگیربکرێت، هیچ سەرچاوەیەکی تر جگە لەمە بۆ بەڕێوبەرایەتیەکی شەرعی نابێت.

ئەمە شێوەی بەڕێوبەرایەتی شەرعی نیە کە دەسەڵاتی ڕەها «مطلق»ی هەبێت بە پشت بەستن بـەو هێزەی لە دەستەڵاتی باوکی وەریدەگرێت وڵاتێکی لە میانی بەکارهێنانی هێزەوە خستبێتە دەست خۆی.

بە بۆچوونی (لۆک) فەتح داگیرکاری بیانیەکانە. داگیرکردنیش یا دەسـت بەسەراگرتنیش جۆرە فەتحێکی لۆکاڵیە و دەستبەسەراگرتن هیچ کاتێک ڕەوا نابێت و ڕەوانیە. دەستبەسەراگرتن و داگیرکردن بریتیە لەوەی کە شتێک مافی کەسێکی ترە و دەیخەیتە بن دەستی خۆت. واتە موڵکەکەی لێ زەوت دەکەیت. لە هەموو بەڕێوبەرایەتیەکاندا ئەرک پێدانی ئەو کەسانەی کە خاوەنی دەسەڵاتی فەرماندانن شێوەی بەڕێوبەرایەتی درێژکراوەیەکی ناچاریانە یا سروشتیانەیە کە بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ یاسا سەرچاوەی دامەزراندنیان لە خەڵکەوە وەرگـرتـووە. بۆیە هەموو دەوڵەتێک کە وەکـوو شێوەیەکی بەڕێوبەرایەتی دامەزراوە بۆ ئەرک سپاردن بەوانەی بەشیان دەبێت لە دەسەڵاتی گشتیدا , بنەما و یاسایان داناوە. وە ڕێگای سپاردنی ئەو مافەیان بەوانە دیاریکردووە و چەسپاندووە. لەگەڵ ئەوەی کە شێوەی دەوڵەت نەگۆڕاوە ئەوانەی لە ڕێگەیەک لە دەرەوەی ئەمە هاتوون لەبەرئەوەی ئەو کەسە نیە کە یاسا دایمەزراندووە و خەڵک ڕەزامەندی لەسەر نیشانداوە، ئەوا مافی ئـەوەی نیە کە گوێی لێ بگیردرێت.

**ب - ستەم.**

دەستبەسەراگرتن و زەوتـکـردن بریتیە لـەوەی دەسەڵاتێک کە مافی یەکێکی تر بەکاربهێنرێت. ستەمیش بریتی یـە لــەوەی کـە بەشێوەیەک دەسەڵاتێک بەکاربهێنرێت کە جگە لە خەڵک مافی کەسێکی تر نەبێت بەکاری بهێنێت. لێرەدا ئەو هێزەی لەدەست کەسێکدایە بۆ چاکەی ئەوان یا چاکەی گشتی بەکارناهێنرێت بەڵکوو بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاری دەهێنێت. ئەگەر ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی پێدراوە خواستی خۆی زاڵا بکات نەک یاسا , دەسەڵات و فەرمانەکانی بۆ پاراستنی ماڵی خەڵک نەبێت و هەوڵی تێرکردنی ئارەزوو خواست و زەوقەکانی خۆی بدات ئەوا دەبێتە ستەم.

لەو شوێنەی کە یاسا کۆتایی پێ دێت ستەم دەست پێدەکات. هەر کەسێک ئەو دەسەڵاتە تێپەڕێنێ کە یاسا پێیداوە و ئەرکی باڵادەستی لە شوێنێکدا بەکار بهێنێت کە یاسا مۆڵەتی پێنەداوە ئەوا لەو

ڕەوشەدا نامێنێ کە خاوەنی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن بێت. واتە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی نامێنێ. لێرەدا کاتێک جوڵانەوە بەبێ دەسەڵات ببێتە جیگای باس ئەوا وەکوو هەرکەسێک دەتوانێت لە دژی خۆی جێگری بکات یا لە دژی خۆی بەکاری بهێنێت. ئەمە هەروەکوو ئەوەی بۆ فەرمانبەرێکی باڵا دەتوانرێت ببێت بە هەمان شێوە بۆ پادشایەک بەم شێوەیە بە سنگ فراوانی ناچێتە سەر، بەتایبەتی متمانەیەکی زۆر گەورەتر بە پادشا بەخشراوە، لە ڕەوشێکدایە کە بەهۆی ئەو دەرفەتانەی هەیەتی دەبێت پێوەرەکانی هەق و ناهەقی باشتر بزانێت.

لێرەدا رووبەڕووی پرسیاری (ئایا دەتوانرێت) لە دژی فەرمانەکانی میر هەڵوێست وەربگیردرێت؟ دەبینەوە. پێویستە ئەمە پێوەرێکی هەبێت، بە پێچەوانەوە پێوەندیەکانی کۆمەڵگەی سیاسی لە جێگەی خۆیان نامێنن و لە شوێنی سیستەم جگە لە ئەنارشیەت و تێکەڵی و پێکەڵی شتێکی تر نامێنێتەوە. ئەگەر وابێت پێویستە لە گوشار زیاتر، شتێکی تر لە دژی هێزی بەرامبەر بەکار نەهێنرێت کە ناکۆک بێت لەگەڵ یاسا و دادپەروەری.

(لۆک) گەیشتۆتە ئەنجامێک کە کۆمەڵگەی سیاسی و بەڕێوبەرایەتی کە مرۆڤەکان لە میانی پەیماننامەی کۆمەڵایەتی دایانمەزراندووە لە سێ حاڵەتدا لە نوێوەدا دادەمەزرێنرێتەوە. دوان لەمانە بریتین لە دەستبەسەراگرتن واتە زەوت کردن و ستەم. ئەمانە لەبنەڕەتدا بە خراپ بەکارهێنانی هێزی یاسادانان و نەهێشتنی سنورەکانێتی و مافی بەرخودان دێتەکایەوە. لە ئەنجامی بەکارهێنانی مافی بەرخودان (شۆڕش) کردن، لەنوێوە. لەمیانی هەلومەرجەکانی پەیماننامەی ئۆرژیناڵدا بەڕێوبەرایەتیەکی نوێ دادەمەزرێنرێ. لەبەرئەمە مافی یاسادانان کە لە ناوەڕۆکدا کۆمەڵگە بۆتە خاوەنی بە هیچ شێوەیەک دەورناکرێت. هەرچی حاڵەتی سییەمیشە کە (لۆک) پێشبینی لە نوێوە دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی. تیادا کردووە، هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوەبەرایەتیە و لێرەدا پێوەری بنچینەیی، یاسادانانە.

### ج - هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوبەرایەتی.

بە بۆچوونی (لۆک) ئەگەر یەکێک بیەوێت بە ئاشکرا باسی هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوبەرایەتی بکات پێویستە پێش هەمووشتێک هەڵوەشاندنەوە کۆمەڵگە و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوبەرایەتی لە یەکتر جیابکاتەوە. کاتێک مرۆڤەکان کۆمەڵگەیان هێناوەتە ئاراوە لەپێناو ئەوەی کە لە بارودۆخی شێواوی سروشت دەربکەون و ببنە کۆمەڵگەیەک و دەوڵەتێکی جیاواز، رێککەوتوون. هەڵوەشانەوەی ئەم یەکێتییە. تەنها لە رێگەی هێرشی هێزێکی بیانی کە وڵات فەتح دەکات، دەبێت. لە ڕەوشێکی وەهادا چۆن لە کاتی روودانی بومەلەرزە دیوارەکانی خانوو کە بوونەتە بەرگریکار ناتوانن خۆرابگرن ئاوەهاش لە جێگەیەکدا کە کۆمەڵگە هەڵوەشاوەتەوە بوونی بەڕێوبەرایەتی مەحاڵە.

شان بەشانی ئەو رووخانەی بەڕێوبەرایەتیەکان لە دەرەوە ڕێی تێدەچێت کە لە نێوخۆشدا هەڵوەشێنرێتەوە.

بە گۆڕینی ئۆرگانی یاسادانان بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەوەشێتەوە .

یەکەم: ئۆرگانی یاسادانان پارچە پارچە دەکات یا هەڵی دەگرێت , دوای ئەوە رووبەڕووی هەڵوەشانەوە و مردن دەبێتەوە. چونکە ئۆرگانی یاسادانان تاکە ئیرادەی یەکێتی و ناوەڕۆکی کۆمەڵە. کاتێک زۆرینە جارێک ئۆرگانی یاسادانان دادەمەزرێنێ ئیدی ئەو بەیان کردن و بەجێ گەیاندنی ئەو ئیرادەیە فەراهەم دەکات. دامەزرانی ئۆرگانی یاسادانان کە

یەکێتی گەل بە بەردوامی فەراهەم دەکات لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی ئەو کەسانەی کە بە ڕەزامەندی گەل ئەرکیان پێدراوە و دەسەڵاتیان پێدراوە. یاسای یەکەم و یاسای بنچینەیی کۆمەڵە.
دووەم: خراپ بوونی بەڕێوبەرایەتی لە ڕەوشێکدا کە خاوەنەکانی دەسەڵات دەسەڵاتەکانیان بە خراپی بەکاردێنن، دێتەکایەوە. بەڵام ئەم ڕەوشە بە گوێرەی شێوەکانی بەڕێوەبەرایەتی دەگۆڕێت. هۆکارێکی تری هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوبەرایەتی ئەوەیە کە هێزی یاسادانان و هێزی بەڕێوەبردن پێچەوانە یاخود ناکۆک لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی کە پێیان دراوە بجولێنەوە.
کاتێک هەموو ئەو هۆکارانە هەبن یاخود ئەو بارودۆخانە لە ئارادابن، ئەوا مافی خەڵک بۆ دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیەکی تر لە شوێنی بەڕێوەبەرایەتی هەڵوەشاوە، لە دایک دەبێت.




## ئەنجام

(جۆن لۆک) تابلۆی خاوەنی شوێنێکی گرنگ و هەڵبژێردراوە لە مێژووی بیری سیاسییدا. هەرچی ئەو شتەشە کە بۆتە هۆی ئەوەی ببێتە خاوەنی شوێنێکی هەڵبژێردراو لەنێو بیری ماف (حقوق)ی سروشتی , تیۆرەکەیەتی کە بە لۆژیکێکی تەندروست نەخشاندویەتی. تیۆری (لۆک) لە زۆر رووەوە بۆ رۆژگاری ئەمرۆشمان گرنگە. پێش هەموو شتێک (جۆن لۆک) بە شێوەیەکی جیاواز لە (هۆبز)ی هاوسەردەمی کاری کردووە بۆ ئامادەکردنی تیۆرەکەی، بۆتە وتەبێژی چینی ناوەڕاست بۆ ئەوەی بتوانێت بەشی لە دەسەڵات وەربگرێت. هەرچی (هۆبز)ە پێشکەوتنی هیواش هیواشی چینی ناوەراستی کردۆتە ئامانج لەژێر ناوی پاراستنی دەسەڵات. لەم رووەوە دەتوانرێت بنەمای زۆربەی چەمکەکانی لیبراڵی کلاسیک لە (لۆک)

دا ببینینەوە. (لـۆک) لە هەمان کاتدا هەروەکوو چۆن وەکـوو یەکێک لە پێشەنگ و پارێزەرەکانی لیبرالیزم پەسند کراوە , باس لەوەش دەکات کە بە بیروباوەڕەکانی شۆڕشی ئەمریکا و دەرکەوتنی یەکەمین دەستوری نوسراو بەرادەیەکی زۆر کاریگەر بووە. ئەو گرنگی و واتایەی کەبە موڵکیەتی داوە بەردی بناغەی تیۆریەکەی لۆک پێکدێنێت. بە بۆچوونی ئەو موڵکیەت گوزارشتی هەموو هەبوونی (گیان و ئازادی و ماڵ)ی مرۆڤەکانە هەمووشتێک پشت بە پاراستن و پێشخستنی ئەوموڵکیەتە دەبەستێت. ئەو عونسورە گرنگەی کە ئەمەش فەراهەم دەکات لە هێزی یاسادانان خۆی دەبینێتەوە.

(لۆک) تیۆرەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە میانی گەڕانەوە بۆ نرخی یاسا و یاسادانان دامەزراندووە. مرۆڤەکان لە بارودۆخی سروشتیدا موڵکەکانیان لە ژێر پاراستنی یاسای سروشتیدایە. لەگەڵ ئەوەی مرۆڤەکان لە بارودۆخی سروشتیدا ئازاد بوون بەهۆی زەحمەتیەکانی بـارودۆخـی سروشت، بە ئامانجی ئەوەی موڵکەکانیان باشتر بپارێزن پەڕیوەتەوە بۆ حاڵەتی کۆمەڵگەیی. لەگەڵ ئەوەی زەحمەتیەکانی یاسای سروشتی لە حاڵەتی کۆمەڵگەشدا بەردەوام بووە، هەڵساون بە دامەزراندنی ئۆرگانی یاسادانان کە تاکە شوێنە کە بتوانێت ئیرادەی خۆی تیادا بەیان بکات. هەڵبەتە ئەمەش بۆئەوەیە کە بتوانێت باشتر بەڕێوەببات. بە پشت بەستن بە رەزامەندی زۆرینە. یەکگرتنی مرۆڤەکان لە دەوڵەتدا لەگەڵ خۆیدا بەڕێوەبەرایەتی شارستانی دەهێنێت. چونکە بەم شێوەیە ئەو لەیەکتر نەگەیشتنەی لە نێوانیاندا هەیە لەمیانی عەدالەتەوە چارەسەر نابن , بۆیە هەبوونی هێزێکی بالا دەبێتە پێویستیەک. ئەمە بنەمای بەڕێوبەرایەتی شارستانیە و هێزی باڵاشی یاسادانانە. هەمووشتێک پشگیری خۆی لە یاسا و یاسادانان وەردەگرێت. ئەوانەی ناکۆکن لەگەڵ ئەمەدا دوورن لەوەی کە شەرعی ببن. بەکارهێنانی هەر هێزێک کە زیان بە یاسادانان بگەیەنێت و ناکۆک بێت لەگەڵ یاسا ئەو سود و قازانجە نابەخشێت کە کۆمەڵگە چاوەروانی دەکات. چونکە پاراستنی موڵکی مرۆڤەکانیش پەیوەستە بەمەوە. لە حاڵەتێکدا ڕەوشێکی بەم شێوەیەش هاتە پێشەوە ئەوا مافی بەرخودان و شۆڕشی مرۆڤەکان لە دایک دەبێت بۆئەوەی یاسادانان و ناڕاستەوخۆش موڵکەکانی خۆیان بپارێزن. چونکە هۆکاری هەبوون و ئەرکی دەوڵەت ئەوەیە کە ماف و ئازادی تاکەکانی بپارێزێت، تاکەکانیش بەومەرجە گوێڕایەڵی دەسەلاتی سیاسی دەکەن. لەبەرئەو هۆکارانەیە کە بیروباوەڕی (جۆن لۆک) بەتەواوی لیبرالیانەیە.

(جۆن لۆک) کە شتی وەهای نەگوتووە کە بەتەواوی نوێ بێت و پێشوتر هیچ نەزانرابێت. لەگەڵ ئەوەی کە بیروبۆچوونە ئۆرجیناڵەکانی لە بابەتی موڵکیەت چڕ بۆتەوە، هەوڵی داوە بیرۆکەکانی بەشێوەیەکی کاریگەر و تابلێی سیستەماتیک بخاتە روو.

ئەو واتا فراوانەی (جۆن لۆک) بە موڵکیەتی داوە جەخت کردنەوەی لەوەی کە ئەمە لە بنچینەدا بە هێزی یاسادانان دەپارێزرێت، بەشداریەکی گەورەی لە چەمکی شەرعیەتی پەرلەمانتار کردووە کە دواتر بە باشی جێگیر دەبێت و بلاو دەبێتەوە.

سەرچاوە:
WWW.toplumdusmani.net

# هەڵاتن لە ئەقڵ و تیۆری سیاسی

نووسینی: د. حسێن بەشیریە
و. لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

هەندێ لە بیرمەندانی ئەم دواییە، پێیانوایە مرۆڤ لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکە لە ژێری هەڵدێت و دژ بە ئەقڵە، مێژووش هەر بەو چەشنە پرۆسەیەکی دابڕاو و نائەقڵانییە. لەسەر ئەم بنەمایە، بەپێچەوانەی پێشبینی چەرخی ئەقڵگەرایی و ڕۆشنگەری، چیتر ئەقڵ لەنێو چەقی ژیانی مرۆڤ و لە نێوەندی پرۆسەی مێژوویی دا نییە، بەڵکو لە پەراوێزدایە و پاشکۆی هێزەکانی دیکەی وەک غەریزە، ئیرادە، خواستی هاودەنگی کۆمەڵایەتییە و بە بەشێکی هەژمار دەکرێت.

هەڵبەتە سەرپێچی گشتیانە دژ بە ئەقڵ، هزرێکی نوێ نییە. زۆرینەی سۆفی و مەزهەبییەکان لەو بڕوایەدابوون کە پێویستە ڕێبازێکی دیکە بۆ تێگەیشتن لە هەقیقەت پەیدا بکەین، چونکە هەقیقەتە مەزهەبییەکان لەڕێگەی ئەقڵەوە شیاوی دۆزینەوە نین.

ئەفلاتونە نوێیەکان لەو بڕوایەدابوون کە هەقیقەت



حسێن بەشیریە

تەنها لەڕێگەی هێنانەئارای یەکێتییەک لەگەڵ خودا، شیاوی تێگەیشتنە.

مەسیحییەت لە دەستپێکدا وەک مەزهەبێکی نائەقڵانی پەرەیستاند تا ئەو ساتەی سکۆلاستیسیزم (Scholasticism)ی سەدەکانی ناوەراستی هێنایەئارا و بنەمایەکی ئەقڵی لەو پێناوەدا خستەڕوو، پێیوایە هەقیقەتەکان لە ڕێگەی زانستەوە شیاوی تێگەیشتنن، بەڵام ئەم ئاراستەیەش زوو تێپەڕی.

لە سەدەی چواردەهەمی زاینیدا، قوتابخانەی (نۆمینالیزم) زاڵ بوو، خاوەنی ئەم قوتابخانەیە لەو بڕوایەدایە تەنها ئەو شتانە راستەقینەن کە دەبینرێن و بەرجەستەن، رەگوڕیشەی زانیاری و زانست لە ئەزموونەدایە. کەواتە هەرشتێ لە دەرەوەی ئەزموون بێت، پێویستە لەسەر بنەمای ئیمان پەسەند بکرێت.

نۆمینالیزم ڕێگای بۆ زانستی نوێ هەموار کرد.

لە چەرخی رۆشنگەریی دا، ئەقڵگەرایی ئەزموونی لەسەر بنەمای مەعریفە قبوڵ کرد، سەرەنجام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا فەلسەفە وەک تێڕامانێ دەربارەی میتافیزیکا دووچاری قەیران بۆوە، سەرەنجام زانست جێگەی ئەقڵی چەوتی گرتەوە، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا هاتنەئارای چەندین فەلسەفەمان بینی کە ئەقڵ و زانست پێکەوە بە بێ بەها دادەنێن.

دژایەتی ئەقڵ شێوازی جۆراوجۆری هەبووە، هەندێ لە نوێنەرانی ئەو ڕەوتە لەبری زانست و زانیاری نوێ ستایشی دابونەرێتیان دەکرد، هەندێکی دیکەشیان نکۆڵیان لە دەسەڵاتی ئەقڵی مرۆڤ لەپێناو گەیشتن بە راستییەکان دەکرد. بۆ نمونە (پارەتو) ی بیرمەندی ئیتاڵی سەبارەت بە ئەقڵ وەک (بنەمای زانست) رەشبین بوو، بەتایبەتی لەو بڕوایەدابوو خەڵک تەنها غەریزەکانی خۆیان خاڵی دەکەنەوە و بەشێوەی ئەقڵانی دەیخەنەڕوو. ئەوەی مرۆڤ بەرەو کار دەبزێوێ ئەقڵ نییە بەڵکو غەریزەیە.

جۆرج سورێل لەو بڕوایەدابوو بیروباوەڕە نائەقڵانییەکان پاڵنەری کارن. ناوبراو مەزهەب و ئایدیالیزم بەشێوەیەکی گشتی بە بنەمای کار و ئایدیالیزمی مرۆڤ دەزانێ. لە دیدی ئەودا، ئەفسانە و خەیاڵ کە بنەمای بابەتیانەیان نییە، سەرچاوەی کارە سیاسییەکەیە.

بەمشێوەیە (سورێل) بەر لە (فرۆید) جەختی لەسەر بایەخی رەفتاری غەریزی و نەست کردبۆوە. سورێل خۆی خوێندکاری (ئەمیل دۆرکهایم) بوو کە لەم قوتابخانەدا پێگەیەکی بڵندی هەبووە.

بە شێوەیەکی گشتی دۆرکهایم سەبارەت بە توانا و کارایی ئەقڵی تاکەکەس؛ رەشبین بوو.



## *ئەمیل دۆرکهایم (١٨٥٨ز -١٩١٧ز)

دۆرکهایم لە ساڵی (١٨٥٨ز) لە خێزانێکی جولەکە لە فەرەنسا هاتۆتە دونیا، لە (١٨٨٧ز) بوو بە ئوستادی سۆسیۆلۆژیا لە زانکۆی (بـۆردۆ). بە ڕواڵەت لایەنگرێکی سەرسەختی ڕێبازی ئەقڵ بوو، کۆمەڵگای بە دیاردەیەکی سروشتی دادەنـا کە دەبوایە بە هەمان بابەتیبوونە تایبەتییەکەی زانستی سروشتی، بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە.
نـاوبـراو لایەنگرانی خـۆی بۆ ڕیشەکێش کردنی دەمارگیری و بڕیاری باوی پێشوەخت هان دەدا و بەهایەکی زۆری بۆ ڕۆڵی ئەقڵ و زانست دادەنا، بەڵام پێویستە تێگەیشتنی تایبەتیانەی ئەو بۆ ئەقڵ بە دروستی وەربگرین. ناوبراو (ئەقڵ) و (زانست)ی بە کارێکی تایبەتی زەینی مرۆڤ نەدەزانی، بەڵکو وەک کارێکی کۆمەڵایەتی و بـەدەر لە تاکەکەس دەیخەملاندن.
لە ڕوانگەی ئەوەوە کۆمەڵگا سەرچاوەی سەرجەم داهێنانەکانە و توانای بیرکردنەوە و تێفکرینی هەیە و بەرهەمی ئەم تێفکرینەش هەمان ئەو دابونەریت و ئایدیالانەی کۆمەڵگان.
لە دیدی دۆرکهایمەوە، بیرکردنەوە و تێفکرینی تاکەکەس، کارێکی ساکارە و کورتخایەنە. لەکاتێکدا دابونەریتەکانی کۆمەڵگا وەک جێ نزرگەی ئەقڵی گشتی، خاوەنی قوڵی و بەردەوامییەکی زۆرە. کۆمەڵگا لەگەڵ سەربەخۆیی دا تێدەفکرێ و هەستی هەیە و کار دەکات. کۆمەڵگا پێوەرەکانی ڕاست و هەڵە واتا ئەخلاق گەلاڵە دەکات و هەستی ئەرک و بەڵێن لەنێو مرۆڤدا دێنێتە ئاراوە تا ئەنجامیان بدات.
تاکەکەس ناتوانێ ئەقڵ و هەستی خۆی بخاتە سەنگەری دژ بە ئیرادەی گشتی کۆمەڵگاوە. دۆرکهایم

بڕوای بەم گوتە ناسراوەی (تۆرۆ) نەبوو کە مرۆڤی خاوەن هزرێکی ڕاست بەهای لە هزر چەوتەکان زیاترە، یاخود بڕوای بەم گوتەیەی (ئیبسن) نەبوو: «کەمینەیەک لەوانەیە خاوەنی بۆچوونێکی دروست بن، بەڵام زۆرینە هەمیشە هەڵە دەکەن».

لەڕاستیدا لە ڕوانگەی دۆرکهایمەوە، کۆمەڵگا خوداوەندی تاکەکەسە، چونکە مایەی بوونی کۆمەڵایەتی و فکریی تاکەکەسە. لە دیدی ئەودا، خوداوەند شتێک نییە جگە لە کۆمەڵگا کە گۆڕان بەسەر شێوەیدا هاتووە و بەشێوەیەکی ئاڵۆز خۆی دەردەبڕێت. بەبێ کۆمەڵگا، ئەخلاقیش بابەت و هەگبەیەکی نییە.

## *گۆستاڤ لۆبۆن



لەنێو ئەو نەریتە هزرییەدا، پێویستە ناوی (گۆستاڤ لۆبۆن)یش بهێنین. لۆبۆن (١٨٤١ز-١٩٣١ز) لە بواری فیزیک و ئارکیۆلۆژیادا خوێندی، بەڵام ئینتیمای بۆ سۆسیۆلۆژیا پەیدا کرد. ناوبراو نکۆڵی لە توانایی و کارایی ئەقڵی و هزریی تاکەکەس و کۆمەڵە سیاسییەکان دەکرد، لەنێو توانستە نەژادییەکاندا بەدوای نهێنی پێشکەوتنی شارستانییەتدا دەگەڕا.

لە ماوەی (٩٠) ساڵ تەمەنی خۆیدا شایەتحاڵی هەندێ لە گرنگترین ڕووداوەکانی مێژووی هاوچەرخی جیهان بوو وەک جەنگی فەرەنسا و پروسیا، شۆڕشەکانی ساڵی (١٨٤٨ز)، شکستی ناپلیۆنی سێیەم و کۆمۆنەی پاریس. لۆبۆن لە دوادوای تەمەنیدا، بوو بە مامۆستای سایکۆلۆژیا لە زانکۆی پاریس.

ناوبانگی لۆبۆن قەرزاری لێکۆڵینەوە سایکۆلۆژییەکانییەتی خۆیەتی دەربارەی کۆمەڵە سیاسییەکان. لە ڕوانگەی ئەوەوە کۆمەڵە خەڵکێکی شێواو و دوور لە ئەقڵ و ئاوەزن کە لەژێر کاریگەری هەستوسۆز و غەریزە کوێرەکانی خۆیاندان. ئەم گروپانە کۆمەڵێک تایبەتمەندی تەواو ناتەبایان تێدایە و هەر کەسێکی پێکهێنەری ئەو گروپانەش خاوەنی تایبەتمەندی خۆیانن.

ئەم گروپانە لەهەر جۆرە توخمێکی ئەقڵانی بێبەرین و بەتەواوەتی لەژێر کاریگەری غەریزە و پاڵنەرە سەرەتایی و نەستییەکانی خۆیاندان. لەبەرئەم فاکتەرە ئەم جۆرە گروپانە دەتوانن دەست بۆ

کردەوەی توندوتیژانە و وێرانکاری ببەن، لەکاتێکدا تاکەکەس لەنێو تەنهایی خۆیدا لە ئەنجامدانی ئەو چەشنە کردەوانەدا لاوازە. گردبوونەوە سیاسییەکان بەگشتی لە پرۆسەی شۆڕش و قەیرانەکاندا بەشێوەی ڕەفتارێکی بەکۆمەڵ فۆرمەڵە دەبن و ڕوو لە هەرجۆرە دڕندایەتییەک دەکەن. خاڵی سەرەکیش ئەمەیە کە مرۆڤەکان لەناو گروپ و کۆبوونەوەکاندا سەبارەت بە پاڵنەرە غەریزەیی و کوێرەکانی خۆیان کە خۆی لەنێو سروشتی مرۆڤدا حەشارداوە، بەتوندی کاردانەوە دەنوێنن. مـرۆڤ لە تەنهایی دا لە ترسی سزای کۆمەڵایەتی ئەم چەشنە غەریزانە دادەمرکێنێتەوە، بەڵام لەناو گروپێکدا بەهۆی کەڵەکەبوونەوە، ئەم هێزە غەریزەییانە دەتەقنەوە. ڕەنگە ئەم چەشنە ڕەفتارانە، سەردەمانێ بە بیری تاکەکەس بهێنێتەوە کە مرۆڤ وەک کۆمەڵێ بوونەوەری سەرکێش و دڕندە دەژیان. گوایە مرۆڤ لەو کۆمەڵە سیاسییانەدا لەنێو خەوێکی دەستکرد ڕۆدەچن یاخود لەڕێگەی سەرکردەکانی ئەو گروپانەوە دەبەنگ و بێ ئاگا دەکرێن.

لە ڕاستیدا لۆبۆن، ڕەفتاری کۆمەڵە سیاسییەکان بە جـۆرە سادیزمێک یاخود ئـازاردانـی ئەوانی دیکە دادەنێت. ئەم کۆمەڵە و گروپانە هیچکاتێ شوێنکەوتەی ئەقڵ نین و هەمیشە لەژێر کاریگەری واتەوات، خورافات و ترسدان.

لۆبۆن تەنانەت لەو بڕوایەدایە بڕیارەکانی ئەم جـۆرە گروپانە هێندە جیـاوازی لەگەڵ بڕیارە بەکۆمەڵەکانی شێتەکاندا نییە، چونکە ڕەفتاری بەکۆمەڵ هیچکاتێ لەسەر بنەمای هزر و ئەقڵ ئەنجام نادرێت. تەنها خەسڵەتی هاوبەشی تاکەکانی ئەم جۆرە گروپانە، نەزانیە سەبارەت بەو شتانەی لە دەرەوەی پەیوەندی یەک بەیەکی ئەنداماندایە، هەر ئەم نەزانییەشە کە بنەمای بڕیاردان و کارە بەکۆمەڵەکەیان پێکدەهێنێت. لەهەمبەریشدا لۆبۆن بـڕوای وایە کە پەیدابوونی شارستانییەت و پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان، هەمیشە دەرەنجامی کاری گروپە ڕووناکبیرییە گچکەکان بووە. لەهەر شوێنێ نیشانەیەکی کۆبوونەوەی خەڵک بەشێوەی چینوتوێژ و قەرەباڵغی دەبینرێت، پێویستە لەوە تێبگەین کە ئامانجەکەی وێرانکارییە نەک بونیاتنان. هیچکاتێ بونیاتنان بە قەرەباڵغی ئەنجام نادرێت. بەپێچەوانەوە هەمیشە چینوتوێژەکان و هاتنەئارای قەرەباڵغی، بۆتەمایەی شکستی شارستانییەتەکان.

لـۆبـۆن لەنێو سایکۆلۆژیای چینوتوێژەکان و قەرەباڵغی دا، بەدوای وەڵامێ بۆ زۆرینەی مەسەلە بنەڕەتییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا دەگەڕێت. ناوبراو لەو بڕوایەدایە هەوێنی مێژوو شتێک نییە جگە لە خەیاڵ و خورافات و ئەفسانەکانی خەڵک. هەروەها سایکۆلۆژیای قەرەباڵغی، دەبێتەمایەی ئاشکراکردنی ئینتیما دەمارگیری و دژەئەقڵانییەکان و دژایەتی پێکەوەژیانی مەزهەبی. وێڕای ئەمەش بەپێی ئەم دیدگایە، شۆڕشەکان جگە لە تەقینەوەی شێتانە و بەکۆمەڵی چینوتوێژەکانی خەڵک و ئەو گروپانەی جڵەویان لەدەستدا نەماوە، چیتر نییە. لەو جۆرە سەردەمەدا، بنەماکانی ئەقڵ و خۆپارێزی تێکدەشکێ و سەرکردەکان لەپێناو ڕووپۆشکردنی لایەنە لاوازەکانیاندا، خەڵک بـەرەو توندوتیژی بانگهێشت دەکەن. لە ڕوانگەی لۆبۆنەوە، شۆڕشەکان بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێ بزووتنەوەی نائەقڵانین و بەرەو توندڕەوی دەچن و دواجار ئەنجامیشیان نییە. ئەو دەستکەوتانەی دەدرێنە پاڵ شۆڕشی فەرەنسا، لە ڕاستیدا دەرەنجامی گۆڕانێکی هەنگاو بەهەنگاو بووە. حکومەتەکان هیچکاتێ لەڕێگەی شۆڕشەوە شکست ناخۆن، بەڵکو پێکەوە هەرەس دەهێنێت یاخود (خۆی دەکوژێت). شۆڕشەکان تەنها ناوی

حکومەتەکان دەگۆڕن و تەنها دەرەنجامەکەشیان دروستکردنی زاراوەی نوێیە.

لۆبۆن لەو بڕوایەدایە کاتێ خەڵک و قەرەباڵغی دەستوەربدەنە سیاسەتەوە، پێویستە درودی کۆتایی بۆ ئەقڵ و پێشکەوتن بخوێنرێت. بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی وەک سۆشیالیزمیش لە بنەڕەتدا هاوشێوەی مەزهەبەکانن، واتا بەرهەمی هاتنەئارای گروپە دەمارگیرەکانن. سۆشیالیزم تەنها دەبێتەمایەی پێکهێنانی دادگاکانی پشکنینی بیروباوەڕ و حکومەتێکی ترسێنەر، چونکە ئەو خەڵک و گروپانەی بنەمای سۆشیالیزم پێکدەهێنن، توانای بیرکردنەوەیان نییە. خەڵک تەنها لەهەمبەر پاڵنەر و غەریزە گیانلەبەرییەکانی خۆیاندا کاردانەوەیان هەیە، دەرەنجامی ئەو چەشنە کاردانەوەیەش بریتییە لە دڕندەیی و تۆڵەستێنی لەسەر ئاستێکی بەرفراواندا. ڕێبەرانی قەرەباڵغی و چینوتوێژەکان، لە بنەڕەتدا خراپەکارن، لەهەمانکاتدا شۆڕش و مەزهەبەکان پێویستیان بەو چەشنە ڕێبەرانە هەیە. قەرەباڵغی و شۆڕش ساتێکە کە تیایدا ناوەندی غەریزی و گیانەوەریی مرۆڤ سەردەردێنێ و لە کۆتوبەندی شارستانییەت و ئاکار و یاسا و ویژدان خاڵی دەبێتەوە. لۆبۆن لە دەسەڵاتخوازی چینوتوێژەکان دەترسێ، بە بۆچوونی ئەو ڕاپەرینی چینوتوێژەکان کۆمەڵگا بۆ هەلومەرجی دڕندەیی دەگێڕێتەوە، چونکە یەکەمین داخوازی چینوتوێژەکان دابەشکردنی یەکسانی سامان و سەرچاوەکان دەبێت.

***ئۆسواڵد سپێنگلەر**



ئۆسواڵد سپێنگلەر (١٨٨٠ز – ١٩٣٦ز) بەهەمان ئەندازەی لۆبۆن سەبارەت بە چینوتوێژەکان ڕەشبین بوو. سپێنگلەر لە زانکۆکانی میونیخ و بەرلین خوێندوویەتی و دەستی بە کاری مامۆستایەتی کردووە. لە تەمەنی (٣٤) ساڵیدا پەرتوکی (شکستی خۆرئاوا)ی نوسی کە لەلایەن نەوە ڕەشبینەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە ئەڵمانیا، پێشوازی لێکرا.

لەم پەرتوکەدا سپێنگلەر، کۆمەڵێ تیۆر و دەستەواژەی نوێی خستەڕوو. مێژوو لە ڕوانگەی ئەودا زنجیرەیەکی نەپچڕاوی فەرهەنگە جۆراوجۆرەکانە کە هەریەکەیان هەروەک بوونەوەرێکی زیندوو لەدایک دەبن، پیر دەبن و سەرەنجام دەمرن. بەمانایەکی دیکە تێگەیشتنی ئەو بۆ گۆڕان، تێگەیشتنێکی ئەرستۆییانەیە کە تیایدا گۆڕان واتا ڕەنگدانەوەی کارێکی بەهێز. لە ڕوانگەی سپێنگلەرەوە، شارستانییەتی خۆرئاوا نزیکەی ساڵی (١١٠٠ز) چووە نێو قۆناغی ئاوابوونەوە. ئەم ئاوابوونە، دەشێ لەگەڵ ئاوابوونەکەی ئیمپراتۆری ڕۆما لە دوادوای تەمەنیدا بەراورد بکرێت کە تیایدا چینوتوێژەکان بە سەرکردایەتی فێڵبازەکان و دەسەڵاتدارە تاکڕەوەکان گۆڕەپانی مێژوویان داگیر کردبوو. سپێنگلەر هەریەک لە (هێلتەر) و (حیزبی نازی) بە فێڵبازە بێ نرخ و بێ بەهاکان هەژمار دەکات و فاشیزم و دیموکراسیش بە نیشانە سەرەکییەکانی ئاوابوونی شارستانییەتی خۆرئاوا دادەنێ. لەوانەش خراپتر کۆمۆنیزمی ڕووسییە کە لە ڕوانگەی سپێنگلەرەوە باشترین نمونەی حکومەتی نەزان و فێڵبازی تاکڕەو بوو. سپێنگلەر هەروەک (ئیدمۆند بێرک)، ستایشی نەریت و موڵکایەتی و پێکەوەژیانی بەکۆمەڵ دەکات و لە تاکگەرایی و هیومانیزم بێزارە. ناوبراو هەروەک نیچە، داکۆکی لە دەسەڵات و ئیرادەی دەسەڵات دەکرد و لایەنگری (داماڵینی بەهاکان بوو لە بەها).



لە ڕوانگەی ئەوەوە، ژیان جەنگێکی بێ کۆتایە و تەنها نەژادێ دەمێنێتەوە کە پەیڕەوی لە غەریزە شەڕانی و توندوتیژەکانی خۆی بکات.
بەمشێوەیە دەتوانین بڵێین کە سپێنگلەر لایەنگری (یاسای جەنگەڵ) بوو، ناوبراو زاڵبوون بەسەر نەتەوە لاوازەکانی بە باشترین ڕێگای بەدەستهێنانی دەسەڵات دادەنا و کەسانی خاوەن ئاکار و ئاشتیخوازی تەنها بە جەماوەرێکی دەروون لاواز هەژمار دەکرد.
لەلایەکی ترەوە ناوبراو لەپێناو پاراستنی نەژادێکی تەندروستدا، داوای بەردەوامی و مانەوەی خێزان و زۆری ژمارەی منداڵانی دەکرد. لە ڕوانگەی ئەوەوە تاقیکردنەوەی مەزنێتی میللەتێک لە خێرایی زاوزێدایە. دانیشتوانێک لە زیادبووندا بێت ئەوا مایەی شانازی و مەزنێتییە بۆ هەر میللەتێک، بەڵام لە هەمانکاتدا دژ بە درێژبوونەوەی تەمەنی مرۆڤ بوو، چونکە کارێکی لەو شێوەیە لە ڕوانگەی ئەوەوە دەبێتەمایەی پیری و لاوازی دانیشتوان. لەم ڕووەوە پێویستە ڕێگە لە پێشکەوتنی زانستی پزیشکی بگیرێت، چونکە خودی نەخۆشی باشترین ئامرازە بۆ لەناوبردنی لاوازەکان.
هەروەها سپێنگلەر دووژمنی ئەقڵ و هزری ئەقڵانی بوو، چونکە بەمایەی لاوازی مرۆڤی دەزانی.
بێگومان ناوبراو ئەم گوتەیەی (ژان ژاک ڕۆسۆ)ی قبوڵ بوو کە گوتویەتی: «مرۆڤ لە گیانلەبەرێکی ئاقڵ زیاتر نییە».
سپێنگلەر پێی وابوو ناواخنی هزری ئەقڵانی بریتییە لە ڕەخنە و ڕەخنە لێگرتن، لە ڕوانگەی ئـەوەوە (ڕەخنەگرتن) دژ بە (داهێنان) بوو. ئەقڵانییەتی مۆدێرن لە دیدگای ئەوەوە دیاردەیەکی کاتییە و زادەی هزری خەڵکانی پاشکەوتوو و نەزانە. بەپێچەوانەوە ئەقڵانییەت لە کۆمەڵگای نەریتخوازدا کە پاشکۆی غەریزە و نەریت بوو، بەکارێکی سروشتی و جێگەی ستایش هەژمار دەکرا.

هـەروەهـا (ڕووناکبیرانی شـار) تەنها کارەکەیان کاوێژکردنە بە گریمانە و تیۆرە بێ بنەماکانەوە. (لە مێژوودا هەژموونی نـەژادی و هێزی ئیرادە جێگەی بایەخە نەک دۆزینەوەی هەقیقەتەکان). مێژوو هەمیشە هەقیقەت و دادپـــەروەری کردۆتە قوربانی هێز و هەژموونی نەتەوەیی، هەرکەسێ لە (هەقیقەت) زیاتر بەها بە (کارکردن) و لە (دادپـەروەری) زیاتر بەها بە (هێز) بدات، ئەوا دەکەونە بەردەم لەناوچوونەوە، دژایەتی ئەقڵ سەرەنجام دەبێتەمایەی دووژمنایەتی لەگەڵ دیموکراسیشدا.
بە بڕوای سپێنگلەر توانای ئەقڵی زۆرینەی خەڵک بریتییە لە (ئاژاوەیەک کە خوویان پێوەگرتووە). ناوبراو بەپێچەوانەشەوە داوای ملکەچی و بەندایەتی جەماوەری بۆ ئەو ڕێبەرانە دەکرد کە هەر لە ناخەوە بە شیاوی ڕێبەرایەتی دادەنرێن. لە ڕوانگەی ئەوەوە (هەروەک چۆن سوپا بەبێ فەرماندە ناتوانێ خۆی ڕێکبخاتەوە، میللەتیش ناتوانێ هەر خۆی حکومڕانی خۆی بکات).
لە ڕوانگەی ئـەوەوە، بەتایبەتی (دیموکراسیزمی ئەمریکی) باشترین نمونەی ئانارشیزم و حکومەتی حەزو ئارەزووە، هیچ ئەمریکییەکی بەرژەوەندپەرست ملکەچی یاسا نییە مەگەر گەمژە یاخود لاواز بێت. ڕووسیای سۆڤییەتیش لە ئەمریکا خراپترە، هەردووکیان دیکتاتۆرین و لـەڕووی دامـــەزراوەی ئابوورییشەوە هاوشێوەی یەکترن.
سپێنگلەر ترسی لە ڕوودانی شۆڕشی جیهانی هەبوو، لە ڕوانگەی ئەوەوە ئەگەری ڕوودانی دوو شۆڕش لە ئارادا بوو: یەکێکیان (شۆڕشی سپی جیهانی) و ئەویتریان (شۆڕشی نەژادی جیهانی)یە. ئەگەری ڕوودانی شۆڕشی سپی لەڕێگەی هاتنەئارای خەڵکەوەیە کە هەمیشە لە سات و کاتی خۆیدا دەردەکـەون و چاوچنۆک و ناڕازین. شۆڕشگێڕە سپییەکانیش بریتین لە ئەکادیمییە

تێکشکاوەکان، خراپەکاران، لەشفرۆش و ئەو بێ خانە و لانانەی کە دژ بە خانەدانەکان شۆڕش بەرپا دەکەن.

سەرکردەکانی بزاوتە کرێکارییەکان، لایەنگرانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندخوازەکان کە خەڵک دەبزێون، سەربەم ڕەوتەن. لە ڕوانگەی سپێنگلەرەوە موڵکایەتی تایبەتی پێداویستییەکە بۆ کلتورێکی دەوڵەمەند، سامان هۆی هەژموونی تاکەکەس نییە بەڵکو دەرەنجام و هۆکارە. هەڵبەتە سامانی کاغەزی خاوەن بۆرسەکان مایەی شانازی نییە، بەڵکو سامانی راستەقینە بریتییە لە سامانی نەریتیانە واتا موڵکایەتی ماڵوموڵک و کەلوپەلی گـوازراوە و نـەگـوازراوە، بەتایبەتی ئەگەر بە میراتی بەجێمابێت. بەمشێوەیە سپێنگلەر نەک تەنها پرۆلیتاریا بەڵکو بانکدارەکانیش دەخاتە بەردەم پەلامارەوە و هەردووکیان بە دووژمنی موڵکایەتی نەرێتی دەزانێ.

شـۆڕشـی سپی سپێنگلەر بەمشێوەیە شەرێکی چینایەتییە، لەکاتێکدا شۆڕشی نەژادی تەنها رەهەندێکی نەژادیانەی هەیە. ناوبراو پێی وابوو خەڵکی ناسپی پێستی جیهان بریتین لە: رەش پێستەکان، دانیشتوانی ئاسیای باشوری خۆرهەڵات، مەغۆلەکان، موسڵمانان، هیندییەکان و ڕووسییەکان. مەترسی شۆڕشی ئەم نەژادانە دژ بە سپی پێستەکان زۆر شێلگیرانەترە. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا دەستوەردانی نەژادیانەی سپی پێستەکان، هەستی لەخۆبایی بوون و متمانە بەخۆبوونێکی پتری بە ناسپی پێستەکان بەخشی و بـراوەی سەرەکی جەنگەکەش هەمان ئەو نەژادە نزمترانەن. مەترسی سەرەکی لەمەدایە کە هەردوو شۆڕشەکە یەکبگرن و سەرەنجام هەموو بەهاکانی شارستانییەتی سپی پێستەکان لەناوببەن. تەنها کەسانێ دەتوانن ڕێگە لەم مەترسییە ماڵ وێرانکەرە بگرن، ئەویش ئەڵمانییەکانن چونکە لەڕووی نەژادی و هێزەوە خاوێنترین بوونەوەرن.


**سەرچاوە:**

د.حسین بشیریە: نضریەهای جدید در علوم سیاسی، موسسە نشر علوم نوین، ١٣٧٨، ص (٥١-٥٨)

# له سورياوه بۆ پاریس

## كاریگەری فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەسەر ڕۆشنبیریم و پێگەیاندنم (١)

نووسینی: هاشم ساڵح
و. له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

زۆرجار ئەم پرسیارە لەخۆم دەكەم: ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان نەڕۆشتمایە بۆ فەرەنسا، چیم لێ دەهات؟ بە مانایەكیتر: ئەگەر من هەر لەناوەوە بمایەتمەوە و دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخسایە سەفەر بۆ دەرەوە بكەم و ئەورووپا و كەلتورەكەی و ئازادییەكەیم نەناسیایە، ئایا هەمان ئەم كەسەی ئێستا دەبووم؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر. بگرە بەو پەڕی سادە و ساكارییەوە لەوانەیە لەژیاندا نەمابومایە. لەوانەیە تەنگەنەفەسی ناوەوە بیكوشتمایە. مەبەستم تەنها تەنگەنەفەسی سیاسی نییە، بەڵكو لەگەڵیدا مەبەستم تەنگەنەفەسی كۆمەڵایەتی و ئاینی و سێكسی و ...هتد.

بەڵێ ئەزمونی ئەوروپا، بە دیاریكراوی فەرەنسا، بۆ من ئەزمونێكی یەكلایكەرەوە بوو. دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساندم زمانێكی بیانی تازە فێرببم، زمانێك هەموو جۆرەكانی زانست و مەعریفە و



هاشم سالح

فەلسەفەکانی لەخۆگرتبوو. من ئەگەر تەنها لە سنوری زمانی عەرەبیدا بمایەتمەوە، ئەوا رۆشنبیرییەکەم لە سنورێکی تەسکی دیاریکراودا دەمایەوە، بگرە لە ئاستێکی روکەشدا دەمایەوە. خودی ئەمە بۆ خۆی گەورەترین بەڵگەیە لەسەر رادەی ئەو مەترسییەی لە ئێستادا هەڕەشەمان لێدەکات، یان بڵێ هەڕەشە لە زمانەکەمان و لە کەلتورەکەمان دەکات. ئەوە زمانی فەرەنسی بوو دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساندم تەواوی فیکری تازە بناسم. ئەگەر ئەوە نەبوایە، نە جان جاک رۆسۆ و نە دیکارت و نە سەرجەم فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەوروپیم بە زمانە ئەسڵیەکەی خۆیان نەدەخوێندەوە. ئەوکات چەندم زەرەر دەکرد؟ بگرە گەرئەوە نەبوایە، ئەوا نەمدەتوانی فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەڵمانی وەک کانت و هیگڵ و نیتچە و ئەوانی دیکە بخوێنمەوە. ئەگەر زمانی فەرەنسیم نەزانیایە، ئەوا نەمدەتوانی لە میانەی وەرگێڕانە نایابە فەرەنسییەکانەوە، بەرهەمی ئەو فەیلەسوفە ئەڵمانیانە بخوێنمەوە. هەمان شت بۆ فەیلەسوف و ئەدەیب و شاعیرانی ئینگلیزیش راستە، لە جۆن لۆک-وە بۆ برتراند راسل، لە شکسپیرەوە بۆ وۆرد زۆرس.

بە راشکاوی هیچ متمانەیەکم بە وەرگێڕانە عەرەبییەکان نییە، ئەمە ئەگەر هەبێت. هیوادارم زیاد لە پێویست زوڵمم نەکردبێ، لەو بڕوایەدام من تا رادەیەک زوڵمم کردووە. بە دڵنیاییەوە هەندێ وەرگێڕانی باش هەیە. بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەو وەرگێڕانە باشانە بە بەراورد بە وەرگێڕانە خراپەکان زۆر کەمترن، لەگەڵ ئەوەشدا دەیان کتێبی گرنگی دیکە هەیە کە تا هەنوکە وەرنەگێڕدراون. چەند کاتژمێری خۆشم لەگەڵ رۆسۆ و هەموو ئەو بلیمەتە گەورانە بەسەر برد؟ تا ئێستاش لەزەت لە کتێبەکانیان وەردەگرم و بە روناکییان روناکدەبمەوە (٢).

پێویستە دان بە راستییەکدا بنێم: من کەسێکم بە فەرەنسی دەخوێنمەوە و بە عەرەبی دەنووسم! نوقتە سەری دێڕ. بێگومان زۆرجار رێدەکەوێت نووسینە عەرەبییەکان دەخوێنمەوە، بگرە بەیانیان بە خوێندنەوەی ئەو نوسینە عەرەبیانە دەستپێدەکەم، ئەویش لە میانەی هەڵدانەوەی رۆژنامە عەرەبییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، وەک ئەوەی هیگڵ لە رۆژگاری خۆیدا دەیکرد، هیگڵ پێیوابوو خوێندنەوەی رۆژنامەکان وەک نوێژی بەیانیان وایە. بەڵام لە رۆژگاری ئەودا نە ئینتەرنێت هەبوو نە ئەم هەموو ئاسانکارییە زۆرانە کە شۆڕشی زانیارییە تازەکان بۆی هێناوینەتە ئاراوە و من زۆرجار سود لە هەندێکیان دەبینم.

بەڵام لە راستیدا من هەندێ لەو رۆژنامانە، بە پلەی یەکەم، تەنها لە پێناو کات بەسەربردن و بۆ خۆشی دەخوێنمەوە، نەک لە پێناو خۆ رۆشنبیرکردن یان لە پێناو ئاشنابوون بە فیکرێکی تازە یان قووڵ. کاتێ قووڵایی فەلسەفەم بوێت، ئەوا راستەوخۆ




دەچمە سەر خوێندنەوەی کتێبە فەرەنسییەکان و هەڵدانەوەی پێگە ئەنتەرنێتییە بیانییەکان. ئەوەی لێرەدا دەیڵێم، قسەیەکی تاڵبێی بێزارکەرە و خەریکە لێی پەشیمان دەبمەوە، بەڵام ئەوە حەقیقەتە: حەقیقەتێکی بریندارکەرە. تا ئێستا لە زمانی عەرەبیدا فیکرێکی قووڵ نییە، تەنها هەندێ ئاوارتەی زۆر کەم نەبێت.

پێش ئەوەی لە سوریا دەربچم، زۆر بەدەگمەن فیکرێکی قووڵم دەبینی. فیکری ڕوکەش و سادە و جڵەوکراو تاڕادەیەکی زۆر هەموو گۆڕەپانەکەی کۆنترۆڵ کردبوو. لێرەوە ئەگەر من لە ناوەوە بمایەتمەوە، ئەوا گەلێک شتم لەکیسدەچوو. دەژیام و دەمردم بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ تێگەشتبم. هەمو فیکرە زانستی و فەلسەفییەکانی تازەگەری، بێدەنگ بەسەریاندا تێدەپەڕیم، یان بڵێ ئەوان بێدەنگ بەسەرمندا تێدەپەڕین. من بەناچاری لە سنوری عەقڵیەتێکی دیاریکراو و تەسکی زانستی و ئاینی و سیاسیدا دەمامەوە. بەڵێ ئەزمونی ئەوروپا یان سەرکێشیکردن تێیدا، بۆ ڕۆشنبیری عەرەب، بەختێکە هیچ بەختێکی دیکەی لەدواوە نییە. ئەگەر تەها حسێن نەڕۆشتایە بۆ ئەوروپا و بەتایبەت بۆ فەرەنسا، ئایا دەبوو بە تەها حسێن؟ هەمان مەسەلە بۆ محەمەد مەندور و زەکی نجیب و دەیانی دیکە، لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای عەرەبی، وەک یەک ڕاستە.

لێرەوە ئێمە هەموومان، بەرهەمی دوو کەلتورین نەک یەک کەلتور. لەلایەکەوە کەلتوری عەرەبی ئیسلامی ڕەسەن، لەلایەکی دیکەوە کەلتوری تازەگەری ئەوروپی. وەلێ هەرگیز ئەم قسانەتان پێ سەیر نەبێت. ئایا دەزانن کاتێ ئێمە خاوەنی شارستانیەت بووین، کاتێ لەسەردەمی زێڕینی خۆماندا دەژیان کە جیهانی بە ڕۆشناییەکەی ڕوناککردبوەوە، هەموو بیرمەندەکانی جیهان، حەزیان دەکرد ڕووبکەنە بەغداد یان قورتوبە یاخود ئەندەلوس (٣). ئەمە سونەتی یەزدانە لە خەلقکردنەکەیدا: شارستانیەت دێت و دەڕوا، بەپێی سەردەم و بارودۆخ و وەرچەرخانە مێژوییەکان، لە شوێنێکەوە دەچێت بۆ شوێنێکی دیکە. شارستانیەت تاسەر بۆ هیچ کەس نامێنێەوە، ئەوەی لە زەمەنێکدا دڵخۆشت دەکات، زەمەنەکانی دیکە دێن و دەیسڕنەوە. بەڵام ئایا دوای ئەو هەموو ساڵە، ئێستا ئیدی کاتی ئەوە نییە بگەڕێتەوە بۆمان؟ زۆر بیریدەکەین. چونکە کاتێ شارستانییەت لە شوێنێکدا دەواری خۆی هەڵدەدا، ئەوا گەردون بزە دەیگرێت و جیهان دەگەشێتەوە. شارستانییەت وەک خانمێکی شۆخوشەنگ وایە، کاتێ خۆیدەکات بە ماڵدا، ماڵەکە ڕووناکدەکاتەوە و گڕ لە دونیا بەردەبێت. ئایا ئێمە دەزانین کە بیرمەندانی ئەوروپای مەسیحی، بەشوێن دەستنوسەکانماندا دەگەڕان و فێری زمانەکەمان دەبوون و کتێبەکانیان وەردەگێڕاین، تاکو لێیەوە زانست و فیکرو فەلسەفە وەربگرن؟ بگرە ئەوان




شانازییان دەکرد کە فارابی یان بیرۆنی یاخود ئیبن سینا یان ئیبن روشد -یان خوێندوەتەوە، وەک ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە شانازی دەکەین کە دیکارت و کانت و هیگڵ -مان خوێندوەتەوە. ئەمە سونەتی ژیانە: ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە.

لەمڕۆدا کێ بایەخمان پێدەدا؟ کەس. بگرە لەمڕۆدا کێ بایەخ بە یۆنانییەکان دەدا؟ دیسانەوە کەس. لە ڕابردودا، لە ڕۆژگاری سوقرات و ئەرستۆ و ئەفلاتون -دا، ئەوان لە ڕووی زانست و شارستانییەتەوە، چرای جیهان بوون و جیهانیان ڕووناکدەکردەوە. کەچی هەنوکە بوونەتە دەوڵەتێکی بچوکی بێدەرەتان. ئێستا پاریس یان لەندەن یاخود نیویۆرک، شوێنی ئەسینا -یان گرتووەتەوە. لەبەر ئەم هۆکارەیە ئێمە و یۆنانییەکان لەیەک سیفەتدا هاوبەشین: ڕابردویەکی شکۆدار و ئێستایەکی لاواز و ڕەقوتەق.

ئێمە تا ئێستا بۆ ڕابردوو دەگرین و شانازی بە باوباپیرانەوە دەکەین. لێرەوە و لەبەر ئەم هۆکارە، سەفەرکردنم بۆ پاریس، بە لەدایکبوونی دووەمی خۆمی دادەنێم: واتە لەدایکبوون بەسەر فیکر و ئازادی -دا. ژیان بێ فیکر و بێ ئازادی چ مانایەکی هەیە؟ ژیان چ مانایەکی هەیە، ئەگەر لەم ژیانەدا بە تەواوی ئازادی، هەموو شتێ تاقینەکەیتەوە؟ ئەو کات تواناکانی خۆت و سنورەکانی خۆتت بۆ دەردەکەوێت. ژیان چ مانایەکی هەیە، ئەگەر لەسایەی پابەندبوون بە نەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بە زیندویی خۆت لەگۆڕنا؟

کەواتە پێش ئەوەی بچمە ناو کاکڵەی بابەتەکەوە، پێمخۆشە هەندێ بیرەوەری شەخسی خۆم بگێڕمەوە. کاتێ لە بەرواری ١٩٧٦/١٠/٨ فڕۆکەخانەی دیمەشقم بەجێهێشت، باوەڕم نەدەکرد من دەڕۆم بۆ پاریس، پایتەختی ڕوناکی و شارستانییەت، ئەدەب و هونەر، جوانی و عەشق، سینەما و شانۆ... هتد. من وەک بەشی هەرە زۆری خەڵکی، سەر بە ژینگەیەکی نەریتخوازی کۆنزەرڤاتیف بووم. کاتێ تەمەنت دەگاتە تەنها

٢٥ ساڵ، ئەوا هەستدەکەیت پێویستت بە ئازادی و کرانەوە هەیە، پێویستت بە شکاندنی ئەو کۆتوبەندانەیە کە دەستیان گرتویت. تۆ وەک ئەو باڵندە کۆچەریەت لێدێ کە بۆ یەکەمجار لە هێلانەکەیەوە دەفرێت و دێتەدەرەوە. بۆ ئەو مەبەستە چ ژینگەیەک لە پاریس گونجاوتر بوو؟

فەرەنسا لەوسەردەمەدا لە ترۆپکی شارستانییەتەکەیدا بوو، تا هەنوکەش هەر وایە. شارستانیەتی فەرەنسی تابڵێی نایاب و شکۆدارە. ئازادییە تاکە کەسییەکان (بەتایبەتی ئازادی بەیەکگەیشتنی نێوان نێر و مێ)، پێگەیەکی سەرەکی لەو شارستانییەتەدا داگیرکردووە. ئاشکرایە ئەم بابەتە، بەلای ئێمەی خوێندکارە عەرەبەکانەوە کە نێردرابوین بۆ دەرەوە، لە پێشەوەی هەموو بابەتەکانی دیکە بوو، هەمووەمانی سەرقاڵ کردبوو. پێویستە بە ڕاشکاوانە دانیپێدابنێن: لەو ڕۆژگارەدا ئەگەر لە سوریا یان لە تەواوی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا، بمایتایەتەوە، ئەوا لە تواناتا نەبوو لە خودی خۆت و گرێ ناوەکییەکانت و کێشەکانت ڕزگارت ببێت. پێویست بوو بڕۆیت بۆ ئەوروپا، تاکو هەموو ڕەهەندەکانت بکرێنەوە، تاکو حاڵی خۆت تاقیبکەیتەوە، تاکو خۆت فڕێدەیتە ناو موغامەرەیەکی داهێنەرانەی نادیارەوە.

ئالێرەدا ڕووبەڕووی کێشەی ئازادی دەبینەوە، بەڵی ئازادی بە تەواوی مانای وشەکە. ڕاستە دەکرێ ئازادی بە شێوەیەکی هەڵە بەکاربهێنرێت، ئەوەش ڕاستە خودی خۆرئاوا بەو هەڵەیەدا ڕۆشتووە و تێیدا گەشتووەتە دوا سنوری پەڕگیری، بگرە گەشتووەتە دوا سنوری تاریکی، دوا سنوری ئیباحیەتی ڕەها و پێشێلکردنی هەموو حەرام و قەدەغەکراوەکان. بەڵام ئێمە لە وڵاتانی خۆماندا، بەئاراستەی پێچەوانەدا ڕۆشتین، واتە کەبتکردن و سەرکوتکردن، بێگومان تاکو دواسنوری کەبت و سەرکەوتکردن. پەڕگیری و پەڕگێری پێچەوانە. وەلێ ناتەواوییەکانی خۆرئاوا یان لادانە شارستانیەتەکەی، هەر هەمووی شتگەلێکبوون، دەرکم پێنەکردبوون، تەنها دوای چەندین ساڵ ژیان لەفەرەنسا نەبێت، لەوێ بۆمدەرکەوت و هەستم پێکرد. پێویستە لەوە تێبگەین خۆرئاوا ئاڵۆزە و شارستانییەتەکەی هێجگار زل و فراوانە و لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی چوار سەدەی یەک لەدوای یەک بەرهەمهاتووە.

لێرەوە بۆ تێگەشتن و دەرککردن بە ڕەهەندەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا، تەنها ساڵێک یان دوو ساڵ یاخود پێنج ساڵت بەس نییە. بۆ ئەوەی بەڕاستی لە خۆرئاوا و شارستانییەتەکەی تێبگەیت، لانی کەم پێویستت بە دە ساڵ یان بیست ساڵ یاخود سی ساڵ هەیە. بەڵێ هەندێ شت هەبوو، تەنها دوای بەسەربردنی سی ساڵی بەردەوام، لێیان تێگەشتم. شارستانییەتی خۆرئاوا، لەسەرەتادا بە جوانی و تیشکەکەی و قەشەنگییەکەی، سەرسامت دەکات. بە تەواوی دوچاری شۆکت دەکات و گێژت دەکات. ئیدی لەو ساتەوەختەوە، زەمەنێکی دووروودرێژت دەوێ، تاکو لە پشت ئەو هەموو ڕوناکییە پرشنگدارەوە، ناتەواوییەکانی ببینی. زەمەنێکی دووروودرێژت پێویستە تاکو لە مەسەلەکان تێبگەیت و شتەکان لێکجیابکەیتەوە. بەڵام خۆرئاوا هەر هەمووی ناتەواوی و لادان و ئیباحییەت نییە. خۆرئاوا جگە لەوە، خاوەنی داهێنانە مەعریفییەکان و فەلسەفە ڕۆشنگەرەکەیەتی کە نمونەی دەگمەنە. ئەوەش ئەو شتەیە کە لێرەدا لای من گرنگە و بە پلەی

یەکەم هەڵوەستەیەکی لەسەر دەکەم. هەرچی قسەکردنە لەسەر لادانەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا و دووڕوییەکەی و ئەنانیەتەکەی و خیانەتەکانی لە پرنسیپەکانی ڕۆشنگەری/هیومانستی، ئەوا پێویستی بە هەڵوەستەیەکی تایبەتە. ناتوانم بە یەکجار هەمو شتێک بکەم!

دواتر من لەو بڕوایەدا نەبووم، دەتوانم ئەم زمانە بیانییە فێرببم کە ئاسۆ فراوانەکانی بۆ دەکردمەوە: کردنەوەی دەرگای ئاسۆی ئەدەب و فیکر بەسەر هەردوو تاکەکەیدا. ڕاستە منیش وەک هەموو ئەو گەنجانەی کە لە کۆمەڵگایەکی نەریتخوازی کەبتکراودا ژیابن، کۆمەڵگایەک پڕبێت لە حەرام قەدەغەکراوەکان، شەیدای ئەوەبووم ئارەزووە شەخسییەکانم تێربکەم. بەڵام لە هەمانکاتدا شەیدا و پەرۆش و برسی فیکر -یش بووم. دەمویست لە هەموو شتێک تێبگەم، پەی بە نهێنی شتەکان بەرم. لە ڕاستیدا دۆزینەوەی جوانییەکانی ژیان و ئاشکراکردنی پێچوپەناکانی فیکر، هەردووکیان لە دەرونێکی ڕەسەنەوە هەڵقوڵابوون. حەزێکی گەورەم هەبوو بۆ مەعریفە، برسییەتیەکی بێ سنورم هەبوو بۆ مەعریفە و ئازادی کە باوەڕی پێناکرێت. دەمویست لە هەموو جیهان تێبگەم، بەتایبەتی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی کە سەر بەو جیهانە بووم. من تەواو لەوە دڵنیابووم، ناتوانم لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامی تێبگەم، ئەگەر لێی دوورنەکەومەوە، بگرە ئەگەر لێی جیانەبمەوە. ئائەوەیە باجی مەعریفە، باجی ئازادی.

بۆ ئەوەی نزیکبیتەوە، پێویستە دوور بکەویتەوە. بۆ ئەوەی تازەببیتەوە، پێویستە ئاوارەبیت. بۆ ئەوەی لە حاڵی خۆت بگەیت، دەبێ لە حاڵی خۆت بێیتەدەرەوە. ئەبو تەمام ڕاستدەکات. تۆ چۆن دەتوانی خۆت تازە بکەیتەوە، ئەگەر لە سوریا


برتراند راسل

یان لە جیهانی عەرەبی یاخود لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بمێنیتەوە؟ مەحاڵە. تۆ پێویستیت بە ئاسمانێکی دیکە هەبوو، جگە لە ئاسمانی لاهوتی سەدەکانی ناوەڕاست. من بەمانای تەواوی وشە و تاکو دوا سنور ئاوارە بووم و هەموو چرکەساتە جوانەکانی ژیانیشم لە مەنفادا بردووەتەسەر و تا ئێستاش هەروام. ئەگەرچی دانیشتنی ئێستام لە مەغریب، وەک مەنفایەک نابینم، چونکە لە هەموو لایەکەوە کەشوهەوایەکی ئیسلامی خۆش و دڵگیر دەورەی داویت و میللەتەکەشی میللەتی تۆیە. ئەمە سەرەڕای ئەو ئاسانکارییانەی مۆدێرنە هێناویێتییە ئاراوە. بەڵام ئاخۆ تێربووم لە ئازادی؟ ئایا لێی بێزاربووم؟ لەو بڕوایەدا نیم.

من ئەوەندە پەرۆشی خوێندنەوەی شاکارە ئەدەبییەکانی فەرەنسا بووم، نەمدەتوانی چاوەڕێی ئەوە بکەم بە جوانی فێری زمانی فەرەنسی ببم، تاکو گەنجینە ئەدەبییەکەی بخوێنمەوە، وەک (مـەدام بـۆڤـاری) فلۆبێر، (سـوور و ڕەش)ی ستندال، (گوڵە شلێرەکانی دۆڵەکە)ی بەلزاک... هتد. ئەی چی لەسەر گوڵە بەدەکانی بۆدلێر یان ئیشراقاتی ڕامبۆ یان بەرهەمەکانی فیکتۆر هیگۆ... هتد بڵێم. من لە دڵی خۆمدا بە خۆمم دەوت: خێراکە، خێراکە فێری زمانی فەرەنسی ببە، تاکو بتوانیت ئەو هەموو شاکارە قوتبدەیت. ئەی چار چییە؟ چونکە ناتوانی زمانێکی گەورەی ئەدەبی، لە شەوورۆژێکدا بە باشی فێرببیت. دەتـوانـی فـێـری زمـانـی ڕۆژانـــە ببیت و ئیشوکارەکانی خۆتی پێ ڕایبکەیت، بەڵام فێربوونی زمانی شاکارە ئەدەبییەکان کاتی دەوێـت. لەبەر ئەوە دەستمکرد بە کڕینی ئەو ڕۆمان و کتێبانە لە چاپە کورت و ئاسانەکەیدا و پێم سەیربوو کە دەستم دەکەوێت. لە ئەورووپا هەموو شتێک دەستدەکەوێت، بە پێچەوانەی کۆمەڵگاکانی ئێمە کە تا ئێستاش لە سەرەتای گەشەکردن و پێشکەوتنیدایە.

مادام ناتوانم ئەو ڕۆمانانە بە زمانە ڕەسەن و نایابەکەیان بخوێنمەوە، بۆچی فێڵ لە مەسەلەکە



نـەکـەم و لـە نوسخە کـورت و ئاسانەکەیدا نەیانخوێنمەوە؟ تا ئەو کاتەی بە باشی فێری زمانی فەرەنسی دەبم، هیچ چارەسەرێکی دیکە نەبوو، جگە لەوەی ئەو نوسخە کورت و ئاسانانە نەبێت. سەبارەت بە لێکچەرەکانی محەمەد ئارکۆن دەربارەی فیکری ئیسلامی لە زانکۆی سۆربۆن، هەمان شتم ئەنجامدا. لە ساڵانی سـەرەتـادا، بەهۆی نەزانینی زمانەوە، زۆر شتمان لەکیسچوو. دوای ئەوە وردە وردە وامان لێهات بە باشی لە زمانی فەرەنسی تێبگەین. بەڵێ زانینی زمانێکی بیانی بە شێوەیەکی زۆربـاش، کارێکی هـەروا ئاسان نییە. مەبەستم لە زۆرباش، ئەوەیە بتوانی لە فەیلەسوفەکانی تێبگەیت و چێژ لە دیوانی شاعیرەکانی ببینیت. نەک تەنها لە ژیانی ڕۆژانەدا قسەی پێبکەیت. ئای من چەند پەرۆشی ئەوە بـووم ستندال و فلۆبێر و بۆدلێر و ڤۆڵتێر و بەلزاک و جان جاک رۆسۆ و دەیانی دیکە، بە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیان بخوێنمەوە!. من ئەو کاتەی هێشتا هەر لە سوریا بووم و نەڕۆشتبوومە دەرەوە، چەند خەونم بەوەوە دەبینی!. ئەوە وەک خەوێکی ئەفسانەیی وابوو باوەڕ نەدەکرا بێتەدی. کاتێ فڕۆکەکە بەسەر فەرەنسادا دەیبردین، من لە پەنجەرەیەکی بچوکەوە، تەماشای خوارەوەم کردو هاوارم کرد: ئای خودایە! ئەم وڵاتە چەند جوانە! ئەمە بەهەشتی خوایە لەسەر زەوی. بە چرپە بەخۆمم وت: هیچ نەماوە تەنها حۆرییە چاو شینەکان نەبێت! لەو بەرزاییەوە تەنها ڕووبەرە سەوزاییەکانت دەبینی، تەنها باخچە ڕێکوپێکەکانت دەبینی کە دەورەی خانووە قرمیدییە سوورەکانیان دابوو. تا چاو بڕکات فەرەنسا فەرشێکی گژوگیای سەوز بوو، وڵات هەر هەمووی یەک باخچە بوو: دارستان و داروەدرەخت، ئاو و دەریاچەکان.

من ئەوە دەڵێم، گەرچی ئێمە لە یەکێک لە وشکترین هاوینەکانی مێژوی فەرەنسادا گەیشتینە ئەوێ، هاوینی ساڵی ١٩٧٦. کاتێ گەشتمە پاریس، لە دڵی خۆمدا وتم: مەعقول نییە لە هەمان ئەو شارەدا بژیم کە جان پۆل سارتەری تێدا دەژی! ئەو کات سارتەر هێشتا کۆچی دوایی نەکردبوو. ئەو دوای چوار ساڵ کۆچی دوایی کرد، واتە لە ساڵی ١٩٨٠. سارتەر بەهۆی تەرجەمەکردنی بەرهەمەکانی لـەلایـەن (دار الاداب)ەوە، ناوبانگێکی زۆری پەیداکردبوو. من دوای ئەوەی ڕۆمانە نایابەکەی ڕۆماننوس «سهیل ادریس»م خوێندبووەوە، حەزم دەکرد (گەڕەکی لاتینی - الحی اللاتینی) ببینم کە ڕۆمانەکەی «سهیل ادریس» هەمان ناونیشانی هـەبـوو. بێگومان من ئـەو ڕۆمـانـەم لە سوریا خوێندبووەوە و خەونم بە هەمان سەرکێشییەکانی ناو ڕۆمانەکەوە دەبینی. وابزانم پاڵەوانی ڕۆمانەکە ناوی خانم «جانین» بوو , بە کورتیەکەی: من خەونم بە جانین -ێکی دیکـەوە دەبینی. من بەڕاستی هەستمدەکرد سەرلەنوێ لەدایکدەبمەوە، ئەوەتا من لە ناوجەرگەی جیهاندام، منێک کە لە گوندێکی بچکۆلانەی پەراوێز و دوورە دەستی ناو مێژووەوە هاتبووم. بگرە دوای ئەوەی بۆ ماوەی دوو ساڵ لە پاریس مامەوە و پاشان گەڕامەوە بۆ دیمەشق، دیمەشق وەک گوندێکی گەورە یان وەک (وێرانەیەک) هاتەبەرچاوم. ئەوە هەستێکی تابڵێی سەیربوو کە هەرگیز لەبیرمناچێتەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: مەعقول نییە! ئا ئەمە دیمەشقە مەزنەکەیە؟ لە هەموو ژیانمدا ئاوا نەمبینیبوو. هەستم بـە خـەمێکی قـووڵ کـرد، هەستم بە دڵتەنگی و ناخۆشییەکی زۆر کرد. پاشان تیۆرەی

ڕێژەگەرایم بیرکەوتەوە و لەو کاتەدا بۆمدەرکەوت بەڕاستی شتەکان ڕێژەیین. بۆ یەکەمجار لە تیۆرەی ڕێژەگەرایی ئەنشتاین تێگەشتم.!

من کاتێ لە گوندە بچوکەکەی خۆمەوە یان لە جەبلە و لازقییەوە دەڕۆشتم بۆ دیمەشق، ئەوا وەک شارێکی گەورە و فراوان دەمبینی، وەک پایتەختێکی مەزن و ڕاستەقینە دەمبینی. وەلێ کاتێ لە پایتەختێکی گەورەتر و فراوانترەوە بۆی گەڕامەوە، بینیم هیچ نییە. دەستم لێهەڵگرت و پشتگوێمخست. لە ڕاستیدا ئەو هەستە، لەوکاتەدا دوچاری شۆکی کردم، بگرە زۆر بە توندی ڕاپچڵەکاندم. دواتر لەسەر ئەم مەسەلەیە قسەم لەگەڵ هەندێ لە برادەران کرد، کەچی ئەوان دایانە قاقای پێکەنین و پێیان وتم: بڕۆ بۆ نیۆیۆرک و دوو ساڵ یان سێ ساڵ تێیدا بژی، پاشان بگەڕێرەوە بۆ پاریس، هەستدەکەیت پاریس گوندێکی بچوکە. بەڵێ برادەر هەموو شتێ لەم جیهانەدا ڕێژەییە.

گرنگ ئەوەیە کاتێ گەشتمە پاریس، وەک ئەوەی تەپوتۆزی خۆرهەڵاتم لە جەستەی خۆم تەکاندبێت، دەستمکرد بە ژیانی سەرکێشی ڕاستەقینە. چەند خۆشە دەستپێبکەیت! چەند قەشەنگە ئازادی! چەند جوانە دۆزینەوەی نادیارەکان! نە کەس دەناسی و نە کەس دەتناسێت. شارێکی تابڵێی قەبە و زلە و فیل تێیدا بزردەبێت! ئا ئەوە پاریس بوو. نە چاودێری کەس دەکەیت و نە کەس چاودێریت دەکات. ئا ئەمەیە ئازادی. کەس گرنگی و بایەخ تەنانەت بە بوونیشت نادات. کێ دەتوانێ گرنگی و بایەخ بە دە ملیۆن کەس یان زیاتر بدات کە لە دەوروبەریدایە. سەرەڕای هەموو ئەوانە، لێرە ئازادی تاکەکەس پیرۆزە.

هەر بۆیە کەس دەستناخاتە ناو کاروباری کەسانی دیکەوە. ئەو کات من هەر ئەوەندەم دەویست. زەحمەتە وەسفی هەموو ئەو هەست و سۆز و گێنگڵە ناوەکیانەم بکەم کە لەو ڕۆژگارەدا دایانگرتبووم. پێموابوو ئەم بەختە وەک موعجیزەیەکی ڕاستەقینە وابوو. هەمو بەیانییەک کە لە خەو هەڵدەسام دەمگوت: تۆ بڵێی من بەڕاستی لە فەرەنسا بم؟ لە پاریس بم؟ ئایا ڕاستە من لە کێشەکانی سوریا و عەرەبەوە دوورم؟ ئایا ڕاستە من خۆرهەڵاتم بەجێهێشتووە کە چەندین سەدەیە شارستانییەت بەجێیهێشتووە و بووە بە وێرانەیەکی ڕەش و سپی؟ ئایا ڕاستە من ئێستا لە ناوجەرگەی شارستانییەتم؟ من بە هەموو خۆپەرستییەکەوە چێژم لەوە وەردەگرت و بە خۆمم دەگوت: تۆ ئێستا لە ئەوروپایت، لانەی شارستانیەت، ئەو ئەوروپایەی ڕۆح تێیدا نیشتەجێیە وەک ئەوەی هیگڵ وتویەتی: واتە رۆحی فیکر و شنەبای ئازادی. تۆ بڵێی ڕاستبێت لە وڵاتی فەلسەفە و فەیلەسوفاندا بم؟ ئایا دەچێتە عەقڵەوە لە وڵاتی ناودارەکاندابم: وڵاتی برجێت باردۆ و کاترین دونیف، ئالان دیلۆن و رۆمی شنیدر و ئیف مۆنتان... هتد.

هونەر لای من گرنگی خۆی هەبوو، نەک تەنها فیکر و توێژینەوەی ئەکادیمی، هونەر تا ئێستاش ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانمدا دەگێڕێت. هونەر و خۆشەویستی، گۆرانی و سینەما. ئێستاش کاتێ گوێ لە گۆرانی (گەڵا وەریوەکان – الاوراق الذابلە) بە دەنگی ئیف مۆنتان دەگرم، خەریکە ڕۆحم دەردەچێت (٤). چونکە لە ڕاستیدا من لە میانەی ئەدەب و شیعرەوە بەرەو


تەها حسێن


ئیبن سینا

فیکر هاتم، نەک بە پێچەوانەوە. من خەونم بەوەوە دەبینی ببم بە شاعیر نەک بیرمەند. لە ژیانمدا هەرگیز فیکرێکم خۆشنەویستووە وشکبێت و دابڕابێت لە ڕۆحی ئەدەب و لە شیلەی ژیان. ئەم (زانستە وشک و نامرۆڤانەیە) وەک ڕۆجێ گارودی دەڵێ، بایەخێکی ئەوتۆم پێنەداوە و بەلامەوە گرنگ نەبووە. لەبەرئەوە نزیکترین بیرمەندەکان لە منەوە، ئەوانە بوون کە فیکر و ئەدەب -یان پێکەوە کۆکردبوەوە. لە نمونەی جاحز، تەوحیدی، مەعەری، تەها حسێن، میخائیل نعیمە، جەبران و ئەوانی دیکە. ئاشکرایە بە «تەوحیدی» دەوترا ئەدیبی فەیلەسوفەکان و فەیلەسوفی ئەدیبەکان، بە «مەعەری» دەوترا شاعیری فەیلەسوفەکان و فەیلەسوفی شاعیرەکان. وەلێ لە سەرەتادا خەمی فیکر، وەک پێداویستییەکی زۆر گەورە خۆی سەپاند بەسەرمدا.

من لە پاریس لە خۆم دەپرسی: ئایا دەچێتە عەقڵەوە من لە وڵاتێکدام جورئەتی ئەوەی هەیە ڕەخنە لە لاهوتی ئاینی موقەدەس بگرێت، بگرە بە تەواوی لە چوارچێوەکەی بچێتە دەرەوە، بێ ئەوەی ئاسمان چەسپی زەوی بێت؟ ئایا مەعقولە من لە وڵاتێکدام بوێری ئەوەی تێدایە پرسیاری ڕەخنەگرانە لەسەر پیرۆزترین پیرۆزییەکان دەکات؟ ئالێرەدا خوێندنەوەی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری و ئەوانەی دوای ئەوان هاتن، ڕوداوێکی سەرەکی بوو لە ژیانمدا. مەسەلەکە سەبارەت بە ئارکۆن و وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بۆ عەرەبی، دەچێتە هەمان خانەوە. هەندێ دەستپێکردنی سەخت هەبوو، بەزۆر خۆی بەسەر مندا سەپاند.



پێش چوار سەدە لەمەوبەر. بگرە سەبارەت بە تێگەشتنمان لە ئاین یان سەبارەت بە شیکردنەوەمان بۆ ئاین، هێشتا قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست -مان تێنەپەڕاندووە. لێرەوە ئێمە هێشتا نەگەشتوین بە ئاستی قۆناغی سەردەمی ڕێنیسانسی ئەوروپی! هەی هوو ئەوە هێشتا لە کوێیەتی! لەم لایەنەوە هیچ بەراورد و پێوانەیەک لەنێوان فیکری ئەوروپی و فیکری عەرەبیدا نییە.

من ئەوەم لە فەرەنسا بۆ دەرکەوت و بە دەست دەستم لێدا. ئالێرەدا ئەو ڕۆشنایییە پرشنگدارە دەردەکەوێت کە ڕێگای بۆ ڕۆشنکردمەوە و یارمەتیدام کێشە و خەمەکانم چارەسەر بکەم کە لە سوریاوە هەڵمگرتبوون و باری سەرشانمی قورسکردبوو. لەم لایەنەوە، کەلتوری فەرەنسی و بەشێوەیەکی گشتی کەلتوری ئەوروپی، چاکەیەکی زۆریان لەسەر من هەیە. ئەوە ئەوان بوون منیان دروستکرد، ئەمە لەلایەکەوە. بەڵام لە لایەکی دیکەوە، هەموو ئەوەی لە ماوەی سی ساڵی رابردودا ئەنجاممداوە (کتێبەکان و وەرگێڕانەکان)، هیچ نەبوو تەنها پێشبینییەک نەبێت بۆ ئەو تەقینەوە گەورەیەی ئەمڕۆ لە سوریادا ڕوودەدات. من دەمزانی ئەم چرکەساتە هەر دەبێ بێت، بۆیە دەستم لەسەر دڵم بوو..

٢ - دواهەمین کتێبێک کە خوێندبێتمەوە یان بەشێکی زۆریم خوێندبێتەوە، بریتییە لە فەرهەنگە فەلسەفییەکەی ڤۆڵتێر. بەڵام پێش ئەو کتێبە، کتێبەکەی «ڕیمۆن ترۆسۆن»م سەبارەت بە ژیانی

### پەراوێزەکان

١ - هەندێجار پیمخۆشە مەسەلەکان بەم شێوەیەی خوارەوە باس بکەم: نێوان دیمەشق و پاریس بە فڕۆکە چوار سەعاتە، بەڵام لە حسابی زەمەن و گەشەی مێژویی، چوار سەدەیە! لەوانەیە ئەم مەسەلەیە هەنووکە ڕاست نەبێت، بەتایبەتی سەبارەت بە ژیانی ڕۆژانە یان سەبارەت بە بەرخۆری مادیی، ئەمەش دوای ئەوەی جیهانگیری کۆمپانیاکانی و مۆڵ و سۆپەرمارکێتە مۆدێرنەکانی، بە هەرچوارلای جیهاندا بڵاوکردووەتەوە. بەڵام سەبارەت بە لایەنی ژیانی عەقڵی یان ئاینی، تەواو ڕاستە. ئێمە تا ئێستا قۆناغی هۆشیاری ئەوروپی مەسیحی سەردەمی ڕێنیسانس -مان جێنەهێشتووە: واتە

جان جاك رۆسۆ خوێندەوە. بەسەرهاتی من و رۆسۆ سەیرە! من دەیان کتێبم لەبارەی رۆسۆوە خوێندووەتەوە و لە هەموو بیرمەندەکانی دیکەی جیهان، زیاترم خۆشدەوێت. بگرە بە درێژایی نیو سەدە و تاکو ئێستاش، بە هەموو هەست و سۆز و ئەندێشەکانمەوە لەگەڵیدا دەژیم. کەچی تا هەنوکە تەنها بڕێکی زۆر کەمم لەسەر نوسیوە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە، من دوژمنە سەرسەختەکەیم خۆشناوێت، واتە ڤۆڵتێر! بگرە بە پێچەوانەوە، خوێندنەوەی ڤۆڵتێر یەکێکە لە خۆشییەکانم و شتە جوانەکانی ژیانم.

٣ - ئیسلام لە خۆرئاوا، قورتوبە پایتەختی رۆح و فیکر. لە بڵاوکراوەکانی لارماتان، پاریس ٢٠٠٠، لێرەدا سەرنجی خوێنەر بۆ کتێبێکی رۆجێ گارودی ڕادەکێشم کە بەم دوایانە کۆچی دوایی کرد: L Islam en Occiden- Cordoue capitale de Iesprit.L Harmattan: Roger Garaudy

٤ - من ئەمە دەڵێم، بەتایبەتی کاتێ لە هۆڵی ئۆلۆمپیای بەناوبانگ کە پڕە لە هەوادارنی کچ و کوڕ، گۆرانی دەڵێت. ئەوە هەمان هۆڵە فەیروز و ئوم کەلسوم لە کاتی هاتنیان بۆ پاریس، گۆرانییان تێدا وتووە. ئا لەو ساتەوەختەدا وەک ئەوە وایە تۆ دابڕانی خۆشەویستی بە هەموو ناسۆرییەکانییەوە بژیت. ئەو گۆرانیبێژە لەو چرکەساتەدا، لە تەوقی سەریەوە تاکو بنی پێی، وەک هونەرمەندێک دەردەکەوێت. خۆشەویستی چۆن و بە چ شێوەیەک، کۆتاییپێهات و وەک گەڵای وەریوی وەرزی پایز هەڵوەری و سیس بوو؟. چۆن گەرموگوڕی عەشق تێکشکا و عاشقەکانیش جیابوونەوە؟ چۆن دەتوانین ئەوە لەبیربکەین کە لەبیرناکرێت: پارچەیەک لە دڵمان، لە ژیانمان، لە تەمەنمان؟ ئەوەڵ و ئاخیر خۆشەویستیمان، بەڵێ ئەوە ترۆپکی هونەرە! شیعرەکە هی «جاك پرێڤەر»ە کە تاڕادەیەک لە نزار قەبانی لای خۆمان دەچێت. هەر خوێنەرێک فەرەنسی بزانێت، زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە، گوێ لەم گۆرانییە بگرێت. من زۆرجار واز لە توێژینەوە و وەرگێرانە تاقەتپڕوکێنەرەکانم دێنم، تاکو گوێی لێبگرم و ئاهێکم بە بەردابێتەوە و باری قورسی سەفەرم سوکبکەم.

هەروەها گوێ لە گۆرانییەکی دیکەش دەگرم کە لە لایەنی ناوبانگەوە، هیچ لەو گۆرانییەی تر کەمتر نییە، گۆرانی (جێم مەهێڵە - لاتترکنی)ی گۆرانیبێژ جاك بریل. ئەوەش گۆرانیەکی جوانی ناوازەیە و هەلا هەلات دەکات. ئەگەر شەو هات و من بە تەنها بووم، ئەوا ناتوانم گوێ لەو دوو گۆرانییە بگرم. ئەوە زۆر لەسەرو توانای مندایە بەرگەی بگرم. بیرەوەریەکان داگیرت دەکەن و تەواو دەتوروژێنن.

مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، هەردوو گۆرانییەکە، باس لە سەختی دابڕان دەکەن لەگەڵ ڕابردوو، لەگەڵ ئەو عەشقەی تێپەڕیوە. لە چەند وتارێکمدا قسەم لەسەر کێشەی پەیوەندی نێوان دابڕانی خۆشەویستی و دابڕانی فیکری ئەبستمۆلۆجی کردووە و ئەم پرسیارەم خستووەتەڕوو: ئایا دەکرێ لە نێوانیاندا بەراورد بکرێت؟ ئای دابڕانی خۆشەویستی چەند سەخت و تاڵە! بەڵام دابڕانی فیکریش زۆر سەختە. واتە چۆن دەکرێ دەستبەرداری ئایدۆلۆژیایەک بین کە ساڵانێک لەسەری ژیاوین و بگوازینەوە بۆ ئایدۆلۆژیایەکی دیکە؟ هەروەها چۆن دەکرێ لە خۆشەویستییەکی

ڕابــردووەوە بگوێزینەوە بۆ خۆشەویستییەکی داهاتوو؟ ئایا ئازارەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا یەک نییە؟ ماڵئاوایی چەند سەختە! لێکدابڕان چەند تاڵە!

بەڵام لەبەرامبەردا، گۆڕانکاری و هێنانی ژنی تازە چەند خۆشە! بە خوا بێزاربوین و ڕۆحمان دەرهات. خەریکە دەڵێم: (خیانەت) و دابڕانی ئەپستمۆلۆجی چەند جوانن! ئاخۆ کەی (کیژۆڵەیەکی خنجیلانە) دێت تاکو ژیانمان سەروبن بکات؟ وەک دەبینن من بە مەبەست ئەو قسانە دەکەم، بۆ ئەوەی کێشەکە تاکو دوا سنور ڕوونبکەمەوە. بیستم دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت، هـەنـدێ لـە کۆمۆنیستەکان خۆیانکوشت. ئەوان چیتر بەلایانەوە ئاسان نەبوو، دوای کەوتنی نمونە باڵاکەیان کە بەدرێژایی گەنجیان و تەواوی ژیانیان، لەسەری ڕاهاتبوون، بژین. هەندێک لەوانە تەمەنیان لەسەرو شەست یان حەفتا ساڵەوە بوو. بەڵام هەندێکی دیکەیان خۆیان لەگەڵ بارودۆخە تازەکەدا گونجان و بۆ نموونە بوون بە سۆشیالیزمی دیموکراسی. بگرە هەندێکیان وەک قەرەبوکردنەوەی لەدەستدانی کۆمۆنیزم، پەیوەندییان بە ئایدۆلۆژیا ئاینییەکانەوە کرد. هەر کەسە و بەشوێن مانایەکدا دەگـەڕێ ژیانی پڕ بکات. خۆشەویستیش هەمان شتە، تەنها خۆشەویستی دووەم خۆشەویستی یەکەمت لەبیردەباتەوە، ئاسن بە ئاسن دەکوترێ! دیسانەوە لێرەشدا بە خراپی قسە دەکەم، بەڵام ئەوە حەقیقەتە. خۆشەویستی، وەک بونیادێکی بنچینەیی وایە و بەردەوامدەبێت، تەنها وێنەی خۆشەویستەکە دەگۆڕێ کە خەیاڵی داگیرکردویت. (بەڵام هەموو ئەوانەی پێش تۆ خۆشمویستن، خۆشیان نەویستم) ئای بەدر شاکر سەیاب چەند داماوبوو.

**سەرچاوە:**

الاوان، ١٢ تشرینی دووەم، ٢٠١٢

# هێرمێنۆتیك له‌ سه‌ره‌تاوه‌ تا ئێستا

نووسینی: د. بهرام مقدادی
و. له فارسییەوە: بابەک سەحرانەوەرد

هێرمێنۆتیک یان تەئویل (Hermeneutics)، وشەیەکی بە رەگـەز یۆنانی لە«هێرمینا» کە ناوی«هێرمێس» بووە، وەرگیراوە. «هێرمێس»، لە کلتووری ئەفسانەی یۆنان بە پەیامنێری خواکان پێناسە کراوە. هێرمێس خوایەک بوو کە بێجگە لە پەیامنێری، بۆ یەکەم جار زمان و گوتاری داهێناوە و راڤەگەریش بووە. هێرمێنۆتیک دەشێ بە رێبازێکی زۆر کۆن بزانیین کە سەرچاوەکەی ئەگەرێتەوە بۆ بڕوابون بە پیرۆزی دەق و لەڕاستیدا دەلالەت لە پیرۆزی دەق ئەکات. هێرمێنۆتیک، زانستی لێکۆڵینەوەی بنەما سەرەکیەکانی راڤەکردنی دەقە پیرۆزەکانە. بە درێژایی مێژوو، مەبەست و ئامانجی یەهود و مەسیحیەکان لەم زاراوەیـە، دۆزینەوەی هەقیقەت و بەها شاراوەکانی ناو کتێبی پیرۆزە. لەم هێرمێنۆتیکە نەریتی و دێرینەیە، چوار چەشنی سەرەکی راڤەکردم دێتە گۆڕێ کە بریتیین لە: ئەدەبی، ئاکاری، تەمسیلی (تەعبیری) و عیرفانی.

هاوکات لەگەڵ بەرهەمەکانی ئاگۆستین قەدیس، هێرمێنۆتیک وەک «زانستی راڤەکردن» هاتۆتە ئارا. لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا نە تەنها وتەی ئاینی، بەڵکوو سەرجەم زانست و فەلسەفە رەنگ و ڕووی راڤەکردنیان بە خۆوە گرتبوو، هەتا ئەو رادەیەی کە ژمارەیەک لە فەیلەسووف و نووسەران، ناچاربوون هەندێک تەفسیر بۆ نووسین و بەرهەمەکانی خۆیان بکەن. راڤەکردنی دەق وەک هەوڵێکە بۆ چونە ناو ئاسۆی مانای رەسەنی دەقەوە. هەرچەند تەنها لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە بوو کە چەندین کێشەی ئاڵوز و قووڵی لێ کەوتووەتەوە. بەڵام گرینگی ئاشکرای تەئویل بۆ رەخنەی ئەدەبی لە کاتێکدا خۆی بەرجەستە کردووە کە "رەخنەی نوێ" لە دەیەی ١٩٤٠ی زایینی بوو بە هێزێکی سەرەکی. وشەی هێرمێنۆتیک پتر لەم چاخەدا لە رەخنەی ئینگلیزی و ئەمەریکی هاتۆتە ئارا.

لە مێژە بۆ یەهودی، مەسیحی و هەروەها موسوڵمانان، مەسەلەی ڕاڤە و دۆزینەوەی مانا وردەکانی کتێبە ئاسمانیەکان هاتۆتە ئاراوە. ئاخۆ مانای ڕاستەقینەی کتێبی پیرۆز خۆ بەدەستەوە ئەدات؟ ئەگەر وەڵامی ئەم پرسە بە "بەڵێ"یە، کەواتە لەلایەن چ کەسێکەوە؟ ئاخۆ هەر کەسێک ئەتوانیت ئەمکارە بکات یان تەنیا مەرجەعەکانی کەنیسە؟ ئاخۆ مانای وشەگەل و حیکایەتەکانی کتێبی پیرۆز هەر ئەوەیە کە لە کتێبەکەدا هاتووە، یاخود مانایەکی دووهەم، نهێنی و تەعبیری هەیە؟

راڤەکردن لە هێرمێنۆتیکدا لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە کە دەق بە هەر چەشنێک بێت مانایەکی هەیە، چ ئێمە ئەو مانایە بناسین یان نا، ئەمەش بڕوایەکە بە "سەنتەریزمی ئاخاوتن". بەڵام لقێکی پڕ لە متمانە و ناوازە لە هێرمێنۆتیکی مۆدێرن کە لە دەیەی چل بە شێنەیی سەریهەڵدا، ئەم روانگەی سەنتەریزمی ئاخاوتنەی قەبوڵ نیە.

(هایدگەر)، (گادامێر) و(ریکۆڕ) لە بنەڕەتدا بڕوایان بە مانای کۆتایی و رەسەنی دەق نیە. گادامێر دەنووسێت: "مانای دەق هەمیشە بەرزترە لەو مانایەی کە نووسەر لە مێشکیدایە". لەبەر ئەم روانگەی گادامێر بوو کە دەرکەوت مانای دەق لەسەر رێژەیی بوون مسۆگەر و سەقامگیرە.

تەئویل، زانستی راڤەی دەقە و سەرەتاکەی ئەگەڕێتەوە بۆ بەرهەمەکانی پسپۆڕ و لێزانەکانی زانستی خواناسیی لە سەدەی شانزەیەمی ئەڵمانیا. ئەوان بۆ شرۆڤەی کتێبی پێرۆز پەنایان بۆ شێوازی تایبەت ئەبرد، هەتا بتوانن مانای هەقیقیی دەق بدۆزنەوە. لە سەدەی نۆزدهەم، (دیلتای) ئەم چەمکەی خستە خانەی زانستەوە، هەتا بتوانێت بە چەشنێکی هەمەلایەنتر و گشتگیرتر لە زانستە مرۆڤایەتییەکان بکۆڵێتەوە. دیلتای زۆرتر گرنگی بە تێگەیشتن لە دەق ئەدا، تا رونکردنەوە و تەفسیرکردنی. لەسەدەی بیستدا (مارتن هایدگەر) بە ڕوانگە فەلسەفییەکەی خۆی کاریگەری زۆر قووڵی لەسەر ئەم چەمکە دانا و لەم بوارەدا هزرڤانێکی دەسپێشخەرە. (هایدگەر) ئەیگوت هەلومەرجە زەمەنی و مێژوویەکانی خودی کەسی راڤەکەر، لە راڤەکردنی جیا نابێتەوە.

دوو نیگای سەرەکی و بنەڕەتی بۆ راڤەکردن بوونی هەیە: یەکەم، نیگا و ئاراستەی نەریتی. دووهەم نیگا و روانگەی (هانز جۆرج گادامێر)، کە لە ژێر کاریگەری (هایدگەر)دا بوو و لە چل ساڵ لەمەوبەر بووەتە پێشەنگ و سەرۆکی



هایدگەر

بیرۆکەی هێرمێنۆتیک. چەشنە نەریتییەکەی ڕاڤـەکـردن پشتی بە بەرهەمەکانی (شلایەر ماخێر) و (دیلتای)بەستووە. (شلایەر ماخێر) بەو هۆیەوە بە بونیادنەری هێرمێنۆتیکی نوێ ئەژمێرێت کە سەرەڕای هۆگرایەتی بۆ تەئویلی ناوەڕۆکی کتێبی پیرۆز، ئاسۆ و پانتایی ئەم چەمکەی بۆ دەرەوەی بـواری دینی ڕاکێشا، هەتاکوو بتوانێت ئەم گوتەزایە بە چەشنێکی گشتگیر و بەرفراوانتر لە تەئویلی دەقەکاندا بە کار بێنێت.

(شلایەر ماخێر) و (دیلتای) ئەڵمانی لە سەدەی نۆزدەهەم یەکەم کەسانێک بوون هێرمێنۆتیکیان وەک ڕاڤەکردن و تەفسیر بەشێوەیەکی گشتی ڕاگەیاند و لە پاوانی کتێبی پیرۆز ڕزگاریان کرد و ڕایانکێشا بۆ سەرجەم زانستەکان و بەتایبەتی زانستە مرۆییەکان. (شلایەر ماخێر) بڕوای وابوو بۆ گەیشتن بە مانای دروستی بەرهەمێکی کۆن، پێویستە ڕەخنەگەر سنووری ئێستا تێپەڕێنێت و خۆی بخاتە دۆخێکی زەینی کە بتوانێت خۆی لە ساتەوەختی نووسینی دەقەکە نزیک بکاتەوە. ڕەخنەگەر دەبێ زمانی دەق لە هەموو ڕویەکیەوە دەرکبـکـات و زەینییەتی نـووسـەر بـە باشی بناسێت، بۆ ئەوەی لە مانای بەرهەمەکە تێبگات.

(دیلتای) مەسەلەی هێرمێنۆتیک بە چەشنێکی هەمەکیتر دەربڕی و دەڵێت ئەرکی ئەم زانستە لە پلەی یەکەمدا، شیکردنەوەی فەلسەفی توانای تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی مرۆڤە.

بەر لە لێکدانەوەیەکی چڕ و پڕی هێرمێنۆتیک لە سەدەی بیستەمدا دەبێت ئاوڕ لە تیورەکانی دوو بیریاری مەزنی ئەم سەدەیە، واتە (هۆسێرل) و (هایدگەر) بدەینەوە.

(هۆسێرل) لەبەر ئـەوەی کە زەینییەتی سۆبجێکتی (بکەری شەخسی) لە مەبەست و قەست کردندا، بە هۆکاری سەرەکی دروستکردنی مانای ئەزانی، بڕوای وابوو کە مانا پێش زمان و سەربەخۆ لە زمان بونی هەیە و نووسەرەکەی لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا قەستی کردووە. بۆیە مانا، هەمیشە نەگۆڕ و دیاریکراوە. ئەرکی ڕەخنەگەر بە چەشنی گشتی نە لێکۆڵینەوەی دەقە، نە ڕوونکردنەوەی ژیانی شەخسی نووسەر و نە بارودۆخی مێژوویی دەقە، بەڵکوو ئاشنابوونی ڕاڤەکار لەگەڵ دەق بۆ گەیشتن بە مەبەستی دەقنووس بەسە.



ئێریك دۆناڵد هێرش

فەیلەسووفی دیکەی سەدەی بیستەم (مارتن هایدگەر) بوو کە تاکی مرۆیی لە جیهانی بابەتی بە جیاواز و سەربەخۆ نازانێت، واتە لە روانگەی هایدگەرەوە تاکی مرۆیی ناتوانێت (ئەو هێزەی نییە)، لە جیهانی دەرەکی بە سەربەخۆیی تێبگات، چونکە تێگەیشتنی مرۆیی، ماهیەتێکی "مێژوویی" هەیە. جیهانی دەرەکیش دەرئەنجامی تەئویلی زەینییە و شتەکان لە پەیوەندیدا بە ئامانجەکانی مرۆڤەوە مانا پەیدا ئەکەن. بوونی مرۆڤ زەمەنی و مێژووییە. بوونی مانا پێش زمان ئیمکانی نییە و هیچ مانایەک سەربەخۆ لە زمان بوونی نیە، بەڵکوو ئەمە زمانی (ئێستا)یە کە لە هەر کۆمەڵگایەک مانا و بوونی مێژوویی تاک پێکدێنێت.

(هانز جۆرج گادامێر) بیرمەندی هەرە مەزنی هێرمێنۆتیک لە چاخی ئەمرۆ، تەنها کەسێکە کە شوێن ئەندێشە و فەلسەفەی هایدگەر (مامۆستاکەی) کەوتبوو و وەک رێچکەشکێنێ لەم بوارە بووەتە بیرمەندێکی کاریگەر. (گادامێر) تەنیا هزرڤانێکە کە ئەم چەمکەی بۆ ئێمە شیکردوتەوە هەتا لە مەبەستەکەی باشتر بگەین و تیروانینەکانی لەلایەن زۆرێک لە بیریرانی ئەمرۆوە، قەبوڵکراوە. گادامێر بە پەیرەوی لە هایدگەر، گەیشتە تەفسیرێکی نوێ بۆ هێرمێنۆتیک کە دواتر رووبەرووی دژایەتی (هێرش) (هەروا کە ئاماژەی پێدەدەین) بۆوە. لە روانگەی (گادامێر) مانای دەق سەربەخۆ لە زیهنی نووسەر بوونی هەیە و هەندێکجاریش جیاوازە لێی. بە هۆی ئەوە کە زمان پێش مانا لە کۆمەڵگادا بوونی هەیە و دروستکەری مانایە. هەروەها زەینییەتی نووسەر بۆ ئێمە خۆبەدەستەوە نادات و رەنگە مەبەستێکی دیاریکراوەشی نەبێت یان خاوەن مەبەستی زۆر و جیاواز بێت. لێرەوە مانای دەق سەربەخۆ نییە و دەرئەنجامی هەلومەرجی میژوویی کاتی نووسینی بەرهەمە.

(گادامێر) بروای وابوو تێگەیشتن لە رابردوو بۆ ئێمە مومکین نییە، مەگەر لە رێگەی پەیوەندی بەستنی بە زەمەنی ئێستاوە. هەروەها بروای وابوو مانای نیشانەکانی ناو دەق، تەنیا بەهۆی جێگەیان لە زەمەنی هەنوکەدا قابیلی تەفسیرن. هەروەها بروای بە مەداری راڤەکردن لە تەفسیری

دەقدا هەبوو. بەپێی مەداری راڤەکردن ئەبێ بۆ تێگەیشتن لە بەش بگەڕێینەوە بۆ گشت و بۆ تێگەیشتن لە گشتیش بگەڕێینەوە بۆ بەش. (گادامێر) و (هایدگەر) هەردووکیان بڕوایان وابوو کە راڤەکار هیچ رێگایەکی بۆ دەربازبون لە "مەداری تەئویل" نییە و هەر جۆرە هەوڵێک بۆ دەربازبون لەم رەوتە، بە مانای ڕەتکردنەوەی ناوەرۆکی مێژوویی تاکەکەسە.

(ئێریک دۆناڵد هێرش)، کە دوای (گادامێر) رەنگە بە بەهێزترین بیریاری هاوچەرخی هێرمێنۆتیک ئەژمار بکرێت، تیورەکەی لەسەر بناغەیەکی نەریتی دامەزراندووە و بە تەواوی دژ بە روانگەی (گادامێر) وەستاوە. (هێرش) لەلایەکەوە هاوڕایە لەگەڵ تیورەکەی (هۆسێرل)دا کە دەڵێ مانا دیاریکراو و نەگۆڕە و لەلایەکیترەوە بە پەیڕەوی لە نەریتی (شلایەر ماخێر) و (دیلتای)، نووسەر بە سەرچاوە و کانگای مانا پێناسە دەکات و دەڵێ کە مانای دەق هەمیشە پایەدارە و بڕێ جاریش بە هیچ چەشنێک خۆی بەدەستەوە نادات. ئایا لەبەرئەوەی مانا بە دژواری بەدەست دێت و دەدۆزرێتەوە، ئیتر تەفسیرەکانی تر بۆ دەق هەڵەن؟ وەڵامی (هێرش) دیارە لێرەدا نێگەتیڤە. ئەگەر تەفسیرەکانی تر لە چوارچێوەی تایبەتی مانا جۆراوجۆرەکانی کە قەست و مەبەستی نووسەر بوون، بێنە ئارا، جێی متمانەن، بەڵام تەنها وەک دەلالەتەکانی بەرهەم قەبووڵ دەکرێن، نەک وەک مانای بەرهەم. واتە مانا نەگۆڕ و پایەدارە و دەلالەتەکانیش جیاوازن. (هێرش) مانای یەکەم لە مانای لە ناکاو بە بەرزتر ئەزانێت



هانز جۆرج گادامێر

و جیاوازی لەنیوان مانا و مەبەستدا ئەكات.
(هێرش) دەڵێت: مانا لە واقیعدا شتێكە خوێنەر لە خوێندنی دەق پەیدای دەكا، لە حاڵێكدا مەبەست، مانایەكە كە نووسەر لە خەیاڵیدایە و ئەڵیت ئەركی ڕاڤەكار بیناكردنەوەی لۆژیك و رەفتاری نوسەرە.. بە شێوەیەكی گشتی، راڤەكار دەبێ جیهانەكەی نووسەر درووست بكاتەوە هەتا بتوانێت مەبەستی یەكەمی نووسەر بدۆزێتەوە.

(هێرش) بڕوای وایە ئەو فەزایەی دەق تیایدا دروست ئەبێت، بە درێژایی مێژوو گۆڕانی زۆری بەسەردا دێت كە كاریگەری لەسەر مانا ئەبێت، ئەگەرچی هیچ كاریگەری لەسەر مەبەست نابێت و بە پێچەوانەی روانگەی (گادامێر)، دەق لە پەیوەندیدا بە زەمەنی ئێستاوە ناناسێت و پێناسە ناكات.

بەهەرحاڵ تەواوی ئەم رەخنەگرانە، لەسەر یەك بابەت هاوڕا و هاوفیكرن كە ئەویش بڕوابونە بە هاوڕێكی (ئینسیجام) دەقیە و هاوڕێكی شتێكە كە هەندێك ناوی لێدەنێن مەبەستی نووسەر و هەندێكیش وەكوو گادامێر بە"حەقیقەت و راستی مانا"ی ئەزانن و پێناس دەكەن. بەڵام بۆ تەواوی ئەم كەسایەتییانە، ئەوە دەقە كە راز و رەمزی بەهاكانە. هێرمێنۆتیكی مۆدێرن پانتاییەكی فراوانتر لە لیكۆڵینەوەی دەقە ئەدەبیەكانی داگیركردووە و لە هەموو لقەكانی زانستە مرۆییەكاندا بەكار ئەهێنرێت. بەڵام دەبیت ئەم خاڵەیش رەچاو بكەین كە هیچ جۆرە هێرمێنۆتیكێكی هەمەكی یان رێسا و یاسایەكی هەمەكی بۆ رونكردنەوە و تەفسیر بونی نیە، مەگەر تیورەگەلێكی پەرشووبڵاو و ناكۆك بەیەك لەبارەی رێسا و یاساكانی تەفسیركردن.

**ژێدەر:**

«فرهنگ اصطلاحات نقد ادبی»، دكتر بهرام مقدادی، انتشارات فكر روز؛ تهران: ١٣٨٧

# شێوەکانی لێکۆڵینەوە لە دەسەڵاتی سیاسی

نووسینی: فراتس نویمان
و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

زیادکردنی بیرۆکەیەکی تازە بۆ باسی دەسەڵاتی سیاسی زەحمەتە و بگرە ڕەنگە مەحاڵ بێت. ڕاستە بە زەحمەت کتێبێک بەم ناوەوە ئەدۆزرێتەوە، بەڵام بەگشتی هەرچیەک لەبارەی زانستە سیاسیەکانەوە نوسرا بێت، بەشیوەیەک لە شیوەکان سەروکاری لەگەڵ ئەم بابەتەدایە. ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە گەڵاڵەکردنی تیورەیەکی تازە نیە لەبارەی دەسەڵاتی سیاسیەوە، بەڵکو مەبەستمان شێوەکانی لێکۆڵینەوەیە لە دەسەڵاتی سیاسی، بەتایبەتی بۆ لێکۆڵەرە گەنجەکان.

## ١ - دەسەڵاتی سیاسی و دەروونناسی:

دەسەڵاتی سیاسی چەمکیکی زەحمەت و ئاڵۆزە کە دوو پەیوەندی تەواو جیاواز لەخۆ ئەگرێت: یەکێکیان دەسەڵات بەسەر سروشتدا و ئەویتر دەسەڵات بەسەر مرۆڤدا.



فرانس نۆیمان

دەســەڵات بەسەر سروشتدا بەمانای دەسەڵاتی عەقڵی و فکری رووتە و بریتیە لە تێگەیشتن لە یاساکانی سروشتی دەرەکی بەو نیازەی کە دواجار سروشتی دەرەکی بکاتە ملکەچی پێداویستەکانی مرۆڤ. ئەمجۆرە زانینە بناغەی بەرهەمهێنانە لە هەر کۆمەڵگایەکدا. بـەڵام ئەم دەسەڵاتە ناگات بە قۆناغی دەسەڵاتکردن بەسەر ئەوانی تـردا. دەسەڵاتی سیاسی دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتیە کە تەوەرەکەی دەوڵەتە و بۆ دەستکاریکردنی رەفتاری دەوڵەت و چالاکی یاسادانان و ئیداری و دادوەری دەوڵەت، دەسەڵات گرتن بەسەر ئەوانی تردا لە خۆ ئەگرێت. لەورووەوە کە دەسەڵاتی سیاسی بە مانای دەسەڵاتکردنە بەسەر ئەوانی تردا، هەمیشە (بە جیا لە دەسەڵاتکردن بەسەر سروشتدا) پەیوەندیەکی دوولایەنە لە خۆ ئەگرێت. مرۆڤ تەنها بەشێک نیە لە سروشتی دەرەکی، بونەوەرێکی زیندوو یان ئەندامییە کە سود لە بەهرەی عەقڵ وەرئەگرێت، وەک ئەوەی زۆرجار ناتوانێت -یان ناهێڵن- عەقڵانیانە رەفتار بکات. لێرەوە سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسی ناچار ئەبن بۆ هاندانی خەلکی بۆ قەبوڵکردنی راشکاوانە یان شاراوەی فەرمانەکانیان، کاردانەوە لە خەڵکدا دروستبکەن. سەرنەکەوتن لە دروستکردنی ئەمجۆرە کاردانەوانە لە خەڵکدا، فەرمانڕەوا ناچارئەکات پەنا بۆ توندوتیژی و دواجار کوشتار ببات.

ئەوەی زانستە سیاسیەکان لە زانستە سروشتیەکان جیا ئەکاتەوە، هەر ئەم خەسڵەتە دوولایەنیەی دەسەڵاتی سیاسیە کە رێگە نادات بە هەمان شێوە کە کرداری سروشتی دەرەکی ئەندازەگیری ئەکرێت، پەیوەندیەکانی دەسەڵاتیش (تەنانەت ئەگەر کارێکی وا خوازراویش بێت) ئەندازەگیری بکرێت. فرەیی ئەم پەیوەندیانە لە ژماردن نایەن. ئەکرێت شێوەکانی پۆلێن و وەسف بکرێن، بەڵام ئەندازەگیری کردنی مومکین نیە.

ناکرێت دەسەڵاتی سیاسی بە وزە لە فیزیادا بپێورێت و بە تاکە وتـەزای زانستە سیاسیەکان بژمێرێت. سیاسەت تەنها بەمانای هونەری دەستگەیشتن

بە ئامانج بەدەر لە چیەتی و چۆنیتی نیە. ئارەزوی بەیەک شت زانینی سیاسەت و هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، لە مەکیاڤیلیەوە سەرچاوە ئەگرێت. دیارترین خەسڵەتی زانستە سیاسیەکان لە ئێستادا -بەتایبەتی لە ئەمەریکا - هەر ئەم ئارەزوەیە. سیاسەت بەتەنها مەسەلەیەکی تەکنیکی و لە ئەنجامدا «بەها»ی شتێک پەیوەندی بە سەلیقەی شەخسیەوە هەیە کە ئەگەر بە کار بێت بایەخی هەیە و ئەگەر نەیەت بایەخی نیە. بەم حسابە مێژوو بە گشتی بێمانایە - دوبارەبونەوەی بێکۆتایی پێکدادانی «گروپە خۆییەکانە» لەگەڵ «گروپە بیگانەکاندا» -هیچ نیە جگە لە بەدواداهاتنی زەمەنی روداوەکان یان پەروەندەیەک کە هەڵگری بەڵگەی سەلمێنەری گریمانەکانە کە لە بەرزترین ئاستدا تەنها پەیرەوی لەو شتە ئەکات کە مەکیاڤیلی ناوی نابوو «بەخت» واتە بەختی دو لایەنی کە پێکدادەدەن.

مەکیاڤیلی دامەزرێنەری ئەمجۆرە روانینەیە بۆ سیاسەت و زانستە سیاسیەکان و، بناغە تیوریەکەی لە دەروننناسیەوە سەرچاوە ئەگرێت. پەیڕوانی ئەم ڕێبازە بڕوایان وایە مرۆڤەکان لەسەرتاسەری مێژوودا هەروا بوون کە هەن، هەمویان خاوەنی کۆمەڵێک خەسڵەتی نەگۆڕن و لە هەمویاندا — یان بەگشتی لە هەمویاندا - پاڵنەری دەسەڵاتخوازی هەیە کە ناعەقڵانیە و کۆنترۆڵ ناکرێت. پاشان هەندێک ڕێسای گشتی پەلە و ساوێلکانە لەم روانینەوە دەرئەهێنرێت. لە بابەتی ئەم قسە بەناوبانگەی لۆرد ئەکتن کە «دەسەڵات رووی لە گەندەڵبونە و دەسەڵاتی رەها، بە رەهای گەندەڵە».

دیارە ئەوەی وتمان بە مانای ئەوە نیە کە دەروننناسی دەسەڵات هیچ جێگەیەکی لە زانستە



سیاسیەکاندا نیە. وەزن و گرنگی زۆرە، بەڵام هۆکاری دەستنیشانکەر نیە. دەروونناسی دەسەڵات دوو کار ئەکات. سەرەتا یارمەتی تێگەیشتن لەو خاڵەمان ئەدات کە هەر تیورەیەکی خۆشبینانە لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە یەک لایەنەیە و لێرەوە درۆیـە. مرۆڤ ئەگەرچی سود لە بەهرەی عەقڵ وەرئەگرێت، زۆرجار نازانێت — یان ناهێڵن بزانێت – کە سود و بەرژەوەندی راستەقینەی لەچیدایە. دۆزینەوەی ئەمجۆرە هەقیقەتە دێرینانە، خەسڵەتی تایبەتی دەروونناسی مادی فرویدە. دوهەم ئەوەی کە بەکارهێنانی تەکنیکەکانی دەروونناسی یارمەتیمان ئەدات بونیادی کەسایەتی ئەو کەسانەی کە توانایان بۆ دەسەڵاتگرتن یان ملکەچی بۆ دەسەڵات زیاترە، بەشێوەیەکی دیاریکراو و باوەڕپێکراو وەسف بکەین. بـەڵام دەروونناسی ناتوانێت زیـاد لە دیاریکردن و وەسـفـکـردن، تیورەیەک لـەبـارەی دەسەڵاتی سیاسیەوە بەدەستەوە بدات. کرداری هەرکەسێک بەهەمان ئەندازە بەرهەمی دەوروبـەرە کە سیمای بونیادی کەسایەتی ئەو. جگە لەمە کەسایەتی خۆی بەستراوە بە هەلومەرجی مێژوویەوە. بە بـڕوای دەروونناس، دەوروبـەر تاکە «بزوێنەری» کـارە فەردیەکانە، لەکاتێکدا لای زانـای زانستە سیاسیەکان، یەکیکە لە هۆکارەکان لە شانۆی گشتی دەسەڵاتداری سیاسیدا.

بەدەرلەمەش ئاراستەی هەنوکەی دەروونناسی رووی لەوەیە کە مەسەلەکە تەنها وەک هونەری حوکمڕانی و سەقامگیری پەیوەندیەکانی دەسەڵات دەربخات و ئامرازێک لە دەستی دەستەبژێرەکاندا بۆ دەستکاری جەماوەر

دورخستنەوەی رێبازی دەروونناسی لایەنێکی پۆزەتیڤی هەیە کە ئەو روانگەیە لە خۆی ئەگرێت کە سیاسەت (و لێرەوە مێژوو) تەنها بریتی نیە لە ململانێی گروپەکان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، بەڵکو هەوڵێکە بۆ ئـەوەی هەر کەس جیهان لە قاڵبی بیرکردنەوەی خۆیدا فورمەلە بکات و دیدی خۆی لەسەر بنەخشێنێت. روداوی مێژوو بێمانا نیە. بەشێوەیەکی کاتی ئەتوانین مەسەلەکە بەشێوەی پێش پۆزەتڤیسمیەکەی قەبوڵبکەین کە سیاسەت هەم ململانێی بیروڕاکانە و هەم ململانێی هیزەکان.

## ٢ -دیدە جیاوازەکان بۆ دەسەڵات

هەر لێکۆڵیارێک لە بواری سیاسەتدا، هوشیارانە یان ناهوشیارانە، دیدێکی تایبەتی بۆ دەسەڵاتی سیاسی هەیە کە رێبازەکەی بۆ سەرجەم مەسەلەکانی زانستە سیاسیەکان دیاری ئەکات. بۆ ئەوەی رێگە بۆ شیکردنەوە دیاریکراوەکان بکەینەوە، سەرەتا ئەبێ ببینین بەڵگاندنەکان هەڵگری چ جۆرە بەهایەکن. پۆلێنکردنی تێڕوانینە جیاوازەکان کە لە مێژووی بیروڕای سیاسیدا دەرکەوتووە، کاری زانای زانستە سیاسیەکان بۆ روانین ئاسانتر ئەکات. ئەو پۆلێنەی لێرەدا ئەیهێنینەوە تەنها پیشنیارە و بە مانای ئەوە نیە کە پۆلێنی باشتر و بڕواپیکراوتر نیە.

بە بڕوای ئەفلاتۆن و ئەرستۆ، دەسەڵاتی سیاسی لە کومەڵگا جیا نیە. دەسەڵاتی سیاسی واتە کۆمەڵگا. دەسەڵاتی سیاسی بریتیە لە سەرجەم دەسەڵاتی کۆمەڵگا و تەنیا بەهۆی ئەو تەکنیکانەی تیایدا بەکاردێت، لە پەیوەندیەکانی تر جیا ئەبیتەوە. بە پێی ئەم روانینە لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا یان ئابوری و سیاسەت یان ئەخلاق و سیاسەت یان دین و سیاسەت یان کلتور و سیاسەت جیاوازیەک نیە. مرۆڤ واتە هاوڵاتی. هەر چالاکیەکی کۆمەڵگا یان هاوڵاتیانی کۆمەڵگا، خاوەنی ماهیەتێکی سیاسیە. هـاوڵاتـی تەنیا لە رێگەی چالاکی سیاسیەوە،

تواناكانی خۆی بەدی دێنێت، و تەنیا بە هۆی سیاسەتەوە بە پلەی مرۆڤ بوون ئەگات.
لەبەرامبەر ئەم روانگەیەدا هەڵویستێكی لە بنەڕەتەوە جیاواز هەیە كە من ناوی ئەنێم هەڵوێستی ئۆگۆستینی، كە بەپێی ئەم روانگەیە سیاسەت هیچ نیە جگە لە خراپە و بەڵا. دەسەڵاتی سیاسی واتە زۆر و ناچاركردن و سەرچاوە و مەبەستەكەی هەردوكی خراپن. «بە پێچەوانەی سروشتەوەیە« كە مرۆڤ بەسەر مرۆڤدا فەرمان بكات. تەنیا لە كۆتایی میژوودا و بە دەركەوتنی مەلەكوتی خودا، رەنگە زۆر و ناچاركردن لابچێت و لاش ئەچێت. دوو هەڵویستی تەواو جیاواز بەڵام پەیوەست بەیەكەوە لەم فەلسەفەیەوە دروست ئەبێت: یەكیكیان پەیرەوی كاملە لە دەسەڵاتی سیاسی و ئەوی تر نەیارێتی تەواوە لەگەڵیدا. ئەگەر سیاسەت بەڵا و خراپەیە، ئەوا خۆ دورخستنەوە لێی، ئەركە. شێوەی حكومەت و ئامانجەكانی دەسەڵاتی سیاسی، هیچ پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە نیە. رزگاربون تەنیا لە رێگەی باوەڕوە روو ئەدات و ژیانی خاكی ئێمە ئەبێت بریتی بێ لە خۆئامادەكردن بۆ رزگاری. یەكەم ئەنجامی ئەم بڕوایە، رەهبانیەتە. بەڵام ئەشیت لەو پێشەكیانەی لە هەڵوێستی ئەگۆستینیەوە بەرهەمدێت، بەهەمان شیوە بەو ئەنجامە بگەین كە ئەبێت سیاسەت یەكسەر لەناوبچێت و مەلەكوتی خودا سەقامگیر بێت. رەنگە بزوتنەوەی ئانابابتیست دیارترین دەركەوتەی ئەمجۆرە دوركەوتنەوە كاملە بێت لە كۆمەڵگا.
دیارە ئەم توندڕەوییە بە پەیرەوی لە قەشە ئەگۆستینۆس «عەمەلی» نیە. قەشە تۆماس بیروڕایەك رائەگەیەنێت كە ئەكرێت ناوی بنێن هەڵویستی عەقڵی تەندروست بەرامبەر بە دەسەڵاتی سیاسی. ئەڵێت دەسەڵات پێچەوانەی سروشت نیە، چونكە لە نێوان فریشتەكانیشدا پەیوەندی زنجیرە پلەیی هەیە. بەڵام ئەم هەڵوێستەش زۆر پۆزەتیڤ نیە، چونكە سنورێكی زۆر بۆ دەسەڵاتی سیاسی دادەنێت و بێگومان بەشیوەیەكی ئاڵۆز ئەیكاتە ملكەچی دەسەڵاتی رۆحانی كە لەرێگەی پلەی جیاوازی یاساوە دێتە مەیدانەوە.
ئەم فەزای بیروباوەڕە، رێگەی بۆ هەڵوێستی لیبراڵەكان كردەوە كە ئەیانوت دەسەڵاتی سیاسی شایەنی بڕواپێكردنی تەواو نیە، لەبەرئەوە تاكە ئامانجیان سنورداركردنی بوو. لیبرالیسم خوازیاری سڕینەوەی دەسەڵاتە لە بەرامبەر پەیوەندیە یاساییەكاندا و نەهێشتنی حكومەتی فەردی و جێگركردنی حكومەتی یاسا لەبری. لە حكومەتی یاسادا هەر پەیوەندیەك ئەبێت ئاراستەی مەبەستێكی دیاریكراو كرا بێت و لەسەر بنەمای عەقڵ بێت. بەڵام لەراستیدا ئەم هەڵوێستەش جۆرێك ئایدۆلۆژیایە، ئەگەرچی زۆرجار بەبێ ویست رووی لە رێگری لە گەڕان بەدوای سەرچاوە بنەرەتیەكانی دەسەڵاتی سیاسی و سەقامگیری پێگەی سەرچاوەكانی دەسەڵات بێت. ناكری دەسەڵات، بە یاسا بسڕێتەوە.
هەڵوێستێكی تر سەبارەت بە دەسەڵات، هەڵوێستی ئەپیكۆرسە كە نابێت لەگەڵ لیبرالیزمدا تیكەڵ بكرێت. بەپێی ئەم روانینە و بە پێچەوانەی تێروانینی ئەفلاتۆنی -ئەرستۆییەوە، سیاسەت بەشێكی جیایە لە كاركردنی كۆمەڵگا و بە ئاشكرا جیاوازە لە چالاكیەكانی تر كە بە هیچ شێوەیەك نابێت سەرنج لەوە بدەین كە چۆن رێك ئەخرێت و چ كەسێك سەرپەرشتی ئەكات و مەبەست لێی چییە. هەر دەسەڵاتێك رەوایە تا ئەو كاتەی كە لانیكەمی رێكخستنی روكەشی كۆمەڵگا بپارێزێت و ئیمكان بە

تاکەکەس بدات کە سەرقاڵی ژیانی خۆی بێت.
لەرووی دەرئەنجامە دەروونناسیەکانەوە، هەندێکجار ئەپیکۆرسیسم پەیوەندیەکی نزیک لەگەڵ ئەنارشیزمدا پەیدا ئەکات. لە روانگەی ئەنارشیزمێکەوە دەسەڵاتی سیاسی خراپە و کۆمەڵگا باش و لێرەوە ئەگەری ئەوە هەیە کۆمەڵگایەکی بێ سیاسەت دروست بکرێت. لێرەشدا وەک ئەگوستۆنیسم، دوای ئەمە رەنگە مەسەلەکە بڕوابوون بێت بە بەدواداچون یان روخان. کەسێک کە بڕوای بە بەدواداچون بێت ئەڵێت مرۆڤ نابێت بە بەشداریکردن لە سیاسەتدا خۆی پیس بکات. کەسێک کە بروای بە روخان هەبیت ئەڵیت مرۆڤ هەرکاتێک ویستی، ئەتوانیت کۆمەڵگا لەسەر بناغەی هاوگروپی دامەزرێنێت.
مارکسیسم لەوەدا لەگەڵ ئەنارشیسم و ئەگۆستینیسم هاوبەشە کە دەسەڵاتی سیاسی دیاردەیەکی مێژووییە نەک سروشتی، بەڵام بەپێچەوانەی ئەنارشیزمەوە و هاودەنگ لەگەڵ ئەگۆستینیسم دەسەڵاتی سیاسی بە دیاردەیەک دائەنێت کە لەرووی مێژوویەوە پێویستە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەگۆستینیسمەوە ئەم پێویستیە لای مارکسیسم سنوردارە بە قۆناغێکی مێژووی دیاریکراو کە مرۆڤ ئەبێت پێش دامەزراندنی کۆمەڵگای بێ چین (واتە کۆمەڵگای بێ سیاسەت) پیایدا تیپەڕێت. جیاوازیەکی تری مارکسیسم لەگەڵ ئەنارشیسمدا لەوەدایە کە مارکسیسمەکان دەرمانی ئازاری دەسەڵاتی سیاسی، بە دەسەڵاتی سیاسی زیاتر و چەقگرتوتر ئەزانیت کە ئەبێت بەزیرەکی بۆ وردکردنی خودی دەسەڵاتی سیاسی سودی لێوەربگیرێت (دیکتاتۆری پرۆلیتاریا). لێرەوە تا دامەزراندی کۆمەڵگای بێ چین، بەرخوردی مارکسیەکان لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا پۆزەتیڤە.
مارکس لەم هەڵوێستە پۆزەتیڤەدا، هاوڕایە لەگەڵ رۆسۆ. بە بڕوای رۆسۆ دەسەڵاتی سیاسی لەلایەکەوە گشتگیرە و لەلایەکی تریشەوە بوونێکی راستەقینەی نیە. گشتگیرە چونکە (وەک لە ئەفلاتۆن و ئەرستۆدا بینیمان) کۆمەڵگا سەرتاسەری چالاکیەکانی مرۆڤ و ئابوری و کلتور و دین لەخۆ ئەگرێت. بەڵام لەهەمانکاتدا بێ هیچ بونیکی راستەقینەیە، چونکە لەسەر ئەوەیە کە ئیرادەی گشتی، حکومەت و خەڵکی ژێر دەسەڵاتی حکومەت پێکەوە گرێئەدات.


کارل مارکس

شتێک که وا ئەکات له تیورەکانی رۆبسپیر بگەین، هەر ئەم دیده دوو لایەنیەیە بۆ دەسەڵاتی سیاسی. لیبرال دیموکراتەکان و دیموکراته پەتی و تەواوەکان هەردووکیان دیدێکی پۆزەتیڤیان بۆ دەسەڵاتی سیاسی هەیە. دەسەڵاتی سیاسی به بروای ئەوان ئامرازێکی تەواو عەقلانیه بۆ دەستگەیشتن به ئامانجێکی خوازراو. بەڵام لیبرالەکان بەهۆی ترسێکەوه که هەیانە، نایانەوێت ژیان راستەوخۆ سیمایەکی سیاسی پەیدا بکات و سورن لەسەر ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی به خاوەنی خەسڵەتێکی جیاواز پێناسبکەن. لیبرال دیموکراتەکان که ئەیانەوێت نەکەونه ناو ناکۆکیەوە، لەوەی که دەسەڵاتی سیاسی تەواو سنوردار بکەن، خۆیان ئەدزنەوه و به کردەوه هەرچەند ئەچنه پێشەوە، زۆرتر سەرنج له بەکارهێنانه عەقلانیەکانی ئەدەن.

ناسینی دیده جیاوازەکان سەبارەت به دەسەڵاتی سیاسی- چ به فلان شێوه یان فیسار شێوه- وامان لیئەکات بتوانین دژ وتنەکان که زۆرجار فریوکارانه و ریاکارانەن، بدۆزینەوه و ئەوەمان بۆ ئەرەخسینێت بۆ لیکۆڵینەوه له دیاردەی دەسەلات، بەرخوردێکی تەبا و خاڵی له ناکۆکی بکەین. ئەگەر بینیمان لیکۆڵەرەوه یان سیاسەتمەداریک هەم خوازیاری مەحرومبوونی ناڕازیەکان و نەیارەکانه له حکومەت و، هەم بەرگری له سنوری موڵکایەتی تایبەتی لەبەرامبەر دەستیوەردانی حکومەتدا ئەکات، ئەبێت تیبگەین که رووبەڕووی تێکەڵەیەکین له هەڵوێستەکانی ئەفلاتۆن و رۆسۆ و دیدی لیبرالەکان.

دەرئەنجامی ئەم تیکەڵبونه، وتاربێژیه بۆ پروپاگەندە، نەک دیدێکی تازه سەبارەت به دەسەلات. پۆلێنکردنی ئێمه بۆ جۆرەکانی تێڕوانین، بونی هەڵوێستی ناکۆک بەیەک ئاشکرا ئەکات. ئەرکی لیکۆڵەرەوەی رەخنەگر و هەڵسەنگێنەر ئەوەیە که ئەم ناکۆکیانه له پەڕەی بیرکردنەوه بسرێتەوه و لەوانی تردا ئاشکرای بکات و هۆشیار بێت بەرامبەر بەو گریمانانەی هەڵویستی خۆی لەسەر بونیاد ناوه.

## ٣ - مانا و گرنگی دەسەڵاتی سیاسی

هەرئەوەندەی ئەم روانینه له خود کۆتایی هات، ئەبێت راستەوخۆ رووبەڕووی مەسەلەی مانا و گرنگی دەسەڵاتی سیاسی بینەوه. هیچ کۆمەڵگایەک له میژووی نوسراوی مرۆڤدا هەرگیز نەیتوانیووه چاو له دەسەڵاتی سیاسی بپۆشێت. ئەم حوکمه لەبارەی لیبرالیسم و حکومەته رەهاکان و رژێمەکانی پەیڕەوی سیاسەتی ئازادیخوازی (Laissez Faire) و ئەو دەوڵەتانەی بڕوایان به دەستیوەردان هەیە، به یەکسان راسته. هیچ زیانێک له زانسته سیاسیەکان لەوه گەورەتر نەبووه که وتویانه دەوڵەتی لیبرال، دەوڵەتێکی «لاوازە». دەوڵەتی لیبرال هەمیشه دروست به هەمان ئەندازەی که بارودۆخ پێویستی پێ بووه، بەهێز بووه و له زەمانی خۆیدا، ئیمپراتۆری کۆلۆنیالی پان و بەرینی دامەزراندووه، چۆته جەنگەوە، ئاژاوەی ناوخۆی دامرکاندۆتەوه و لەمەودای دوردا سەقامگیری خۆی پاراستووه.

ئەڵبەته ئەو شێوازانەی که سەرچاوەکانی دەسەلات بەکاری ئەهێنن جیاوازه و دامێنی بەکارهێنانیانیشیان جیاوازە. به وردی هەر ئەم مەسەلەیەش بۆ زانای زانسته سیاسیەکان، خاوەن گرنگیەکی سەرەکیه. لەرووی تیوریەوه دامێنی شێوازه ناوبراوەکان له لایەک بەرەو کوشتار و له لایەکی ترەوه سنوردار ئەبێت به فیرکاری و

پەروەردە. سێ شێوازی سەرەکی لە هەڵبژاردنی هەر گروپێکدا. سەرچاوەی دەسەڵاتە: یەکەم، ئیقناع، دوهــەم، ئیمتیازی مــادی و سێهەم توندوتیژی. توندوتیژی رەنگە لە مــەودای کورتدا زیاتر لە هەمویان کاریگەر بێت، بەڵام وەک شیوازی سەرەکی پاراستنی دەســەڵات لە مــەودای دوردا کاریگەری نیە. چونکە (بە تایبەت لە بارودۆخی ئەمڕۆدا) گروپی سەرچاوەی دەسەڵات ناچار ئەکات شێوازە توندوتیژئامیزەکان توندتر بکات و دژی خەڵکی زیاتر و گەورەتر بەکاریان بهێنیت. ئەوە بەڵگەنەویستە ئەو شێوازەی لە هەمویان زیاتر کاریگەرە (واتە هەرزانتر تــەواو ئەبێت) ئیقناعە. لەگەڵ ئــەوەشــدا نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە هەر سێ شێوازەکە (واتە ئیقناع و ئیمتیاز و توندوتیژی) هەمیشە لە هەموو شێوازەکانی حکومەتدا هەیە. هەر ئەم تێکەڵبوونەی سێ رەگەزەکەش، مەسەلەیەکی سەرەکی بۆ زانای زانستە کۆمەڵایەتیەکان دروستئەکات. ئێستا هەوڵ ئــەدەم ئەم مانایە بە فۆرمەلەی هەندێک رێسای گشتی کۆمەڵناسی رونبکەمەوە.

رێسای گشتی ژمارە ١ی کۆمەڵناسی. هەرچی ئــاڵــۆزی کۆمەڵگا زیــاتــر بێت، قــەدر و گرنگی ئیقناعکردن زیاتر ئەبێت، رەنگە وەک مێژوونوسی فەرەنسی (ژانــل) لەبارەی ئینگلتەرای کاسۆلیک مەزهەبەوە لەسەردەمی هینری هەشتدا وتویێتی، بەراستی ئەکرێت ئیقناع بە یەکیکی تر لە شێوەکانی توندوتیژی دابنرێت، «بــەڵام توندوتیژیەک کە قوربانیەکەی دەرونی مرۆڤە». بەهۆی ئیقناعەوە حوکمرانان وا خەڵکی ژیر دەسەڵاتی خۆیان دەستەمۆ ئەکەن کە لەوە بەدواوە کاردانەوەی تاکەکان بەگشتی خۆ بە خۆ دەرئەکەوێت. سەرکەوتن لە ئیقناعکردندا پەیوەندی بە فراوانی و ماوەی پڕوپاگەندە و لێزانی لە وتنی بیرۆکە و وتە قاڵبیەکانەوە هەیە. گومانی تیا نیە کە بۆ دەسەڵاتدارێتی سیاسی، ئیقناع کاراتر و هەرزانترە لە بەکارهێنانی هێزەکانی پۆلیس و سوپا و نیمچە سەربازی.

رێســای هەمەکی ژمــارە ٢ی کۆمەڵناسی. هەرچی کۆمەڵگا ئاڵۆزتر بێت، بە ناچار حوکمڕانان بەشێوەیەکی روو لــە زیــاد پەنا بــۆ تەکنیکە شارەوەکانی فەرمانڕەوایی ئەبەن. ململانێ بۆ بەدەستهێنانی دەســەڵات، ململانێی راستەقینەیە بەمەبەستی دەست بەسەراگرتنی دەزگای دەوڵەت. لە هەر ململانێیەکدا بڕیارە تەکنیکیەکان تەنها بە شارەوەیی وەرئەگیرێت. پاراستنی نهێنیەکان پێویستی بەوەیە کە هەڵگرانی نهینیەکان گروپێکی بچوک بــن. دەرکەوتنی ئولیگارشیەکان (واتــە دەرکەوتنی کەمایەتیە بچوکەکانی حوکمڕانی) لە بزوتنەوە جەماوەریەکاندا، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم راستیە. ماکس فیبەر و رۆبرت میکلس (و رەنگە زۆرێکی تر) سەرنجیان لەم دیاردەیە داوە. فیبەر بەراست جەخت لەوە ئەکات کە لەبەر گرنگی شاردنەوەی نهێنی بۆ هەر حکومەتێک کە بیەوێت لە ماوەیەکی کەم زیاتر حوکمبکات، گروپی بچوک لە گروپی گەورە باشترە. رێک لەبەرئەمەیە کە حوکمڕانی ژمارەیەکی کەم لەو شێوە دەزگایانەدا- وەک یەکێتی کرێکاران و حیزبە سوسیال دیموکراتەکان - شێوەیەکی بەرجەستە پەیدا ئەکات کە لە بزوتنەوەکانی تر زیاتر بڕوایان بە دیموکراسی هەیە. هۆی ئەمە روونە. نەیارانی ئەمجۆرە بزوتنەوانە بەگشتی لەرووی ژمارەوە کەم و بەڵام لەرووی فەردیەوە بەهێزن، لەبەرئەوە ئەکرێت بڕیارەکان تەکتیکی و ستراتیژیەکانی خۆیان بە شاراوەیی بهێڵنەوە. هەموو رێکخراوێکی جەماوەری کە رووبەڕووی نەیاری لەمشێوەیە ئەبێتەوە، ئەبێت

به نۆبەتی خۆی پەنا بۆ دروستکردنی دەوڵەتیک (ناوخۆی) بەرێت کە رێگە بە شاردنەوەی نهێنی ئەدات. پێداویستیەکانی کۆمەڵناسی وا ئەخوازێت کە بزوتنەوە دیموکراتیەکان لەکاتی جێبەجێکردندا، شیوەیەکی ئەرستۆکراتیانە وەربگرن. بەرێکەوت نەبوو کە مەسەلەی پەرەسەندنی ئولیگارشیەکان لە بزوتنەوە جەماوەریەکاندا، بۆ یەکەمجار لەبارەی حیزبی سوسیال دیموکراتی ئەڵمانیاوە تاوتوێ کرا.

لینین ئەم پێویستیەی (واتە شاردنەوەی) کرد بە فەزیلەت. تیورەکەی لینین لەبارەی رابەرانی پێشەنگ، بە راشکاوی چەمکی ئەرستۆکراتی سۆسیال دیموکراسی، کردە جێگری چەمکی کلاسیکی و دیموکراسی ئەم مەبەستە.

رێسای هەمەکی ژمارەی ٣ی کۆمەڵناسی. چەند تەکنەلۆژیا لەرووی گەشەکردنەوە بەقۆناغێکی باڵاتر گەیشتبێت، ناوەندێتی دەسەڵاتی سیاسی زیاتر ئەبێت. چەمکی یاسایی موڵکایەتی، پەیوەندی بەم دیاردەیەوە نیە. گرنگ نیە کە خاوەنی یەکەیەکی پیشەسازی کێیە: رەنگە تاک بێت یان شەریکەیەک یان دەوڵەت یان هەر گروپیکی رێکخراوی تر. رەنگە رێکخستنی کۆمەڵایەتی یەکەیەکی پیشەسازی، هەرەوەزی بێت. بەڵام لەهەر گروپێکدا کە لەسەر بناغەی ململانێ بونیاد نرا بێت، بە ناچار رێکخراوێک لەسەر بنەمای زنجیرە پلە دروست ئەبێت. هەرچەند گروپەکە گەورەتر بێت، زنجیرە پلە تیایدا پتەوتر ئەبیت. ئارەزوی زیاتر بۆ زنجیرە پلەی زیاتر، ئەبێتە هۆی چڕبونەوەی زیاتری لوتکەی دەسەڵات. پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی سیاسی، دواتر شی ئەکرێتەوە.

رێسای هەمەکی ژمارە٤ی کۆمەڵناسی. هەرچی کۆمەڵگا ئاڵۆزتر و پیشەسازیتر بێت، گرنگی دەسەڵاتی سیاسی لە پرۆسەی کۆمەڵایەتیدا زیاتر


رۆسۆ

ئەبێت. چڕبونەوەی دەسەڵات (چ لە ئابوری، چ لە کۆمەڵگا و چ لە کلتوردا) ئەبێتە هۆی سەختگیری زیاتر. کۆمەڵگا هێواش هێواش توشی دەمارگیری زیاتر ئەبێت و دەزگاش بۆ ئەوەی نێوە خۆبەخۆ هاوسەنگی خۆی بپارێزێت، دوا ئەکەوێت. ئەکرێت هاوسەنگی لەدەستچوو تەنها لەرێگەی دەستیوەردانی چالاکانەی دەسەڵاتی سیاسیەوە بگەڕێنرێتەوە. لە دوای ئەمە کۆنترۆڵی دەزگای دەوڵەت زیاد لەهەر کاتێکی رابردوو. بەها پەیدا ئەکات

ریسای هەمەکی ژمارە ٥ ی کۆمەڵناسی. ئەم رەوتە هەروەها جیابونەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی زیاتر ئەکات. دواتر باسی ئەم دیاردەیە ئەکەین.

رەنگە لە هەموو یان هەندێک لەم رێسایانە دوودڵ بین، مەبەستی ئێمەش پێشکەشکردنی پێڕستیکی ورد و درشت نەبووە، تەنها ویستومانە رێگە دروستەکانی لێکۆڵینەوە لە دەسەڵاتی سیاسی پیشان بدەین. ئەگەر ئەم رێسایانە هەندێک کەس نارەحەت بکات، چاوەڕواننەکراو نیە. لە سەرنجی یەکەمدا گونجاندنی ئەم رێسایانە لەگەڵ دیموکراسیدا بە زەحمەت ئەزانرێت. ئەگەر مەبەست لە دیموکراسی تێکەڵەیەک بێت لە رەگەزی جیاوازی ریکخراو لە تیورەکانی لۆک و رۆسۆ و ئەگۆسینی قەدیس و تۆماسی قەدیس کە بەشێوەیە ئاسایی ناویان ناوە «تیورەی دیموکراسی»، ئەوا بە دڵنیایەوە گونجاندنی ئەم رەوتە واقعبینانەی باسمانکردن، لەگەل تیورەی ناوبراودا مومکین نیە. بەڵام ئێمە ئیستا سەرقاڵی تیورەی دیموکراسی نین. لێرەدا هەر ئەوەندە بەسە بڵێین بۆ ئەوەی تیورەی دیموکراسی فراوان و مەبەست بپێکێت، ئەبێت ئەم گرفتانە لەبەرچاو بگرێت.

### ٤ - سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسی

بۆ شیکردنەوەی سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسی، ئەبێت رووبەڕووی سێ مەسەلە ببینەوە: ئەبێت ئەو چەمکانەی لە چوارچێوەیاندا لێکۆڵینەوە ئەکرێت، سەقامگیر بکرێن. ئەبێت چۆنێتی ئەو دەزگایانەی لە شانۆکەدان رون بکرێنەوە، ئەبێت ئەو پرۆسە میژوویە دەرک بکرێت کە ئەبێتە هۆی گۆڕانی دەزگاکان و دروستبونی دیدی جیاواز بۆ دەسەڵات و دەرکەوتنی رەفتارە سیاسیە جیاوازەکان. ئەمکارە هیچ کێشەیەکی بۆ میژوونوسە کلاسیکەیان دروست نەئەکرد. بە بڕوای ئەوان دەسەڵاتی سیاسی راستەوخۆ لە دەسەڵاتی ئابوری و بەتایبەتی لە دەسەڵاتکردن بەسەر زەویدا سەرچاوەی ئەگرت. بەڵام گۆڕانی موڵکایەتی و دەرکەوتنی شێوەی تازەی بەرهەمهێنان و چەند هۆکارێکی تر، چەند سەرچاوەیەکی تازەی بۆ دەسەڵاتی سیاسی دروستکرد و بە ناکۆکی ئەگەیشت. میژوونوسە تازەکانیش کە سەروکاریان لەگەڵ ئەم قۆناغەدایە، دیسان وێنەی مەسەلەکە بەهەمان شێوەی مێژوونوسە کلاسیکەیەکان دەرئەبڕن.

وەک هەنوکە ئەبینین ئابوری سەرمایەداری تازە، چەند گومانێکی لەم بابەتەدا دروست کردووە. بەڵام لەگەڵ گرنگی زۆری ئەم مەسەلەیەدا، هیشتا قەدەغەکردنی بێمانا و بێ هۆ، رێگری لە شیکردنەوەی بابەتەکە ئەکەن. تێڕوانینە کۆنەکان یان لەناوچون یان لە چاو ون بون و بە دەگمەن بە ئاشکرا باس ئەکرێن. رێبازی دێرین دوبارە لەسەردەمی تازەدا لە رێی تەفسیری مارکسەوە بۆ میژوو زیندوو بۆتەوە (خودی مارکس دانی بەوەدا نا کە ئەم هەڵوێستە «مارکسیانە« نیە و لە داهێنانەکانی ئەو نیە). بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوە بووە بە مۆدە کە بێ ئەوەی بزانن مارکسیسم چیە، رەدی بکەنەوە، لیکۆڵەرەوان

بەدەستی خۆیان، خۆیان لە تیگەیشتنی رون لە پەیوەندی نیوان دەسەڵاتی ئابوری و دەسەڵاتی سیاسی مەحروم ئەکەن.
مامەڵەکردن لەگەل ئەم مەسەلەیەدا ئاسانتر ئەبیت، ئەگەر هەندێک پەیوەندی رونبکرێتەوە:
تێڕوانینی سەردەمی دێرین: لەوەی تا ئیستا وتومانە ئەو ئەنجامە وەرئەگیرێت کە دەسەڵاتی سیاسی لە دەسەڵاتی ئابوریەوە سەرچاوە ئەگرێت، بەڵام هێواش هێواش بەسەرجەم شتەکانی ژیاندا و هەموو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا ئەگرێت و ئەچێتە ناویان. دەسەڵاتی سیاسی لەسەر بناغەی دەسەڵاتی ئابوری ئەجولێت، بەڵام دواتر سەرجەم ئەو پەیوەندیانە لە خۆ ئەگرێت کە لە دەوری دەسەڵاتخوازی ئەسورینەوە.
تێڕوانینی قۆناغی فیودالیزم. بە پێی نمونەی گریمانەیی ئەم تێروانینە، دەسەڵاتی سیاسی بوونی نیە. دەسەڵاتی سیاسی تەنها پەیڕەوی دەسەڵاتی ئابوریە – واتە موڵکایەتی زەوی – و سەرجەم دەسەڵاتەکانی دادوەری، سوپایی و مەزهەبی و تەکنیکی و بەڕیوبەرایەتی لەوەوە سەرچاوە وەرئەگرن.
تیروانینی سەرمایەداری. تەنها لەم قۆناغەدایە کە مەسەلەیەکی واقعی دروست ئەبێت، واتە سەربەخۆبوونی دەسەڵاتی سیاسی و لەهەمانکاتدا پەیوەسبونی بە دەسەڵاتی ئابوریەوە. بە پێی ئەم تێڕوانینە (کە لۆک بناغە تیوریەکەی کامڵ کرد) دەسەڵاتی سیاسی چالاکیەکی جیایە کە لە دەزگایەکی جیادا –واتە دەوڵەت– ئەنجام ئەدرێت. دەوڵەت هێزی ناچارکردن بۆ خۆی پاوان ئەکات و ئەم هێزەش لەچوارچێوەی دەزگایەکی جیادا پراکتیک ئەکات. بەڵام ئەم دەزگایە جیایە، لەهەمانکاتدا پەیوەستە بە کۆمەڵگاوە و بۆ خزمەتی کۆمەڵگا ئەکەوێتە کار. رەهەندی هاوبەشی نیوان لۆک و هۆبز و جیاوازی هەردووکیان لەگەڵ رۆسۆدا هەر ئەم تێڕوانینەیە. لۆک و هۆبز لەلایەکەوە دەسەڵاتی سیاسی لە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی جیا ئەکەنەوە و لە لایەکی ترەوە ئەیانبەستن بەیەکەوە. بە بڕوای هۆبز ئەبێت بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا، دەسەڵاتی سیاسی تا بەرزترین ئاست زیادبکرێت. بە بڕوای لۆک تەنها بە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی بۆ نزمترین ئاست، خزمەتکردنی کۆمەڵگا مومکینە. بەڵام هەردووکیان هەندێک ئاوارتن قەبوڵ ئەکەن. بەپێی تیورەی هۆبز ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆی بەجێنەهێنێت، لەناوئەچێت (بە مانایەکی تر پەیمانی کۆمەڵایەتی چیدی بایەخی نامێنێت). لۆک لەبەر بەرژەوەندی کۆمەڵگا، دەسەڵاتی سیاسی لەرێگەی دەزگایەکەوە بەناوی «هەڵبژاردنی تایبەت» یان «هێزی بەڵیندەرەوە» بە دوا پلە ئەگەیەنیت.
شتێک کە لۆک و هۆبز بە رونی نەیانگوتووە ئەوەیە کە دەسەڵاتی ئابوری و دەسەڵاتی سیاسی نەک لەروی بەکارهێنانەوە، بەڵکو بەهۆی رەوتی دروستبونیشەوە پەیوەستن بەیەکەوە و دەسەڵاتی ئابوری، رەگوڕیشەی دەسەڵاتی سیاسیە. یەکەم شیکردنەوەی رێکخراو و مەنهەجیانەی ئەم پەیوەندیە، شیکردنەوەی سان سیمۆنە بۆ شۆڕشی گەورەی فەرەنسا کە دواتر بەخێرایی بۆ مێژوونوسی و کۆمەڵناسی لە فەرەنسا و ئینگلتەرا ئەتەنێتەوە.
لەم باسە گشتیەی بۆچونەکانی لۆک و هۆبز ئەو ئەنجامگیریە ئەکرێت کە تاچەند بمانەوێت ئازادی بە کۆمەڵگا – و بەتایبەتی بە چالاکی ئابوری – بدەین، ئەم ئازادیە ئەبیت بە مەبەستی پاراستنی رێکخستنی سیاسی ببەخشین. کەوابوو شتێک نیە بەناوی دەسەڵاتی ئابوری «پەتی» یان چالاکی سیاسی «پەتی». ئابوری ئامرازێکە بۆ سیاسەت و

سیاسەت هۆکارێکە بۆ ئابوری. چەمکی ئەفسانەیی دەوڵەتێک کە ئازادی کامڵی تیدایە، ئەبیت لەگۆر بنرێت.

ئەگەر ئەم روانینە گشتیە قەبوڵ بکرێت، گۆڕانی دەسەڵاتی ئابوری بۆ دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و لەوێوە بۆ دەسەڵاتی سیاسی، ئەبێت بە هەستیارترین مەسەلە بۆ زانای زانستە سیاسیەکان.

حیزبە سیاسیەکان. گرنگترین ئامرازی گۆڕینی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بۆ دەسەڵاتی سیاسی، حیزبە. هۆی ئەم پلە باڵایەی حیزب، ئەگەڕێتەوە بۆ سروشتی دیموکراسی. حیزب ئەو ئەگەرە ئەرەخسینێت کە بەرژەوەندیە تایبەتیەکان - و زۆر جار زۆر خۆپەرستانە - لە جلوبەرگی بەرژەوەندی نەتەوەیدا خۆی دەربخات. بەڵام لەهەمانکاتدا رێگە لە زاڵبونی کامڵی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان بەسەر بەرژەوەندیە گشتیەکاندا ئەگرێت. لەبەرئەوە کارکردنی حیزبە سیاسیەکان لە دیموکراسیدا دوو لایەنەیە. پرۆسەی دیموکراسی یەک بە یەکی گروپە کۆمەڵایەتیەکان ناچار ئەکات هەوڵ بۆ راکێشانی پشتگیری جەماوەر بدەن. لەبەرئەوەی هەر گروپێک ئەبێت بەرژەوەندیە خۆپەرستانەکەی خۆی، وەک بەرژەوەندی گشتی پیشان بدات. لە دیموکراسیدا سیاسەت - واتە ململانی بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات - زۆر زیاتر لە هەر قۆناغێکی رابردوو لە مێژوودا، سیمای ئایدۆلۆژی بەخۆیەوە ئەگرێت. ئەوەی لەسەردەمی دێریندا بە بەڵگەنەویست دائەنراو و لە سیستەمی فیودالیدا روون بوو، هەنوکە لە پرۆسەی دیموکراسیدا لەچاو ون ئەبیتەوە. بەڵام نابێت رەهەندی بەنرخی ئەم پرۆسەیەمان لەبیر بچێت. پێویستی پشتبەستن بە گروپی گەورەتر لەو گروپەی خاوەن بەرژەوەندی تایبەتە، بەناچار ئەبێتە هۆی گونجانی بەرژەوەندیە جیاوازەکان و سیاسەت چۆنایەتیەکی دیموکراتی بەهێزتر پەیدا ئەکات.

موڵکایەتی تایبەتی. دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی یان لە موڵکایەتی تایبەتیەوە دروست ئەبێت یان دژایەتی ئەکات. مانای یاسایی موڵکایەتی تایبەتی هەڵگری دوو مانای تەواو ناکۆک بە یەکە: یەکیکیان دەسەڵاتی کەس بەسەر بەشیک لە سروشتی دەرونی (واتە مافی رەها) و ئەوی تریان دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤەکانی ترەوە کە دەرئەنجامی دەسەڵاتە بەسەر سروشتدا. زانای زانستە سیاسیەکان تەنها سەروکاری لەگەڵ مانای دوهەمی موڵکایەتی تایبەتیدایە، واتە موڵکایەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان. ئەم بەشەی موڵکایەتی دەسەڵات ئەهێنێت، دەسەڵات لە بازاڕی کار و بازاڕی کاڵا و بازاڕی سیاسەت.

موڵکایەتی خاوەنی سێ کردارە کە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە هەیە کە بەگشتی (بەتایبەتی لە ئەوروپا کە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی تیایدا دەڤگرتوترە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا) لە سێ رێکخراودا وەک دەزگای لێهاتووە: لە بازاڕی کاردا وەک ئەنجومەنی کارمەندان، لەبازاڕی کاڵادا بەشیوەی کارتل، لەبازاری سیاسەتدا لەرووی جوگرافیاوە وەک ژوورەکانی بازرگانی و لەرووی کارکردنەوە وەک ئەنجومەنی پیشەیی.

لەبەرامبەردا یەکێتیەکانی کرێکاران (لە ئەوروپا) هەوڵئەدەن لەرێگەی دەسەڵاتی گشتی و دروستبوو لە کرێکاران - هەندێکجار لەیەک رێکخراودا و هەندێکجاریش لەچەند رێکخراوێکدا - بازاڕی کار و دەسەڵاتی سیاسی رێکبخەن. هەرەوەزیەکانی بەرهەمهێنان و مەسرەف کاریگەریان لەسەر دەسەڵاتی موڵکایەتی لە بازاڕی کاڵادا هیچی ئەوتۆ نیە.

لێکۆڵینەوە لەم ڕێکخراوانە و لێکۆڵینەوە لە ئامێرەکانی گۆڕینی دەسەڵاتی ڕێکخراوەیی بۆ دەسەڵاتی سیاسی، بۆ زانای زانستە سیاسیەکان گرنگیەکی زۆری هەیە .لێکۆڵینەوەی پەرشوبڵاو لەبارەی گروپەکانی فشارەوە زۆر زۆرە، بەڵام هێشتا شیکردنەوەیەکی پراکتیکی ناسک و بەراستی مامۆستایانە ئەنجام نەدراوە. ڕێگەکانی گۆڕانی دەسەڵاتی ئابوری لەسەر بناغەی ئەم دۆخانە (بۆ دەسەڵاتی سیاسی) لە وڵات و بارودۆخە جیاجیاکاندا، جیاوازە. لەڕووی شیکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسیەوە، لێکۆڵینەوە لە هێزی ڕێژەیی گروپە ئابوریە ڕەقیبەکان، چەندجار زیاتر گرنگترە لە لێکۆڵینەوەی دەزگا سیاسیەکان بە مانای تایبەتی. لە هەندێک وڵاتانی (وەک ئەڵمانیا و ئینگلتەرا) کارمەندان و بەڕێوەبەرانی دەزگا ئابوریەکان، ڕاستەوخۆ ئەچنە ناو پەرلەمانەوە. لە وڵاتەکانی تردا (وەک ئەمەریکا) نفوزی (ئەمجۆرە ڕێکخراوانە) ناڕاستەوخۆ ترە. لە هەندێک وڵاتدا (وەک ئەڵمانیا و ئینگەلتەرا) یەکێتیەکانی کرێکاران هەر ڕێکخراوی پیشەیی نین، بەڵکو سیاسیشن. لە وڵاتانی تردا (وەک فەڕەنسا و لەهەندێک بارودۆخدا ئەمەریکا) یەکێتیەکان بە روکەش خۆیان لە چونە ناو سیاسەت بەدوور ئەگرن.

کەوابوو ئامێرەکان و شێوەکانی گۆڕانی دەسەڵاتی ئابوری بۆ دەسەڵاتی سیاسی زۆر جیاوازن و لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەبینین کە چەند نمونەیەک قابیلی دیاریکردنن کە ئەبێت تایبەتمەندیەکانیان لەسەر بناغەی لێکۆڵینەوەی پراکتیکی رونتر دیاری بکرێت. لێرەوە ئەبێت زانای زانستە سیاسیەکان بە باشی ئاشنای چینە کۆمەڵایەتیەکان و ریکخستنی ئابوری بێت.

باڵادەستی سیاسەت و بیرۆکراتیەت. پەیوەندی کلاسیکی رابردوو لە نیوان ئابوری و سیاسەتدا، لە گۆڕاندایە. هەنوکە وا دەرئەکەوێت کە دەسەڵاتی سیاسی لە حاڵەتی رزگارکردنی خۆیەتی لە کۆتوبەندی ئابوری و تەنانەت رووی لەوەیە خۆی ببێ بە بناغەیەک بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی ئابوری. بەشێوەیەکی گشتی بڕوا لەسەر ئەوەیە کە رووکردنە بیرۆکراتیەت سیمای رەوتێکە کە ئەبێتە هۆی تیورەکانی لایەنگری حکومەتی بەڕێوبەران، بەو مانایە کە دەگوترا بەڕێوبەرانی بەشە تایبەتی و دەوڵەتیەکان، هێواش هێواش موڵکدار و پەرلەمانەکان لە شانۆ ئەکەنە دەرێ. بێگومان رووکردنە بیرۆکراسی دوو سەرچاوەی هەیە: یەکێکیان گۆڕینی دیموکراسی پەرلەمانی بۆ دیموکراسی جەماوەری و ئەوی تریان بەجێهێشتنی ئابوری پشبەستوو بە کێبڕکێ و گەیشتن بە ئابوری رێکخراو. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم رەوتە دیارە و لە پێش چاوی خودی ئێمە بەردەوامی بە پێشکەوتنی ئەدات، بەناچار پێویست نیە دەسەڵاتی سیاسی بکەوێتە دەست بیرۆکراتەکان. زۆربونی فراوانی و ژمارەی بونیادی بیرۆکراسی، تەنها رەنگە نیشانەی ئەوە بێت کە گروپە کۆمەڵایەتیە باڵادەستەکان، هەموو رۆژێک پێویستیان بە بیرۆکراتی زیاتر هەیە بۆ ئەوەی بتوانن کارەکانی دەسەڵاتی سیاسی راپەڕێنن. بەڵام ئەوەی کە ئەڵێن زوربونی ژمارەی بیرۆکراتەکان بەمانای زیادبونی دەسەڵاتیانە، دەرئەنجامی جیانەکردنەوەی سێ مەسەلەیە لە یەکتر لەو شتەدا کە پێی ئەگوترێت رووکردنە بیرۆکراسی: یەکەمیان رەفتاری بیرۆکراسی، دوهەم بونیادی بیرۆکراسی، سێهەم دەسەڵاتی بیرۆکراسی. گومانی تیا نیە رەفتاری ئیداری یان بیرۆکراسی (کەمتازۆر بەمانای کاری یەک ریتم و دوبارە لەبری داهێنان و خوڵقاندن) لە پەرەسەندندایە. چالاکی

لە هیچ بەڕێوبەرایەتیەکدا بەدەر نیە لەم حوکمە. لێرەدا ناچینە ئەو وتوێژەوە ئایا رەفتاری لەمچەشنە سودمەندە یان نا، هەر ئەوەندە بەسە ئەوە بە بیر بێنینەوە کە ئاسایشی ئێمە لە ژیاندا تاچەند بەستراوە بە باشی رەوتی ئەمجۆرە کارە یەک ریتم و دوبارەبوانەوە. جگە لەمەش بەهیچ شیوەیەک راست نیە کە بڕیارەکانی بیرۆکراتەکان (چ لە دەوڵەت یان لە کەرتی تایبەتیدا) هەمویان یەک ریتم و دوبارەن. زۆرێک لەم بڕیارانە رەهەندی داهینان و خوڵقاندنیان تیادایە و نە لەسەر بناغەی دیدی رابردوو ئەدرێن و نە لەسەر بناغەی رێساکانی کاریان پی ئەکرێت. بڕیاردەر بە پێی بابەتەکە و بەپێی دیاریکردنی خۆی زۆر بڕیار ئەدات و لێرەوە کارەکەی خەسڵەتی یاسادانان وەرئەگرێت. دواجار نابێت ئەوە فەرامۆش بکەین کە رێکخستنی بیرۆکراسیانە – واتە زنجیرە پلەیەک کە تیایدا فەرمانەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە و بەرپرسیارێتیەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە ئەکەوێتە کار – تەنها تایبەت نیە بە بابەتە دەوڵەتیەکان. راستیەکان پەیوەندیان بەم مەسەلەیەوە هەیە، بەتەواوی روونە.



لینین

ڕەواجی ڕەفتاری بیرۆکراسی و زیادبونی بونیادی بیرۆکراسی، بەردەوام لە ڕودانـدایـە. بـەڵام لەم پێشەکیەوە ئەوە ناچاری نیە کە دەسەڵات (چ لە دەوڵەت و چ لە کەرتی تایبەتیدا) گواستراپێتەوە بۆ بیرۆکراتەکان. ناکرێت بەشیوەیەکی ئەبستراکت وەڵامــی ئــەم مەسەلەیە بـدرێتــەوە، تەنها بە لێکۆڵینەوەی پراکتیکی ئەکرێت روون بکرێتەوە کە ئایا دەسەڵات ئاڵوگۆر بووە یان نا. بەڵام بەداخەوە ئەمجۆرە لیکۆڵینەوانە زۆر دەگمەنن.

یەکێتی سۆڤێت ئاشکراترین و بەرزترین نمونەی وڵاتیکە کە دەسەڵاتی سیاسی تیایدا نەک هەر بە بەرزترین پلە گەیشتووە، بەڵکو بناغە و سەرچاوەی هەمووجۆرە دەسەڵاتێکی ئابوریە. ئەڵمانیای نازی نمونەی قۆناغێکی تێپەر یـان گواستنەوە بوو. هەموان ئەزانن کە حیزبی نازی بە هاوکاری سیاسی و مادی سەرانی کەرتی تایبەتی ئەڵمانیا گەیشت بە دەســەڵات. بێگومان ڕابەرانی کەرتی تایبەتی ئومێدوار بوون کە بۆ پێشخستنی بەرژەوەندیەکانیان سود لە حیزب وەربگرن. بەڵام هەر ئەوەندەی حیزب دەسەڵاتی گرتە دەست، خۆی لەژێر باری دەسەڵاتی کەرتی تایبەتی هێنایە دەرێ و بوو بە خاوەن دەسەڵاتێکی سیاسی سەربەخۆ و تەنانەت لەمەش زیاتر ڕۆیشت و بە نیازی دروستکردنی دەسەڵاتی ئابوری تایبەت بە خۆی بوو. ئاشکرابوو کە دەسەڵاتی سیاسی تازە لە بیری دروستکردنی پێگەیەکدایە بۆ دەسەڵاتی ئابوری کە تایبەت بێت بەخۆی. گرنگی کارتلی گۆرینگ لەمەدا بوو. ئەم کارتلە لە گرێدانی دەزگا بەرژەوەندیەکانی بەرەی کرێکار و ئیس ئیس و پارەی دەستبەسەراگیراو لەئەنجامی بەرنامەی ئارییکرنی (سەرمایەکان) دروست بوو بوو. بەڵام بە ڕودانـی جەنگ، ئەنجامدانی گۆڕانکاری گەورە لە دەزگاکانی وڵاتدا بە قازانجی بەرژەوەندی وڵات نەزانرا و ڕوداوی ناوبراو ڕاوەستا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بەڵگەنەویستە کە ئەگەر جەنگ ڕوی نەدایە یان نازیەکان سەرکەوتنایە، هەمان نمونەی سۆڤیەت لە ئەڵمانیاشدا ڕوی ئەدا.

بەگشتی بەرامبەر بە باڵادەستی دەسەڵاتی سیاسی، کاردانەوەی دوژمنانە پیشان ئەدرێت. لەهەمووی سەرنجراکێشتر ئەوەیە کەسانێک هەن هەوڵئەدەن ئەم دیاردەیە بگەڕێنەوە بۆ دیموکراسی. دیارە ئەوە ڕاستە وەک پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، بێگومان دیدی دیموکراسی بۆ دەسەڵاتی سیاسی پۆزەتیڤە. بـەڵام کەسانێک کە بڕوایان بەم قسەیە هەیە - قسەیەک کە بەهیچ شیوەیەک تەنها زانستی نیە، بەڵکو ڕەهەندی سیاسیشی هەیە - مەبەستیان شتێکی زیاترە لەمە و بە ناڕاستەوخۆ ئەیانەوێت بڵێن دەســەڵاتــی سیاسی بەهۆی دینامیکیەتی خۆیەوە، دواجار خراپ بەکار ئەهێنرێت و ئەبێتە هـۆی دروستبونی دەزگــا تۆتالیتارەکان. ئەو ڕەخنەگرانەی پڕوپاگەندە بۆ ئەم بڕوایە ئەکەن، لەڕاستیدا ڕێگەی کەسانێک ئەگرن کە لە ڕابردودا لەبری دەسەڵاتی سیاسی، ڕەخنەیان لە دیموکراسی ئەگرت. دۆمستر و بۆنال سەریان لە گۆر هێنایە دەر و لەم پێشەکیە دەرونناسیە لاواز و بێ بناغەیەوە کە بڕوای بە بەدکاری و خراپی سروشتی مرۆڤەوە هەیە، ئەو ئەنجامگیریە ئەکەن کە گۆڕانی دیموکراسی بۆ حکومەتی «هەرچی وپەرچی» کارێکی ناچاریە و کاتێکیش حکومەتی هەرچی و پەرچی هاوکات بوو لەگەڵ ڕەوتی تازەی دەستێوەردانی دەوڵەتەوە، ئەوا بە ناچار ئەبێتە هۆی دروستبونی تۆتالیتاریسم. بۆ دەرمانی ئەم دەردە، پێشنیاری حکومەتێکی ئەرستۆکراتی ئەکرێت. جۆری دوهەمی کاردانەوە لە

لایەن ئەو کەسانەوەیە کە بڕوایان وایە بیرۆکراسی دوژمنی ئازادیە و هەوڵئەدەن دیموکراسی یەکسان بکەن بە ئازادی فەردی و هەردوکیان لەبەرامبەر دەوڵەتدا دابنێن.

کەسانێک کە ئەم دووجۆرە کاردانەوەیە لەخۆیان پیشان ئەدەن، هەمویان شتێک بە بناغەی کارەکە دائەنێن کە ناویان ناوە نەریتی شارستانیتی رۆژئاوا. بروایان وایە ناوەڕکی ئەم نەریتە بریتیە لە نەیارێتی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا بەو شێوەیەی کە لەو رژێمانەدا دەرئەکەوێت کە لەسەر بناغەی مافە بنەڕەتیەکان دامـەزراوە. بەڵام ئەم بڕوایە تەنها بەشیک راستی تێدایە، لەبەر ئەوە درۆیە. نەریتی شارستانیتی رۆژئـاوا دەوڵەمەندتر و ئاڵۆزترە لەمانە. دەوڵەمەندی ئەم نەریتەمان لە پۆلێنکردنی شێوازەکانی روانیندا بۆ دەسەڵاتی سیاسی باسکرد. ئـەوەی بەڵگەنەویستە گرنگی رەگـەزی رۆسۆیسم لە نەریتی سیاسی دیموکراسیدا، زیاترە لە گرنگی تێزە ناکۆک و خۆبەخۆکانی لۆک و لایەنگرانی یاسای سروشتی. گومانی تیا نیە کە دەسەڵاتی سیاسی (چ لە حکومەتی خەڵک و چ لە حکومەتی ئەرستۆکراتەکان و چ لە حکومەتی پاشایەتیدا)، رەنگە خراپ بەکار بهێنرێت. ئەوەی جێگە بۆ گومان ئەهێڵێتەوە ئەوەیە کە بە دەستور بتوانرێت رێگە لە خراپ بەکارهێنانەکان بگیرێت. کێشەی ئەمڕۆی دیموکراسی بەرلەوەی سنوردارکردنی دەسەڵاتی سیاسی بێت، سودوەرگرتنی عەقڵانینانەیە لە دەسەڵاتی سیاسی و رێ و شوینەکانی بەشداری خەڵک لە کارەکانی دەسەڵاتی سیاسیدا.

## ٥ - دیاریکردنی دەسەڵاتی سیاسی

لە یەکیتی سۆڤیەت کەم کەس گومانی هەیە لـەوەی ناوەندی دەسەڵاتی سیاسی لە کوێدایە. لە ئەڵمانیاشدا پاش یۆنێوی ١٩٣٤ کەس گومانی لەوەدا نەبوو کە حیزبی پاوانکەری (نازی) هەموو دەسەڵاتی سیاسی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە. بەڵام لە دیموکراسیە لیبرالیەکاندا (و بە گشتی لەو رژێمانەدا کە لەسەر بناغەی مافە بنەڕەتیەکان دامـەزراون) دیاریکردنی دەسەڵاتی سیاسی بی ئەندازە زەحمەتە. بـروای ئیمە بـەوەی دەسەڵاتی سیاسی سەرچاوە لە دەسەڵاتی ئابوریەوە وەرئەگرێت، رەنگە تەنها چوارچێوەیەک بۆ شیکردنەوەی پێویست ئامادە بکات، چونکە بەتایبەتی پێشتر ئـەو چاڵەمان باسکرد کە «دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی لە موڵکایەتی تایبەتیەوە سەرچاوە ئەگرێت یان ئەکەوێتە دژایەتی کردنی». دابەشکردنی بیروڕای لەگەڵ (موافق) و نەیار(مخالف) جیاوازە، لێرەوە شیکردنەوەی ئەزمونیانەی ئەم پەیوەندیە دولایەنیە لەروانگەی کۆمەڵناسیەوە، بۆ زانای زانستە سیاسیەکان زۆر گرنگی تایبەتی هەیە.

لێکۆڵینەوە لە رژێمەکانی حومکڕانی زۆر یارمەتی چارەسەری ئەم کیشەیە نادات، شێوەی حکومەت رەنـگـە شـێـوەی واقـعـی دابەشکردنی دەسـەڵات پیشان بدات و رەنگیشە پیشانی نەدات. تیورەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان رەنگە ئاشکراکەری ئەو راستیە بیت کە هاوسەنگی هیزە کۆمەڵایەتیەکان، هـاوشـیـوەی هاوسەنگی دەزگـا سیاسیەکانە و رەنگە بەهیچ شێوەکیش وا نەبێت. بەشیوەی ئاسایی هاوشێوەبونی وا بونی نیە. دەستور تەنها چوارچیوەیەک بۆ کارکردنی دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوە ئەدات، بەڵام ئەوە دیاری ناکات کە ئەم دەسەڵاتە بە دەست کێوەیە یان چۆن کارئەکات. سەرجەم ئەو چەمکە یاساییانەی لە رابـردووەوە

پێمان گەیشتووە، چەمکی نێگەتیڤن کە بێ ئەوەی شکڵ بە چالاکیەکان بدات، تەنها بواری کارکردن سنوردار ئەکات. هاوڵاتی هەر لەبەر ئەم خەسڵەتەی یاساکان، خاوەن کەمترین زەمانەتە. راستی تایبەتی ئەم حوکمە دەسەڵاتدارێتی دەرەکیە کە تا هەنوکە خۆمان لە بەکارهێنانی بە دوور گرتبوو. ئەم چەمکە رونی ناکاتەوە کە مافی حوکمرانی هی کێیە یان چ سودێک لێی رێگەپێدراوە یان ئەشێت چ سودێکی لی وەربگیرێت، تەنها سنوری دەسەڵاتی یەکەیەکی زەوی لە یەکەیەکی دی جیا ئەکاتەوە. چەمکی موڵکایەتیش دەقـاودەق بەهەمان شێوەیە، واتە بابەتی موڵکایەتی یان کارکردنە کۆمەڵایەتیەکەی ئاشکرا ناکات، تەنها مافی دەستکاریکردنی مرۆڤ بۆ بەشیک لە سروشتی دەرکی دابین ئەکات. لە لایەکی ترەوە دەستور پیشانی ئەدات کە شێوەی رەوای بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی چیە. ئەگەرچی نابێت گرنگی ئەم دوو لایەنەی دەستور بەکەم بگرین، بەڵام لەهەمانکاتدا نابێت لێکۆڵینەوەی پراکتیکی کۆمەڵناسیانە لەبارەی دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسیشەوە فەرامۆش بکەین.

لەهەندێک بـارودۆخـدا لەچاوتروکانێکدا دەرئەکەوێت دەسەڵاتی سیاسی لە کوێدایە. نمونەی ئەم بارودۆخە، کاتی ئابڵوقەدانی جەنگی، حکومەتی سـەربـازی و ئەمجۆرە دۆخانەیە. کارل شمیت پسپۆری بەناوبانگی نازی لە دەستوردا، پێش ئەوەی ببێ بە نازی وتبوی: «حوکمڕانی لای کەسێکە کە لەکاتە پەشێویەکاندا بـریـاردان لای ئـەوە» گەرچی دەرئەنجامەکانی تیورەی شمیت لەبارەی حوکمڕانیەوە، بۆ ئێمە جیگەی قەبوڵ نیە. بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە لێکۆڵینەوەی ئەمجۆرە دۆخە پەشێوانە هێمای گرنگ سەبارەت بەو مەسەلەیە بەدەستەوە ئەدات کە لە دۆخە «ئاسایی»ەکاندا، لە کوێ بەدوای دەسەڵاتی سیاسیدا بچین. یەکیک لە دۆخە نائاساییەکان لە رۆژی ٣٠ یۆنیۆی ١٩٣٤ لە ئەڵمانیای نازیدا هاتەپێشێ. تا ئەو رۆژە مومکین بوو گومان هەبوو بێت کە ئایا دەسەڵاتی سیاسی بەتەنیای لەدەست حیزبدایە، تا لەدەستی پێکهاتەیەک لە حیزب و سوپا و سەرانی بەشی تایبەتی و ئەوانی تر. بەڵام پاکتاوکردنی گروپی رۆم و ژەنەڕاڵەکان و ئەوانی تر، بە تەواوی ئاشکرای کرد کە حیزب دەسەڵاتی سیاسی بۆ خۆی پاوان کردووە.


چارلس ساندرس

## ٦ - دەسەڵاتی سیاسی و ئازادی

لەسەرەتای باسەکەدا جەختم لەوە کرد کە دەسەڵاتی سیاسی نە بەچەمکی وزەی فیزیا ئەپێورێت و نە تاکە چەمکە لە زانستە سیاسیەکاندا. بەڵام دەربرینی بابەتەکە وەک «دەسەڵات لەبەرامبەر بیرکردنەوە»شدا زیاد لە سنور رەنگی ئایدۆلۆژی و رۆشنبیری پیوەیە. ئەگەر مێژوو تەنها بریتی بوایە لە پیکدادانی گروپە دەسەڵاتدارەکان لەگەڵ خاوەنانی بیرکردنەوەدا، ئەوا بیرکردنەوە هەمیشە ئەدورا. گومانی تیا نیە سیاسەت بەمانای ناکۆکی نێوان گروپە بەهیزەکانە و ئەم ناکۆکیانەش بە سەرکەوتن یان شکانی یەکێک لە دوو لایەنەکان یان رێکەوتنی نیوانیان کۆتای دێت. بەڵام رەنگە هەر یەکیک لە گروپەکانی ناکۆکیەکە، لەم هەوڵ و ململانێیەدا لە سنوری بەرژەوەندی تایبەتی تێپەرێت و ببێ بە لایەنگری بیری ئازادی کە هەستیارترین و بنەرەتیترین وێنایە لە فەلسەفەی سیاسیدا. نمونەیەک ئەهێنینەوە. گریمان یاساکانی کۆچکردنی (ئەمەریکا) تان شیکردۆتەوە و بەو ئەنجامە گەیشتون کە هەندێک گروپ لە کەرتی تایبەتیدا بۆ ئەوەی کرێکاری هەرزانیان دەستبکەوێت، فشاریان کردووە بۆ ئەوەی ئاسانگیری زیاتر لەو یاسایانەدا بکرێت. بەڵام ئەو لێکۆڵینەوانەی تا ئێرە کردوتانە، تەنیا بەشێکە لە کاری ئێوە وەک زانای زانستە سیاسیەکان. شیکردنەوەی یاساکانی کۆچکردن لە گورینی مێژووی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاشدا، بەهەمان ئەندازە گرنگە. کەوابوو فەلسەفەی سیاسی ئەبێت ئەوە دیاری بکات کە هەر گروپیکی دەسەڵاتدار تا چ سنوریک لە بەرژەوەندیە تایبەت یان هەندەکیەکانی (بە زاراوەی هیگڵ) تێئەپەرێنن و پشتگیری لە بەرژەوەندی گشتی یان هەمەکی ئەکەن.

دیاریکردنی ئەم خاڵە بەهیچ شیوەیەک ئاسان نیە. هەرچەند بچینە پێشەوە، جیاکردنەوەی ئایدۆلۆژیا لە هەقیقەت زەحمەتر ئەبێت. بەشیک لەم زەحمەتیانە ئەگەرێتەوە بۆ خەسڵەتی ئایدۆلژیانەی سیاسەت لە دیموکراسیەکاندا (کە پێشتر باسمان کرد)، بەڵام لە دوا شیکردنەوەدا ئەگەرێتەوە بۆ فشاری گەورەی دەسەڵات لە بیرورای گشتی. هەر رژێمێکی سیاسی هەوڵئەدات، دروشمە ئەخلاقیەکانی گروپی حوکمران لە زیهنی خەڵکیدا بچەسپینێت. هەرچەند گرفت و تەنگژەکان زیاتر بیت، سەپاندنی ئەم دۆخە بەشێوەیەکی سەختگیرانەتر و توندترەوە ئەنجام ئەدرێت. تاکیش لە بەرامبەردا پەنا بۆ شێوازە جیاوازەکانی شاردنەوە ئەبات و لە هەندێک قۆناغی مێژوویدا، دواجار ئەوە درۆزنە کە بە پلەی قارەمانێتی ئەگات. درۆ (بەشیوەی جیاواز) ئەبێ بە پارێزەر و زەمانەتێک بۆ تاک لەبەرامبەر پروپاگەندەی سەرتاپاگیردا. هەر لەبەر ئەمەش من گومانم لە بەهای تەکنیکی زۆر پێشکەوتوی هەڵسەنگاندنی دیدەکان و بیروراکانە، بەتایبەت هەر دیدێک کە بە گومانەوە تەماشای بونیادەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ بکات. کتێبی «١٩٨٤» جۆرج ئۆرێل لەهەموو رویەکەوە نوسینێکی عاقلانە و درەوشاوەیە، بەڵام لەو فاکتە غافلە کە لە هەر شوێنێک دەسەڵاتی سیاسی هەبێت، فشار و ناچارکردنیش هەیە.

یەکیک لە سەرنجراکێشترین فەیلەسوفە ئەمەریکەیەکان بەناوی چارلز پیرس ئەم خاڵەی لە وتارێکدا بەناوی «سەقامگیرکردنی بیرورا» بەکاریگەرترین شێوە بەمشێوەیە دەربریوە:

«شـێـوازی دەسـەڵاتـخـوازانـە هەمیشە بەسەر مرۆڤەکاندا زاڵ ئەبێت. کەسانێک کە لە دەوڵەتەکاندا ئامرازەکانی زۆریان بەشێوەیەکی رێکخراو لە دەستدایە،

هەرگیز بڕوا ناکەن کە بەڵگاندنە ترسناکەکان نابێت قەدەغە بکرێت. تەنانەت ئەگەر ئـازادی دەربڕین توشی تەنگپێهەڵچنینی ناسروشتیش نەبێت، دیسان هەر یەکێتی بڕوا بە شتێک لە توقاندنی ئەخلاقی دابین ئەکریت کە ئابڕومەندانی کۆمەڵگا ئەیسەلمینن. لە ئەنجامی شێوازی دەسەڵاتخوازی، رێگەی ئاشتی و ئارامی ئەکرێتەوە. هەندێک لێکنەچون و جیاوازی قەبوڵە، بـەڵام هەندێکی تریان (کە بە ترسناک ئەژمێرێت) قەدەغە ئەکرێت. ئەم شتە قەدەغانە لە وڵات و قۆناغە جیاجیاکاندا، جیاوازە. بەڵام بەهەرحاڵ لەهەر کوێ بن ئەوە بەسە پیشانی بدەن کە بڕواتان بە یەکیک لە بروا قەدەغەکراوەکانە، بۆ ئەوەیی ببینن کە چۆن بە دڵرەقی و توندیەکەوە کە تەنها بە روکەش لە گورگکوژی ناسکترە، رەفتارتان لەگەڵ ئەکرێت. هەر لەبەر ئەمە تەنانەت گەورەترین خزمەتکارانی فکری مرۆڤایەتی هیچ کاتیک نەیانوێرا و ئێستاش ناوێرن، کە هەموو بیرکردنەوەکانیان ئاشکرا بکەن. لەبەرئەوە هەر مەسەلەیەک کە بڵێن بۆ ئاسایشی کۆمەڵگا پێویستە، ئەبیت تەنانەت پیش ئەوەی تاوتوێ بکرێت گومانی لی بکریت. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە ئازاردان و عەزیەتکردن هەر لە لایەن کەسانی دیەوە ئاراستەمان ناکرێت. کەسەکان هەرئەوەندەی ببینن بروایان بە مەسەلەیەک هێناوە کە بە پێی پەروەردەبونیان ئەبوو بێزاربن لێی، زۆر نارەحەت ئەبن و خۆیان ئەشکەنجە ئەکەن. لیرەوە تاکی تەندروست و میهرەبان ناتوانێت خۆی لە تەسلیمبون بەو وەسواسە بە دور بگرێت کە بیروڕاکانیان بخەنە بەردەم دادوەری سەرچاوەکانی دەسەڵات».


سەرچاوە:

فرانتس نویمان: ازادی و قدرت و قانون. ترجمه عزت لله فولادوند. شرکت سهامی انتشرات خوارزمی. تهران چاپ اول١٣٧٣.

# عەدالەت و دیموکراسی

نووسینی: ژۆسێ ساراماگۆ
و. لە فارسییەوە: کاوە گۆڵکار

قسەکانم بە گێڕانەوەی کورتەی حیکایەتێکی سەرنجڕاکێش، کە نزیک بە چوارسەد ساڵ پێش ئێستا لە گوندێکی فلۆرانس بۆ گوندنشینەکان ڕوویدا، دەستپێدەکەم.

تکایە بە وردی و جوانی سەرنجی ئەم ڕووداوە مێژووییە بدەن چون بە پێچەوانەی شێوەی باو، پێویست ناکات حیکایەتەکە بەتەواوی ببیستن تا دەرسێکی ئەخلاقی لێ بگرن بەڵکوو هێندە نابات کە دەرەنجامەکە خۆی لێتان ئاشکرا دەبێت.

دێهاتیەکان لەماڵەوەبوون یان لە کێڵگە و مووچەکانیاندا ئیشیان دەکرد و هەرکەس سەرقاڵی ئیشی خۆی بوو. لەناکاو زەنگی کڵێسە لێیدا. لەو سەردەمە ئایینیەدا، واتا سەدەی ١٦ زاینیی، زەنگی کڵێسە ڕۆژی چەندجار لێدەدرا و بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نەبوو و خەڵکەکە ڕاهاتبوون. لێ ئەمجارەیان، زەنگەکە زۆر خەمبار دەهاتە گوێ. ئەم زەنگە بەم شێوە خەمبارە تەنیا ئەوکاتانە لێدەدرا کە کەسێک بمردایە.



ژۆسێ ساراماگۆ

بەڵام خەڵکی دێکە لەبەرئەوەی ئاگاداربوون کە کەس نەخۆش و ڕوو لە مردن نەبوو بۆیە ئەم دەنگەیان بەلاوە سەیربوو.
لەگەڵ دەنگی ناقووسەکە ژنـان ڕژانـە کـۆڵان. منداڵان کۆبوونەوە. پیاوان دەستیان لە کشتوکاڵ و ئیش هەڵگرت. پاش ساتەوەختێک هەموویان لە گۆڕەپانی بەر کڵێسا کۆبوونەوە. چاوەڕوان بوون بزانن ئەمجارە دەبێ بۆ کێ بگرین. زەنگەکە چەند خولەکێک بەردەوام دەنگی دەهات پاشان بێدەنگ بـوو. پاش ساتێک دەرگـەی کڵێسە کرایەوە و دێهاتیەک لەبەر دەرگاکە دەرکەوت. لێ چون ئەم زەلامە ئەو کەسە نەبوو کە هەمووڕۆژێک ئیشی لێدانی ناقووسەکە بوو ئاسایی بوو کە خەڵکەکە لێی بپرسن ئەی زەنگ لێدەرەکە کوا؟ ئەی کێ مردووە؟ گوندیەکە گوتی: ((ئەو لێرەنیە و من ئەمرۆ زەنگم لێدا)) دانیشتوانی دێکە دووبـارە پرسیاریان کرد: ((کەوابێ کـەس نەمردووە؟)) کابراش گوتی: ((نا کەسێک لە شێوەی مرۆڤ نا، من بۆ عەدالەت زەنگم لێدا. چون عەدالەت مـردوە)). بڵێی چی ڕووی دابێت. لەبەرئەوەی دەرەبـەگـی چاوچنۆکی دێ، (کێنت یامارک) ماوەیەک بوو عەرزەکانی داگیر ئەکرد و دەستی ئەگرت بەسەریاندا و ڕۆژ بە ڕۆژ پانتایی زەویەکانی خۆی زیادی ئەکرد و ئەو زەویانەی کە بەدەست خەڵکەوەبوون بەرەبەرە ڕوو لەکەمی بوون. دێهاتی غەدرلێکراو لەپێشدا لەبەرامبەر ئەم ناعەدالەتیە ناڕەزایی دەربڕی. داوای یارمەتی لە کمیسیۆن کرد لەئاکامدا هاتە سەر ئەو قەناعەتەی لە مەحکەمە سکاڵا تۆماربکات. بەڵام ئەمانە هیچیان پێنەکرا و داگیرکردن و دەس بەسەر زەویدا گرتن بەردەوام بوو. ناچار کابرای دێهاتی بێ ئەمەل و نائومێد، بڕیاری دا لە ڕێگەی - گـونـدەوە، کە هەموو تەمەنی لەوێ ژیابوو و دڵ سافانە دێکەی بە پان و بەرینیی دنیا بەرانبەر دادەنا،- مردنی عەدالەت بە هەمووان ڕابگەیەنێت.
ڕەنگە وای بۆچوو کە بەم ئیشە، کە پیشاندەری

ئەوپەڕی توڕەیی و بێزاریی مرۆڤێکە دەتوانێ هەستی خەڵک بجووڵێنێت وەها تەئسیریان لەسەر دابنێ کە هاوکات هەموو زەنگەکانی دنیا - بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی نەتەوەیی و بیروڕا و داب و نەریت - بۆ ڕاگەیاندنی مردنی عەدالەت و بزرنگێنەوە و هەتا ڕۆژی قیامەت کپ و بێدەنگ نەبن.

ئەو ساویلکانە وای دانابوو دەنگی ئەم زەنگە، ماڵ بەماڵ و دێ بەدێ و شار بەشار دەڕوات و سنوورەکان دەشکێنێت. وای دەزانی دەتوانێت لەسەر هەموو چەم و زەریاکان لە دەنگی زەنگ پردێ هەڵبەستێت و خەوی هەموو دنیا بزڕێنێت.

نازانم پاشان چی ڕوویدا. ئایا گوندیەکان دەستی ئەم پیاوەیان گوشی و یارمەتیان دا تا تابلۆ و هێماکان بگوازنەوە بۆ شوێنی خۆی یان بەپێچەوانەوە، دێهاتیەکان دوای بیستنی مردنی عەدالەت، بە سەرشۆڕی و دڵگوشراوی گەڕانەوە سەر ژیانی پڕ لە مەینەت و ئازاری ڕابردوویان؟ هەرچۆنێک بووبێت ئاشکرایە کە مێژوو هەرگیز بە وردی باسی هەموو شتەکان ناکات...

وادەزانم ئەمە یەکەمجارە کە لە شوێنێکی ئەم دنیاە زەنگێک یان جەرەسێکی بێ گیانی مەفرەقی پاش ئەوەی سەدان جار مردنی سەدان کەس ڕاگەیاندوە، جارێک بۆ مردنی عەدالەت گریابێ. لەو ڕۆژەوە، چیتر دەنگی ئەم زەنگە شوومەی فلۆرانس، هەرگیز نەبیستراوە، بەڵام مردنی عەدالەت هەموو ڕۆژێک و ئەمرۆشی لەسەربێت بەردەوامە. هەرئێستا کە لەگەڵ ئێوە قسەدەکەم، لە شوێنێکی دوور یان نزیک، لەپاڵ گوێماندا زەلامێک خەریکە عەدالەت دەکوژێ و هەرجارێک کە عەدالەت دەمرێ دەڵێی ئەوانەی هیوایان پێی بوو یان چاوەڕوانی شتێکیان



لێ دەکرد، هەروا کە مافی ئێمەیش چاوەڕوانی شتێک لە عەدالەت بکەین، لە ئاستی ئەم کێشەیە خۆیان گێل دەکەن و بە کوردی «گەزی چی و جاوی چی» ئێمە تەنیا بۆمان هەیە لە عەدالەت بەس چاوەڕێی عەدالەت بکەین و هیچی تر.

بەڵام نە ئەو عەدالەتەی کە لە شانۆدا دەیبینین و ئەکتەرێ دەوری قازی و حەکەم دەگێڕێت و عەدالەت بە وشە و گوڵی ڕەوانبێژیەکی بێهوودە دەڕازێنێتەوە و دەیسەپێنێت بەسەرماندا.

نە ئەو عەدالەتەی کە ڕێگەی داوە چاوی ببەستن و بۆ لەخشتەبردنی خەڵک تای تەرازووەکە دەستی تێوەردەن. نە ئەو عەدالەتەی کە شمشێرەکەی زیاتر بەلایەکدا سەر لە جەستە جیادەکاتەوە و ئەیپەڕێنێت. ئێمە بەپێچەوانەوە چاوەڕێی ئەو عەدالەتەین خۆبەزلزان نیە و یار و هاوڕێی ڕۆژانەی مرۆڤەکانە. ئەو عەدالەتەی کە لە مانای ڕاستەقینەدا دروستکاری، بەبێ ئەملا و ئەولا هاوتای زانستی ئاکارە. ئەوەندەی کە خواردن بۆ مانەوەی ژیان و بەختەوەری بەکەڵکە. ئەم عەدالەتەش دەبێ ئەوەندە دەرباستی گیان و ڕۆحەکان بێت. دادگای بۆ هەموو شتێکی یاسا و ڕێسای خۆی بۆ داناوە و زیاد لەمانەش عەدالەتێکە تەئسیر دادەنێت ڕێز لە مافی بوون کە مافی هەرکەسێکە دەگرێت و وەکوو حوکمێکی ئەخلاقی خۆی پیشاندەدات.

بەختەوەرانە ناقوسەکان تەنیا بۆ مردن و شین گێڕی بەکارنەهێنراون. لێدانی زەنگ بۆ پیشاندانی کاتەکان و ئاهەنگ و دەعوەتی ئیمانداران بۆ جێژن و خواپەرستی بەکارهاتووە. لە ڕۆژگارانی دوورتر، جەرەس خەڵکی لە ڕووداوی سروشتی و لافاو و ئاگرکەوتنەوە یان هەر مەترسیەک ئاگادارکردۆتەوە. ئەمڕۆکە دەوری کۆمەڵایەتی زەنگ تەنیا بۆ کاروباری ئایینیە و بەس و ئیشی ئەو دێهاتیە دڵ فاسە فلۆرانسیە بۆ ئاگادار کردنەوە بە کارێکی شێتانە و خراپتریش لەقەڵەم دەدرێت. ئەو کارەی ئەو ئەمڕۆ دراوە بە پۆلیس. ئەمڕۆ زەنگی کڵێسە ئەو ئەرکەی لەسەرشان نیە. ئێستا زەنگی تر- جیاواز لە زەنگی ئەو زەلامە دێهاتیە - ئەو کارەیان پێ سپێردراوە تا باسی ئیمکانی دامەزراندن و دابین کردنی عەدالەتێک بکات کە دەبێت هاوڕێی مرۆڤ بێت و ئارمانجی بەختەوەری ڕۆح و جەستەیە. ئینسانە و پارێزگاری ئینسانە. هەرچەند کە ئەمە شتێکی سەیرە و سەرسوڕهێنەر.

ئەگەر ئەم عەدالەتە بەڕاستی بوونێ هەبێت چیتر نابێ کەسێک لەبەر برسێتی و نەخۆشی (چارەسەرکراو) بمردایە. ئەگەر ببوایە نابێ زۆرینەی خەڵک ژیان و بوونیان تژی بێت لە ئازار و نەگبەتی. ئەم زەنگە تازانە، کە بەرزتر لە جاران لە هەموو دنیادا زرنگەیان دێت هەر ئەو بزوتنەوەی بەرگری و کۆمەڵایەتیانەن کە بۆ بەرزکردنەوەی عەدالەتی نوێ دابەشکراو، بەپێی لێهاتوویی مرۆڤەکان هەوڵ ئەدەن و دەیگۆڕن تا هەموو تاکی مرۆڤ هەست بکا ئەم عەدالەتە هی خۆیەتی و لایەنگری ئازادیە و هەرشتێک کە ئازادی و حەق ئینکار بکات بەرەوڕووی دەوەستێتەوە. بۆ دامەزراندنی ئەم ئازادیە و بۆ بەکارهێنانی نیازمان بە کۆد هەیە تا هەموو مرۆڤێکی ئاقڵ و تێگەیشتوو بتوانێت بەکاریبهێنێت و ئەمانەش تێکڕا، زیاد لە پەنجا ساڵە لە ڕاگەیاندنی دنیای مافی مرۆڤدا نووسراوە. مەبەستم ئەو سی مافە بنەڕەتیەیە کە ئەمڕۆکە یان بە کەمی لەبەرچاودەگیرێت یان بە ئاڵۆزی و نادیارەوە باسی دەکەن. ئەم مافانە وەک چۆن چوارسەد ساڵ پێش، مافی موڵکداری

و ئــازادی گوندنشینەکانی فلۆرانس پێشێل دەکـرا هەربەوجۆرە و بگرە زیاتریش لەوکاتە، سووکایەتی بەم مافانە دەکرێ و ناشرینی دەکەن. ڕاگەیاندنەکانی مافی دنیای مرۆڤ پێویستە بەو شێوەیە کە نووسراوە و بەبێ هیچ گۆڕانکاریەک ئەمڕۆکە لە جێگەی بەرنامەی هەموو حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی دنیا دابندرێت لەبەرئەوەی بـە قازانجیانە و ڕاسـتـی و دروسـتـی و پاکی ئوسول و مەبەستەکانیان بە ڕووناکی پیشان دەدات و دەبێتە کۆڵەکەی قایم و بڕواپێکراو لە بەرژەوەندی ئەو ڕێکخراوانە. بەتایبەت ئەو حیزبانەی ناوی چەپیان لەسەرە و لە بەرانبەر ڕوداوە توند و واقیعیی تاڵی دنیای ئەمڕۆ بێهێز و لاوازانە، سەریان سووڕماوە و لە جووڵە کەوتوون و لە بەرانبەر هەڕەشەی ترسهێنەر لە ئێستا و داهاتوودا بۆ سەر کەرامەت و عەقڵ و ئابڕوو و ئیحساسی مرۆڤ، کەڕ و کوێرن و خۆ گێل دەکەن. لەکاتێکدا کە ئەم شتانە سەرترین و جوانترین ویست و حەزی هاوبەشی نێوان تاکەکانی مرۆڤە. ئەم خۆ گێل کردن و چاوپۆشینە هەروەها تێکڕای سەندیکا (نەقابە) و بزوتنەوەی سەندیکایی دنیا لەخۆدەگرێت و شموولی هەموویان دەکات.

لەم ڕووەوە سەندیکای گوێڕایەڵ و نەخۆشی دەسـەڵات (حکوومی) کە بۆ ئێمە بە میرات ماوەتەوە بەرپرسی یەکەمە لە بێ جووڵەیی و داهێزرانی کۆمەڵایەتی کە خـۆی دەرئەنجامی ڕەوتی بە دنیای بوونی ئابووریە. حەزناکەم ئاوا قسەبکەم لێ ناتوانم بێدەنگیش بم. خۆ ئەگەر ڕیگەم پێبدرێت شتێک بخەمە سەر حیکایەتەکانی لافۆنتێن (شـاعـیـر و نـووسـەری فـەرەنـسـی) بەدڵنیاییەوە ئەگەر بە وەختی خۆی بەرەوڕووی ئەم دیاردانە نەبینەوە لەئاکامدا، پشیلەی بە دنیای بوونی ئابووری مشکی مافی مرۆڤ هەلاهەلا دەکات.

ئەم دیموکراسیە زادە و بەرهەمی فکری ئاسینای دڵ سافە کە پێیان وابوو دەق و شێوازی کۆمەڵایەتی و سیاسی تایبەت بەو سەردەمەیە و دەیانگوت بەپێی ئەم سیستەمە هەر تاکێکی کۆمەڵگا مافی هەیە ئازادانە و بێ بەرهەڵست لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێت و بڕیار لەسەر بابەخەکانی ئەو کۆمەڵگایە بدا و لە کار و چالاکی و بەرهەمی ئەو کۆمەڵگایە هاوبەش بێ و هەروەها بەرپرس بێ، بەڕاستی ئەم دیموکراسیە چی بەسەرهات؟ ئێستا ئەو کەسانەی کە گومان لە دڵپاکیان ناکرێت، یان ئەوانەی کە بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا دەبینن کە خەڵک بە باشیان بناسێت لەسەر ئەو قەناعەتەن کە ئەگەرچی باری زۆرینەی خەڵک لەسەر ئەم گۆی زەویە باش نیە و ئەمە شتێکی حاشاهەڵنەگر و ئاشکرایە سەرەڕای ئەمە نابێت بێ ئەمەل ببین و لە چوارچێوەی نیزامێکی تـەواو دیموکراتدا، ئیحتیمال و ئیمکانی ئەوە هەیە کە دەسەڵاتەکان ناچار بکرێن، - نەک بەتەواوی بەڵکوو تاڕادەیەک - ڕێز لە مافی مرۆڤ بگرن و خەڵک بەختەوەر بکەن. دڵنیام بەو مەرجەی سیستم و دەسەڵات و شێوەی بەڕوەبردنی کاروباری کۆمەڵگا لەسەر بنەمای دیموکراسی بێت مافەکان دەستەبەر بکرێن بەڵام واش نیە.

ڕاسـتـە دەتـوانـیـن دەنـگ بـدەیـن و نوێنەر هەڵبژێرین و ئەم نوێنەرە هەڵگری ڕا و ویست و حەزی ئێمەیە، ڕاستە کە دەتوانین لە ڕێگەی پارتە سیاسیەکانەوە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ نوێنەر بنێرینە پەرلەمان و، ئەم نوێنەرانە لە

ڕێگەی هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبێکی تر یان بە تەنیا خۆیان زۆرینەبن و دەوڵەت دروست بکەن بەڵام ئەمەش ڕاستە ئیمکانی بزاوی دیموکراتێک لەم پرۆسەدا دەست پێدەکات و هەو لەوێشدا کۆتایی پێدێت.

دەنگدەرەکان دەتوانن ئەو دەوڵەتەی کە حەزیان لێ نیە لای ببەن و بیڕوخێنن دەوڵەتێکی تر هەر لە ڕێگەی دەنگدانەوە لە جێگەی دابنێن. بەڵام ئاشکرایە ئەم دەنگانە ناتوانن هیچ کاریگەریی و دەورێکی بەرچاویان لەسەر دەسەڵاتی ئابووری چ لە دنیا و چ لە وڵاتەکەی و چ لەسەر خودی کەسەکان هەبێت لەکاتێکدا ئەم دەسەڵاتی ئابووریە تاکە هێزی واقعییە کە بەردەوام باڵادەکات و پەرەدەستێنێت. ئەویش لە ڕێگای کۆمپانیای چەند نەتەوەییەوەیە کە بەرژەوەندیان لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگا کە دیموکراسی لە پشتە، یەک ناگرنەوە.

هەموومان ئەم ڕاستییە دەزانین بەڵام لەبەرئەوەی مێشک و زەینمان ڕانەهاتووە بە ڕووتی واقعی شتەکان ببینین بۆیە هەمدیسان باسی دیموکراسی دێنینەوە ئاراوە و بەجۆرێک باسی دەکەین وەک ئەوەی دیاردەیەکی زیندوو تەئسیردانەر بێت لەکاتێکدا تەنیا شێوە و ڕواڵەت و یاسا و ڕێساکانی ماونەتەوە کە زەرەر و ترسی بۆ کەس نیە و تەنیا بوونەتە داب و نەریت.

ئێمەی زل کوێر نابینین کە دەسەڵاتەکانمان هەڵبژاردووە بۆ هەل و مەرجی باش و خراپ لە ژیانماندا. کەچی یەکەمین بەرپرسانی هەڵبژێردراو ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ دەبنە کۆمیسێری سیاسی دەسەڵاتی ئابووری بۆ دانانی یاسا و ڕێسای گونجاو و دواتر ئەم یاسایە لە ڕێگای ڕیکلامەوە شیرین دەکرێن




**ساراماگۆ**

لەبەرچاومان و بە ڕەسمی یان تایبەتیی تەنیا لە بەرژەوەندی خۆیان دەینێرنە بازاڕی کۆمەڵگا بەبێ ئەوەی کەس دەنگی ناڕەزایی دەرببڕێت.

دەبێ چی بکەین؟ ئەمڕۆ کە ئەدەب و ژینگە و کاکێشانەکان و گەرم بوونی پلەی گەرما لە دنیادا و هەتا ئاپووره و ترافیک هەموویان دەکرێت لەسەری مناقەشە و وتوویژ بکرێت بەڵام ئەمە سیستەمی دیموکراسی ناگرێتەوە. دەڵێی ئەم شتە بەدڵنیاییەوە دامەزراوە و پێویستیی بە گۆڕانکاری نیە و هەتاهەتایە دەبێت هەر بەم چۆرە بەکاری بهێنین و گفتوگۆ هەڵناگرێت.

ئەگەر لە تەندروستی خۆم دڵنیابمکە هەم دەڵێم زەرووره پێش وەخت لەسەر ئەم شتانە قسەبکرێت: دیموکراسی و هۆکاری لەناوچوونی، بەشداری خەڵک لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیاندا، دەربارەی پەیوەنی نێوان حکومەتەکان و دەسەڵاتی ئابووری و ماڵی خەڵکیی، ئەو شتانەی یارمەتی دیموکراسی ئەدەن یاخود کۆسپ و ڕێگرن و حاشا لە بوونی دەکەن، لەبارەی بەختەوەریی مرۆڤ و ژیانێکی ئابڕودار و گونجاو، لەبارەی هەژاری و خەونەکانی مرۆڤ یان هەژاری و هیوا و حەزی تاکی مرۆڤ یان بەگشتی کۆمەڵگای ئینسانی.

بەڵێ بەڕاستیی دەبێت لە ئاستی جیهاندا باس لەم کێشانە بکرێت و گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە خۆمان فریوبدەین. هەرچەندە مرۆڤ بە ئەزموون و هەڵە بەردەوامە و هەروابووە.

من قسەکانم کۆتایی پێدێنم تەنیا پێویستە بڵێم بێدەنگ بن و گوێ هەڵبخەن هەست دەکەم ئەو گوندنشینە فلۆرەنسیە بە منارەکەدا سەرکەوتۆتەوە تا زەنگەکە لێبداتەوە و ئەم زەنگەش هەر لێدەدا. تکایە بەس گوێ بۆ زەنگی ئەم کەلسیەیە بگرن.

**سەرچاوە:**

اسطوره و فرهیختگی، چاپی دووهەم - ٢٠٠٩، چاپەمەنی ثالث- تاران، کۆکردنەوە: جەلال شاری

# ماف

نووسینی: ریچارد فاک
و. لە فارسییەوە: ب. باران

چەمکی ماف لەم دەیەی دواییدا بۆتە تەوەرەی سەرەکی تیورە ئەخلاقی و سیاسی و یاساییەکان و گرنگیەکی زیاتری پەیدا کردووە، بە هۆی ئەم گرنگیەوە باشترین تیوریزان و بیرە فەلسەفیەکان لە دەیەی ناوبراودا، بە توندی دەرگری وتوێژی زۆر ناسک لەبارەی ماهیەت و سنوری ئەم چەمکەوە بوون.

وێنای ماف پەیوەندیەکی نزیکی بە داخوازی تاکەوە هەیە بۆ ئەوەی لە بوارێکی دیاریکراودا پارێزراو بێت (کە سەلمینەرەکەی مافە مەدەنی و سیاسیەکانە)، یان مافە یاسایی یان ئەخلاقیەکانی بسەلمێنرێت و پشتگیری بکرێت (بۆ نمونە لە بواری مافە کۆمەڵایەتیەکاندا). ماف رەنگە لە یاسادا جێی کرابێتەوە یان تەنها وەک ئارەزوو بهێنرێتە ئارا. هەروەها رەنگە تێڕوانینی ناکۆک بە یەک بۆ ماف هەبێت کە نمونەکەی وتوێژی نیوان لایەنگران و نەیارانی خستنی کۆرپەلەیە. نەیاران جەخت لەسەر مافی ژیانی کۆرپەلە ئەکەن، لایەنگرانیش جەخت لە مافی هەڵبژاردنی دایک.



ریچارد فاک

دەوڵەت ڕەنگە لە ڕێگەی یاساوە کۆتایی بەم وتوێژە بهێنێت، بەلام لە بنەڕەتدا ناکۆکی هەڵویستە ئەخلاقیەکان کۆتایی نایەت. بەتایبەت کاتێک کەسانێک بی قەید و شەرت، بەرگری لە هەڵوێستێک بکەن. کەسانێک کە وتوێژ بە دژایەتی دوو جەمسەر وێنا ناکەن، بە گشتی لەبارەی خەسلەتی مافی جێی ناکۆکی، ئامادەی سازشن. زەمینەی مێژووی و کۆمەلایەتی و فەلسەفی

گرنگی ماف ڕەنگدانەوەی خەباتی خەڵکە لە چەندان سـەدەدا دژی حکومەتە ستەمکار و مەرجەعەکانی تـری زۆرکــردن و فشار. بــەڵام نابێت سەرکەوتنی مێژووی ماف، لەگەڵ دەرکەوتنی دیموکراسی سیاسیدا تێکەڵبکرێت. مەبەستێکی تری جەختکردن لە مافەکان، پارێزگاریکردن لە کەمایەتیەکان لەبەرامبەر زۆرکردنی زۆرینە، یان پاراستنی تاکە لە گەزەندی نا لێبوردەیی کۆمەڵایەتی و کلتوری. قەبوڵکردنی هێواش هێواشی ئەو ئایدیا لیبرالیە ڕۆژئاواییەی کە تەنها حکومەتی دەستوری خاوەن ڕەوایەتی تەواوە، یارمەتی ئەو وێنا فروانترە ئەدات کە خواستی حکومەتکراوەکان شایستەی تاوتوێ و سەرنجدانە. خەبات بۆ زاڵبون بەسەر ئەو ڕەنجە مرۆییانەی قابیلی خۆلادانن، بەشێوە زۆرەکانی، کورتە و جەوهەری ئەو داواکاریانەیە. دەرئەنجامی ئەم هەولانە خواستی کۆمەڵگایە بۆ سنوردارکردنی دەسەلاتی دەوڵەت و لوتکەکانی تری کۆنترۆڵ (چ بەڕێوبەرایەتی و چ مەزهەبی).

دەرکەوتنی چەمکی هاولاتی ئەم وێنایەی بەهێزتر کردووە کە تاکەکەس خاوەن کۆمەڵێک مافە کە ئەبێت پارێزراو بێت لەدەست هەر سەرچاوەیەک کە بیەوێت هەڕەشەی بکاتە سەر. شایەتی ئەم بڕوایە ڕاپەڕینی مافە مەدەنیەکانی ئەمەریکا بوو لە دەیەکانی ١٩٦٠. بەڵام دەوری پۆزەتیڤی دەوڵەت لە پاراستنی مافەکانیشدا خۆی لە چەند ڕوویەکەوە جێکەی وتوێژە. سەرەتا ئەوەی کە بەتایبەتی لە وڵاتە نارۆژئاوایەکاندا، جیابونەوەی تەواوی دین لە دەوڵەت، ڕەدکراوەتەوە و وێنای دینی باڵادەست بەسەر ڕەفتاری ئەخلاقیدا بە گرنگتر لەو "مافانە" ئەزانرێت کە لە هەنگاوەکانی دەوڵــەت یان پێوەرە نێونەتەوەیەکانەوە سەرچاوە ئەگرن. لەم وڵاتانەدا دەوری پۆزەتیڤی دەوڵەت وەک پارێزەری بەختەوەری و باش ژیانی مرۆڤەکانیش لە ئێستادا کەوتۆتە بەر هێرشی لایەنگرانی پڕ جۆش و خرۆشی ئابوری بازاڕ کە ئەڵێن کارایی و بەسبون لە تەیبەتمەندکردنی سەرچاوەکان،

لەگەڵ مافەکانی پەیوەندی بە بەختەوەری مرۆڤەکانەوە بەتەواوی نەگونجاوە.

مێژووی زمانی ماف وەک زمانی سیاسەت پەیوەندی هەیە بە راوەستان لەبەرامبەر پلەی سەڵتەنەت کە ئەنجامەکەی شۆڕشەکانی ئینگلتەرا و ئەمەریکا و فەرنسا بوو. لە هەریەک لەم دۆخانەدا چەمکی ماف بوو بە ئامێری سەرەکی بۆ نەهێشتنی رووبەڕووبونەوە و دژایەتی نیوان دەسەڵاتی دەوڵەت و ئیرادەی سەربەخۆی خەڵک. لە سەدەی نۆزدە بە دواوە ئەو مەسەلەیەی جێگەی جیاوازی بوو بـەردەوام "مـاف"ی بنەرەتی خەڵک بۆ دەربڕینی رەزامەندی لە رێگەی هەڵبژاردن یان رێگەی تـرەوە بـووە. چەمکی ماف پەیوەندی بە چەمکی رەوایەتی و حوکمڕانی لە چوارچێوەی حوکومەتە یاساییەکاندا هەیە. قەبوڵکردنی "مافی" خودی شۆرش لەبەرامبەر حکومەتە ستەمکارەکاندا، ئاشکراکەری قوڵایی ئەو پەیوەندیەیە کە باسمانکرد. بناغەی ئەم پەیوەندیە دوولایەنیە، بریتیە لە ئەرکی رێزگرتن لە یاسا و مەرجەعیەتی دەوڵەت لە لایەکەوە و ئەرکی حکومەت بە کارکردن بەپێی بنەماکانی ویژدان و رێزگرتن لەلایەکی ترەوە. چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی لە نێوان خەڵک و حکومەتدا، لێرەوە سەرچاوە ئەگرێت. دیارە پەیمانێکی لەمچەشنە لە گریمانەیەکی مێژوویی زیاتر نیە و هەرگیز لە هیچ زەمەنیکی راستەقینەدا نەبەستراوە. بناغەکەی، نەریتی یەهودی-مەسیحیە کە لە دەوری بونی پەیمانێک لە نێوان خوداوەند و بەنی ئیسرائیلدا کە تیاییدا ئەرکە دولایەنەکان قەبوڵبکرێت.

لە گۆڕانی هەنگاوەکانی پەیوەندی بە مافەکانەوە هەیە، کاریگەری فەلسەفی سیاسی لە رەفتارەکانەوە و دەزگا سیاسیەکاندا بە رونی دەرئەکەوێت. بەیانی فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن لۆک کاریگەری بێ چەند و چونی لەسەر مافەکانی خەڵک لە بونیادنانی کۆماری ئەمەریکا پاش شۆڕشکردن دژی حکومەتی کۆلونیالی ئینگلتەرا هەبوو. هەروەها کەسانێک کە شۆڕشی گەورەی فەرەنسایان بەرپاکرد و تەنانەت ئاپۆرای ئەو خەڵکەی لە پاریس بەرێکەوتن، نوسینەکانی ڤۆڵتێر و رۆسۆ و دیدرۆ و ئەوانی تریان لەبەرچاو بوو. ئەو رۆحیەتە شۆڕشگێڕیەی کە زیـادەرەوی بە توقاندنیش گەیاند، لەسەر پیداویستی دامەزراندنی چوارچێوەیەکی تازەی حکومەت دامەزرابوو کە بە یەکجاری سەرەڕۆیەکانی رژێمی سەڵتەنەتی فەرەنسا و کەنیسای کاسۆلیک و ئەو ستەمانەی دەرئەنجامی بونیادی ئابوری دەربەگایەتی بوون، لەناو ببات. بناغەی ئەم چوارچێوەیە لایەنگری شۆڕشگێڕان بوو لە "مافەکانی مرۆڤ" کە بە بروای ئەوان لەپێش هەموو رێگریکەوە بۆ کە دێتە سەر رێ. سەدەی هەژدە بە قەبوڵکردنی ئەو مافانە وەک بناغەی سنوری یاسایی دەسەڵاتی دەوڵەت، کۆتای پێهات.

## مارکسیسم

تەوەرەی قۆناغی دواتر خەبات بوو بۆ سنوردارکردنی دەسەڵاتی بازاڕ بوو. هاتنە سەر شانۆی کرێکاران و وتوێژەکانی مارکسیسم مەسەلەکەی لە ئاستی جیاجیادا هێناوەتە ئارا.

مارکسیست- لینینیستەکان هەقیان بەسەر مافەوە نەبوو و، ئەیانگوت کە دادپەروەری و بێدادی دیاردەیەکی ناچاری حکومەتی چینایەتیە و، تاکە ئامانجیکی سیاسی کە پەیوەندی بە مەسەلەکەوە هەیە، دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتە لەلایەن جەماوەرەوە، چونکە دادپـەروەری لە کۆمەڵگا سەرمایەداریەکاندا مەحاڵ و ستەمکاریش لە کۆمەڵگا بی چینەکاندا مومکین نیە. روخانی یەکیتی سۆڤیەت، ئەمجۆرە روانینە بەگشتی لە هیچ جێگەیەک بایەخی نەماوە و بۆتە هۆی ئەوەی کە بە ئامار و جیبەجێکردنی مافە جیاوازەکان، جەختکردنی لیبرالەکان لەسەر پیویستی خۆ دورخستنەوە لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەهەر پلەیدا بێت. سەر لە نوی بژێتەوە.

شکانی مارکسیسم- لینینیسم شۆڕبۆتەوە بۆ بواری

بەها سوسیالیستیەکان و بەتایبەتی بۆ مافی بیمەی کۆمەڵایەتی و تەندروستی. هەنوکە بۆچونی باڵادەست لە زۆرێک لە کۆمەڵگاکاندا ئەوەیە کە ئەبێت بازار لە دەستی دەستێوەردانی ناڕەوا ئازاد بکرێت و بەمانایەکی تر هەندێک لـەو مافانەی پەیوەندیان بە بیمەی کۆمەڵایەتیەوە هەیە وەربگیرێتەوە. بۆ نمونە سوید کە ماوەیەکی زۆر لە مەسەلەی گەشەکردنی خۆشگوزەرانی و تەندروستی هاوڵاتیانیدا پێشڕەو بوو، لە دەیەی ١٩٩٠ بەو بڕوایە گەیشت کە تواناى کێبڕکێی لە بواری ئابوری جیهاندا بەهۆی زیـادەڕەوی لە بەخشینی مافەکانی بیمەی کۆمەڵایەتیدا کەم بۆتەوە.

### مافەکانی مرۆڤ

لەدوای جەنگی جیهانی دوهەم بە دواوە، جۆرێکی تازەی ماف، واتە "مافەکانی مرۆڤ" پلەیەکی بەرجەستەی وەرگرت. لەکاتی "ڕاگەیاندنی جیهانی مافی مرۆڤ" لە ١٩٤٨دا، حکومەتەکان هێواش هێواش قەبوڵیان کردووە کە سەرجەم خەڵک مافی ئەوەیان هەیە خاوەنی هەندێک پاراستن و هەروەها دابینکردنی پێداویستیە مادیە سەرەکیەکان بن. بزوتنەوەی مافەکانی مرۆڤ بە ئاشکرا ڕەنگدانەوەی باڵادەستی لیبرالیسمی ڕۆژئاوایە لە بواری بەها و بڕوا فەردیەکاندا. هەروەها لە بەڵێننامە نێونەتەوەییەکان هەندێک وێنای سۆسیالیستیش کە ماهێیەتێکی گشتی هەیە و لە قۆناغی جەنگی ساردا لە لایەنی یەکیتی سۆڤیەتەوە پشتگیری ئەکرا، تا ڕادەیەک ڕەچاوکرا.

گشتیترین فورمەلەی مافەکانی مـرۆڤ لە دوو بەڵێننامەدا هاتووە کە لە ١٩٦٦ خرایە بەردەم ئیمزا و سەلماندنی دەوڵەتەکاندا: یەکیکیان "بەڵێننامەی نێونەتەوەی مافە کۆمەڵایەتی و کلتوریەکان" و ئەوی تر "بەڵێننامەی مافە مەدەنی و سیاسیەکان". لەم دوو بەڵگانەدا لە بنەڕەتدا جیاکاری و پێوەرەکان ڕاگەیانران. هیچ میکانیزمێکی بەڕێوەبردنی بوونی نیە و، زۆرێک لە دەوڵەتەکان کە ئەم بەڵێننامەیان ئیمزا کردووە، خۆیان دوچاری دەستدرێژی ترسناک بوون. دەوڵەتەکانی تر لەوانە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، هەرگیز ئیرادەی سیاسی پێویستی بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەڵێننامانە لە خۆیاندا نەدۆزیتەوە. تەوەرەی نەیارێتی ئەم مەسەلانە، بانگەشەی نەیاران بوو لەسەر ئەوەی کە مافەکانی مرۆڤ دەست ئەخاتە ناو دەسەڵاتدارێتی حکومەت کە ئەبێت لە هەموو جۆرە بانگەشەی مەرجەعیەت لەدەرەوە، پارێزراو بێت. بەڵام لەگەڵ ئەم کێشانەدا بزوتنەوەی مافەکانی مرۆڤ بە درێژایی دەیەکانی ڕابردوو هەروا خێرایی زیاتری پەیدا کردووە و وەک بەیانێکی هەمەلایەنی مافە دیاریکراوەکان لەچەند پەیماننامەیەکدا دەرکەوتووە کە تیایاندا زیاتر ڕەچاوی ئەو گروپانە کراوە کە زیاتر زیانیان لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتدا بەر ئەکەوێت. بەرهەمی ئەم کارانە، پەیماننامەکانی وەک مەسەلەی جیاکاری ڕەگەزی و ژنان و منداڵان بووە.

کاریگەربونی مافەکانی مرۆڤ زۆرێک لە چاودێرانی توشی سەرسوڕمان کردووە. حکومەتەکان ئامادەبوون قەبوڵیبکەن کە مافەکانی مرۆڤ چەندان بەرپرسیاری لە مافە نێونەتەوەیەکان دروست ئەکات، بەڵام زۆربەیان ئامادە نەبوون بە کردار ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ بگرن یان لە ڕێگەی دانوستانەوە ڕێگەگەلێک بدۆزنەوە کە دەستدرێژی ترسناک لەناو ببات و پێشبینی جێبەجێکردنی پێویستیان بۆ کرا بێت. لەگەڵ ئەمانەشدا دانانی مافەکانی مرۆی لە پێوەرە نێونەتەوەیەکاندا هێواش هێواش لە ڕووی جـیـاوازەوە گرنگی خۆی پەیدا کردووە. یەکێک ئەوەی کە تۆڕێکی بەرفراوان لە ڕێکخراوی بان نەتەوەیی و نا دەوڵەتی دروست بوون کە سەروکاریان لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا بوو و بە سودوەرگرتن لە زانیاری بەڵگەدار لەبارەی دەستدرێژی و پێشێلکاری ترسناک، دەستیانکرد بە فشارکردن لەو حکومەتانەی کە زۆربەیان گرنگیان بە ئابڕوو و ناوبانگی خۆیان ئـەدا. سـەرەڕای ئەمە ڕای گشتی هەڵسا بە

لایەنگری بەکارهێنانی جەمسەرە ئابوریەکان لە بواری مافی مرۆڤدا کە شایەتی ئەم دۆخە سیاسەت یارمەتی ئابوری دەرەکی ئەمەریکا لە ناوەراستی دەیەی ۱۹۷۰دا بوو.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە روداوە گشتیەکانی سیاسەتی نێونەتەوەیی لەگەڵ ئەو خواستانەدا تەبایە کە پێوەرەکانی مافەکانی مرۆڤدا هاتووە. لەبواری پەیوەندیەکانی خۆرئاوا و خۆرهەڵاتدا رێکەوتننامەکانی ساڵی ۱۹۷۵ی هلسینکی، بەشیوەیەکی سەرەکی لەبەرئەوە بە گرنگ دائەنرێت کە ئەو سنورانەی ئەوروپای بە فەرمی ئەناساند کە لە پاش جەنگی جیهانی دوهەمەوە دروستبوون. لەو رێکەوتننامانەدا چەند پێشبینیەک بۆ بەرپرسیاریتی دەوڵەتە ئەوروپیەکان لەبەرامبەر مافەکانی مرۆڤدا کرا بوو، کە لەو سەردەمەدا وەک پڕوپاگەندەی شەڕی سارد سوکایەتی پێکرا و بە شایەنی سەرنجدانیان نە ئەزانی. بەڵام لێکۆڵینەوەی ساڵانە کە لەبارەی پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤەوە لە ئەوروپای رۆژهەڵات و ناوەندی کە ئەبوو بە پێی رێکەوتننامەی هلسنکی ئەنجام بدرێت، هێواش هێواش چ لە رووی بەهێزکردنی ئیرادەی گشتی لەو وڵاتانەدا بۆ خۆڕاگری و چ لە رووی لاوازکردنی بڕوای حوکمڕانان بە توانای خۆیان بۆ فەرمانڕەوایی، گرنگی زیاتری پەیدا کرد. دەرکەوتنی گۆرباچۆڤ لە کرملین و لایەنگری دەزگای رابەری یەکێتی سۆڤیەت لە پابەندبوون بە مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی، زۆر کاریگەری لەسەر بەهێزکردنی ئەم رەوتانە هەبوو. ئەمرۆ کە تەماشای رابردوو ئەکەین ئەوە ئەبینین کە ئازادی ئەوروپای رۆژهەڵات و ناوەندی و یەکیتی سۆڤیەت رەنگدانەوەی کاریگەری مافەکانی مرۆڤ بووە لە رەفتار و کرداری سیاسیدا.

## ئایندەی مافەکانی مرۆڤ

مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ رەهەندێکی گەردونی وەرگرتووە و ئاڵۆزیەکانی تارەیەک ترسناکە: داهینانی جیاواز بە مەبەستی پێشخستنی مافەکانی مرۆڤ لە ئاستە ناوچەییەکاندا بەرچاو ئەکەوێت. بەتایبەتی لە ئەوروپا کە جۆرێک بونیادی جێبەجێکردن هەنوکە ئەوە بۆ تاکەکان ئەرەخسێنێت هەندێک داوا دژی دەوڵەتی خۆیان بهێنە ئاراوە. جگە لەمە لە رووی زۆرێک لە پارێزگاریکردنەکان، وەک پارێزگاری لە خەڵکی سەرەتایی هەندێک لە سەرزەمینەکان، یان مافەکانی پیاوان و ژنانی هاوجنسباز، پێوەرە هەبوەکان بەس نین و نەگونجاوە. سەرەڕای رێسا و سروشتە نەریتیە نا رۆژئاواییەکان هەنوکە زیاد لە جاران خۆیان دەرئەخەن و ئەوانەی بڕوایان پێیە هەندێکجار وەک رەخنەگرتن ئەڵێن بانگەشەی گەردونی بوونی مافەکانی مرۆڤ بێ بناغەیە و پێشداوەری رۆژئاوای لە پشتەوەیە، بەڵام هەندێک جاریش رەخنە لە خۆیان ئەگرن و ئاماژە بۆ دڵرەقی لە سیستمەی هندویی "کاست" یان سزادانی جەستەیی و بارودۆخی ژنان بە پێی هەندێک بیروڕای ئیسلامی ئەکەن.

بێگومان هەڵچونە بان نەتەوەیەکانی ئەم ساڵانەی دوایی لە بواری مافەکانی مرۆڤدا هەروا بەردەوام ئەبێت و کار لە چۆنیتی ژیانی سیاسی ئەکات. بەهەمان ئەندازە کە هۆشیاری ئێمە لەمبارەیەوە زیاد ئەکات کە ژیان لەناو گوندێکی جیهانیدا بە چ مانایەکە، بە هەمان ئەندازە تەماسی بەردەوامی کلتورەکان لە رێگەی پەیوەندیەکانی ئەمڕۆ و لە رێگەی کۆچکردنەکانەوە لەنێوان کلتورەکاندا زیاتر ئەبێت. ئاسانگیری و لێکبوردن و تێگەیشتن و هەروەها پەنابردن بۆ مافەکان لە کاردانەوە بەرامبەر ئازارەکانی مرۆڤیشدا زیادی کردووە.

سەرچاوە:
فلسفه و جامعه و سیاست. گزیده و نوشته و ترجمه: عزت الله فولادوند. تهران. نشر ماهی، ۱۳۸٦. لا ۱۰۱.

# ئەورووپا چۆن لە سەدەکانی ناوەڕاست هاتەدەرەوە؟

نووسینی: هاشم سالح
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

کتێبی (ڕێنیسانس) لە نووسینی پرۆفیسۆر «جیرالد شاکس»ە، کە لە فەرەنسا بەڕێوەبەری ناوەندی توێژینەوەی باڵایە بۆ سەردەمی ڕێنیسانس. نووسەر لەم کتێبەدا وێنەیەکی وردی ئەو سەردەمە نەمرەمان پێشکەش دەکات کە تێیدا ئەورووپییەکان هەنگاوێکی گەورەیان بەرەو پێشەوە نا، هەنگاوێک بە ئاراستەی مۆدێرنە و هاتنەدەرەوە لە تاریکییە توناوتوونەکانی سەدەکانی ناوەڕاست.

دانەری کتێبەکە، هەر لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێ: چەمکی سەردەمی ڕێنیسانس، لە یەکەم مانایدا، بەو بزاوتە ڕۆشنبیرییە دەوترا کە لە سەرەتای سەدەی چواردەهەم لە ئیتالیا سەریهەڵدا، ئەمە پێش ئەوەی دواتر و لە کۆتایی سەدەکەدا، بە تەواوی ئەورووپادا بڵاوبێتەوە. هەندێک پێیان وایە سەردەمی ڕێنیسانس، دەکەوێتە نێوان سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحی و سەدەکانی مۆدێرنەی عەلمانی و فەلسەفی. کەواتە سەدەکانی ڕێنیسانس لەنێوان ئەو دوو لایەنەدایە.

بەڵام پێویستە دان بەوەدا بنرێت کە بیرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانس، لە سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحی



توڕەبوون، چونکە فەلسەفەی یۆنانی و ستاتیکای ئەدەبی ئەفسانەییان لەناوبردبوو. لە ڕاستیدا ئەو بیرمەندانە، دوای ئەوەی لە دەستی کاهینە تاریکبینەکان ڕزگاریان بووە و ئەدەب و فەلسەفەی یۆنانی و ڕۆمانییان دۆزییەوە، هەستیان دەکرد سەرلەنوێ لەدایکبوونەتەوە. ئەوە ئەو ئەدەب و فەلسەفەیە بوو کە سەدەکانی ناوەڕاست، بە بیانوی ئەوەی حەرامە و مادییە و کوفرە، تاڕادەیەکی زۆر شاردبویەوە. ئێمەی عەرەبیش، لەبەر هەمان هۆکار، ڕازینەبوین تەرجەمەی بکەین. فەلسەفەکەمان تەرجەمەکرد، بەڵام ئەدەبی یۆنانیمان ڕەتکردەوە کە پڕە لە ئەفسانە.

ڕەنگە «بتراک» یەکەم بیرمەند و نوسەری ڕیفۆرمخواز بێت (١٣٠٤-١٣٧٤)، کە بە تەواوی بەسەر ئەدەبی یۆنانی و رۆمانیدا کرابوەوە. بەڵام لەهەمانکاتدا لەسەر ئاینی مەسیحیەت مابوەوە، ئاینی باوک و باپیرانی. لێرەوە دڵی لەگەڵ ئاییندا بوو، کەچی عەقڵی لەگەڵ فەلسەفەدا بوو، ئەگەر ئەو دەربڕینە شیاو بێت.

دانەر پێیوایە ئا لەو کات و ساتەدا زاراوەی «توێژینەوە مرۆڤایەتیەکان» لە بەرامبەر (توێژینەوە لاهوتییەکان) دەرکەوت. مەبەست لە توێژینەوە مرۆڤایەتیەکان، ئەو لێکۆڵینەوانە بوو کە باسیان لە ژیانی ئەدیب و شاعیر و فەیلەسوفە گەورەکانی سەردەمی کۆن دەکرد، سەردەمی پێش هاتنی مەسیحی، وەک هۆمیرۆس و ئەفلاتون و ئەرستۆ و فێرجل و شیشرۆن و دەیانی دیکە.

بەو ئەندازەیەی کە سەدەکانی ناوەڕاست ئەو ئەدیب و شاعیر و فەیلەسوفانەیان، بە بیانوی ئەوەی بتپەرست و کافرن، پشتگوێخستبوو. بە هەمان ئەندازە بیرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانس، بایەخیان پێدەدان و پرۆسەی دۆزینەوە و ئاشکراکردنیان و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە، بە گەورەترین پەیام دادەنا لە ژیانیاندا. لەبەرئەوە، بیرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانس، هەستیان دەکرد، سەردەمێکی تازە لە مێژوو دەژین. هەستیان دەکرد ئەوان لە خەوێکی قووڵی دوور و درێژ خەبەریان بووەتەوە، لە خەوی خەڵکانی ناو ئەشکەوتەکە دەچێت! ئالێرەوەیە دڵیان بە شتەکان خۆشبوو، لە کتێبەکانیاندا هەستیان بە خۆشییەکی گەورە دەکرد. چونکە دۆزینەوە و ئاشکراکردنی ئەو ئەدەبە کۆنەی پێش سەردەمی مەسیحییەت، دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساندن لەو تەنگەنەفەسییە بێنەدەرەوە کە تیۆلۆژیای پیاوانی ئاین سەپاندبویان. «مارسێل فیشان» کە یەکێکە لە بیرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانس، زۆر بە جوانی گوزارشتی لەو حاڵەتە کردووە و دەڵێ: (هەست دەکەم سەردەمێکی زێڕین دەژیم کە هونەرەکانی لیبرالییەتی هێنایەوە بەر ڕۆشنایی، واتە هێنانەوەی زانستی ڕەوانبێژی و نەحو، هونەری وێنەکێشان و پەیکەرتاشی، هونەری تەلارسازی و مۆسیقا). ئاشکرایە مارسێل فیشان (١٤٣٣ - ١٤٩٩) یەکێکە لە گەورە فەیلەسوفەکانی ڕێنیسانس و یەکێکە لەوانەی تا بڵێی سەرسام بووە بە ئەفلاتون و لە میانەی سەردەمی ڕێنیسانسدا، لە ئیتالیا قوتابخانەی ئەفلاتونیەتی دامەزراند.

هەرچی نووسەری فەرەنسی (ڕابیلیە ١٤٨٣-١٥٥٣)یە، یەکێک بووە لە گەورە بیرمەندەکانی سەردەمی ڕێنیسانس لە فەرەنسا. ئەم بیرمەندە گەورەیە قسەوباسی دەربارەی ئەو جیاوازییە گەورەیە کردووە کە لە نێوان تاریکییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، لەگەڵ سەردەمی تازە کە پڕە لە ڕۆشنایی، واتە سەردەمی ڕێنیسانسدا، هەیە. پاشان ئەم وێنە ناشرین و دزێوەی سەدەکانی ناوەڕاست، لە سەدەی نۆزەدەهەمەوە تا ماوەیەکی نزیک پێش ئێستا، لە کتێبەکانی قوتابخانەکاندا دەرکەوت و لە هەموو ئەوروپادا بڵاوبووەوە. بگرە تەنانەت لە جیهانی عەرەبیشدا بڵاوبووەوە.

وەلێ بەم دواییانە، هەندێ لە مێژوونووسان، بەو تێڕوانینە سادە و ساکارە ڕازینەبوون و شتێکی ئاوایان وت: (ناکرێت بە ڕەهای بڵێین سەدەکانی ناوەڕاست هەر هەمووی تاریکی بووە. ناکرێت خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر مێژووی هەزار ساڵی مرۆڤایەتیدا بهێنرێت! لە واقیعدا لەو سەردەمەشدا هەندێ لە بیرمەندی گەورە هەبوون کە لەبەر ڕۆشنایی عەقڵدا کاریانکردووە. گەورەترین بەڵگە
بۆ ئەوە، فەیلەسوفەکانی عەرەب بوون، لە نمونەی کندی

و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد و ئیبن باجە و ئیبن عەرەبی و مەعەڕی و ئەبوبەکری ڕازی... هتد. بەپێی دابەشکردنی ئەوروپا بۆ مێژوی فیکر، هەر هەموو ئەوانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیاون. ئایا پێویستە لەسەرمان ڕقمان لەوانە بێت و لەسێدارەیان بدەین؟).
ئاشکرایە ئەم دابەشکردنەی کات، باس لە سێ سەدەی سەرەکی دەکات کە بریتین لە: سەدەکانی یۆنانی-ڕۆمانی کۆن (لە سەدەی پێنجەمی پێش زاین تا سەدەی پێنجەمی دوای زاین). دوای ئەوە سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحی دێت کە لە ساڵی ٥٠٠ زاینییەوە دەستپێدەکات و لە نزیکەی ساڵی ١٥٠٠ زاینی کۆتایی پێدێت. پاشان سەدەکانی مۆدێرنە دێت کە بە سەدەی ڕێنیسانس دەستیپێکرد و لە ساڵی ١٥٠٠ زاینییەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو فەیلەسوفە عەرەبانەی لەسەرەوە ناویان هاتووە، پێش ساڵی ١٥٠٠ ژیاون، ئەمە مانای وایە ئەوان سەر بە سەدەکانی ناوەڕاستن. باشە ئایا دەکرێ بەوانە بڵێین تاریکبین و دواکەوتوو یان پێیان بڵێین دەمارگیر، وەک ئەوەی ئەو وێنە سادە و ساکارەی لەسەر ئەو سەدەیە هەیە پێمان دەڵێت؟ بێگومان نەخێر.

ئەو فەیلەسوفانە خوێندنەوەی فەلسەفەی یۆنانیان پشتگوێ نەخست، بگرە بە پێچەوانەوە. هەروەها لە زانست و عەقڵ دوورنەکەوتنەوە. لەمەوە دەکرێ باس لە هەندێ لەو فەیلەسوفە مەسیحیانە بکەین کە لە ئەوروپادا دەرکەوتن، دوای ئەوەی کارەکانی فەیلەسوفەکانی ئێمەیان تەرجەمەکرد و بونیادیان لەسەر هەڵچنی. یەکێک لەوانەی لە سەردەمی ڕێنیسانسدا، زۆر سەرسام بووە پێمان «بیک ئەلمیراندولی»ی بلیمەت بووە کە وتویەتی: (لە هەندێ کتێبی عەرەبەکاندا خوێندومەتەوە، مرۆڤ جوانترین و نایابترین شتە لە بووندا) , لێرەوە تەواوی سەدەکانی ناوەڕاست تاریک نەبووە، بەڵکو هەندێ ڕۆشنایی تێدابووە،



کریستۆفەر کۆلۆمبۆس

یان چەند پەڵە ڕووناکییەکی تێدا بووە. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەو سەدانە ڕۆشن نەبووە، چونکە بوونی چەند کەسێکی بلیمەتی ڕۆشنفکر، مانای ڕۆشنفیکری هەموو میللەت ناگەیەنێت.

دانـەری ئەم کتێبە پێیوایە گەڕانەوەی بیرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانس بۆ ڕابردووی دوور، بۆ فەیلەسوفانی یۆنانی و ڕۆمانی و بۆ ئەدەبەکەیان، مانای گەڕانەوەیەکی کۆنەپەرستانە نییە، مانای لە بیرچونەوەی ئێستا و ئایندە نییە. لە ڕاستیدا ئەوە گەڕانەوەیەکی داهێنەرانە بوو، واتە مەبەست و ئامانج لەو گەڕانەوەیە، گۆڕینی ئێستایە، یان تازەکردنەوەی ژیانی ئێستایە بە هەموو لایەنەکانیەوە، ئەمەش لە ڕێگەی ئیلهام وەرگرتن لە سەردەمی زێڕینی ئادابی یۆنانی–ڕۆمانی. لێرەوە ئەو گەڕانەوەیە گەڕانەوەیەک بوو بۆ دواوە لە پێناو بازدانێک بۆ پێشەوە.

لە واقیعدا ئەو وەرچەرخانە فیکرییە گەورانەی لە سەدەی پازدەهەم و شازدەهەمی ئەوروپا ڕوویاندا، پەیوەستە بە سێ شتەوە: یەکەمیان ڕیفۆرمی ئاینی کە لەسەر دەستی مارتن لۆسەر و لە نیوەی یەکەمی سەدەی شانزەهەمدا هاتەئارا. دووەمیان بزاوتی مرۆڤدۆستانەی ڕێنیسانس بوو کە خۆی لە گەڕانەوە بۆ ئەدەبی کۆندا دەبینییەوە، ئەدەبی یۆنان و ڕۆمان و وەرگێڕانیان. سێیەمیان دۆزینەوە گەورەکانی زانست لەسەر دەستی کۆپەر نیکۆس و ئەوانی دیکە کە لەو سەردەمەدا ڕوویاندا. لە ڕاستیدا یەکەمین نیشانە و یەکەمین مژدەی دەرکەوتنی سەردەمێکی تازە بۆ فیکر و بۆ ڕەفتار، لە ئیتالیا و لە کۆتایی سەدەی چواردەهەم و سەرەتای سەدەی پازدەهەمدا، هاتەئاراوە. دەکرێ دۆزینەوە جوگرافیاییەکان و باشتربوونی بارودۆخە ئابورییەکانیشی بۆ زیاد بکەین. بۆ نمونە وەک دۆزینەوەی ئەمریکا، لەلایەن «کریستۆف کۆڵۆمبس»ەوە.


گالیلۆ

هەموو ئەوانە ڕەنگدانەوەیان لەسەر فیکر هەبوو. ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەی لاهوتی چەقبەستوی سواو کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەربڵاوبوو، ڕەخنەگرتنێکی گشتی و سەرتاپاگیر بوو. گەورەترین فەیلەسوف کە ڕەخنەی لەو

فەلسەفەیە گرت، فەیلەسوفی ئیتالی «لۆرینز ڤالا ١٤٠٧ - ١٤٥٧» بوو. ئاشكرایە ئەم فەلسەفەیەی سەدەكانی ناوەڕاست، لەو چركەساتەوە كە كڵێسای مەسیحی تەبەنیكرد و جۆرێك لە سازان و ئاشتبوونەوەی، لەنێوان فەلسەفەی ئەرستۆ و عەقیدەی مەسیحی، خستەڕوو، كۆنترۆڵی تەواوی فیكری ئەوروپی كرد بوو. لەبەرئەوە، فەیلەسوفەكانی سەردەمی ڕێنیسانس، بایەخیان زیاتر بە ئەفلاتون دەدا تا بە ئەرستۆ، ئەمەش لەپێناو بچووككردنەوە و گەمارۆدانی ئەمەی دوایی، واتە ئەرستۆ. لەبەر ئەم هۆكارە، شازادە ئیتالییەكان، ئەكادیمیای ئەفلاتونییەت -یان بۆ بیرمەندە خانەدانەكان دامەزراند و جڵەوی بەڕێوەبردنیان سپارد بە «مارسیل فیشان» كە پێشتر ئاماژەمان پێداوە. ناوبراو یەكەم كەس بوو كارەكانی ئەفلاتونی وەرگێڕا، لەو سەردەمەدا فەلسەفەی ئیتالی پڕ بوو لە كەسایەتییە داهێنەرەكان.

لە هەناوی ئەم داهێنان و خولقاندنەدا، «گالیلۆ ١٥٦٤ -١٦٤٢» دەركەوت كە بنەما سەرەكییە جێگیرەكانی زانستی مۆدێرنی هێنایەئارا. واتە زانستی فیزیا و گەردوونناسی و بیركاری. ئەگەر شۆڕشەكەی ئەو نەبوایە، ئەوا ئێستا نەدەبوینە خاوەنی ئەم هەموو تازەگەرییە نایابەی لەمڕۆدا دەیبینین. لەبەر ئەم هۆكارەیە دەڵێین سەردەمی ڕێنیسانس، هەنگاوێكی گەورەی بەرەو پێشەوە هاویشت، بگرە یەكەم هەناو بوو. لە گرنگترین ئەو فەیلەسوفانەی سەردەمی ڕێنیسانس كە هاوكاربوون لە پێكهێنانی تازەگەریدا، باس لە «نیقۆلا مایكاڤیلی ١٤٦٩ - ١٥٢٧» دەكەین كە بە كتێبی (میر) ناوبانگی دەكرد و هەر ئەویش بوو زانستی سیاسەتی، بە مانا تازەكەی وشەكە، دامەزراند. مەبەستمان لەوە، ئەوەیە ئەو ڕیالیزمی سیاسی دامەزراند كە ناوی خۆیكرد بە بەریدا و وایلێهات پێیدەوترێ مایكاڤیلییەت. بەڵام ئەم زاراوەیە لە بەكارهێنانە بەربڵاوەكەیدا، مانایەكی نێگەتیڤی لەخۆگرتووە. چونكە كاتێ بە كەسێك دەڵێی مایكاڤیلی، ئەوا وەك ئەوە وایە پێی بڵێی بەرژەوەندخواز. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە ڕاست نییە، یان بڵێ بەشێك لە ڕاستی تێدایە، چونكە تیۆری مایكاڤیلی بۆ سیاسەت، زۆر لەوە بەربڵاوتر و ئاڵۆزترە. وەلێ گلەیی ئەوەی لێدەكرێت كە سیاسەت و ئەخلاقی لێكجیاكردەوە، لێرەوەیە بە بەرژەوەندخواز تۆمەتبار دەكرێت. كەواتە هەر هەموو تۆمەتەكە ناڕاست نییە. واتە بەشێك لە ڕاستی تێدایە.

یەكێكی دیكە لەو گەورە فەیلەسوفانەی سەردەمی ڕێنیسانس كە ڕێگایان بۆ تازەگەری خۆشكرد، دەتوانین ناوی «جیۆراندۆ برینۆ ١٥٤٨ -١٦٠٠» بێنین كە بەشێوەیەكی تراژیدی كۆتایی بە ژیانی هات. دادگاكانی پشكنین زمانیان لێكردەوە و پاشان خۆشیان سوتاند، چونكە گومانی لە هەندێ بیروباوەڕی مەسیحی بوو، هەروەها لەبەرئەوەی تەبەنی تێڕوانینێكی زانستی دەكرد بۆ جیهان و گەردون. ئەو لە سەردەمەكەی خۆیدا، گەورەترین فەیلەسوفی ئیتالیا بوو. ئەم فەیلەسوفە دەیگوت زانستی گەردون، ئامانجی ژیانی فەلسەفییە. هەروەها دەیگوت ئەم زانینەش نایەتەدی تەنها لەڕێگەی عەقڵ و تاقیكردنەوەی زانستی هەستپێكراوەوە نەبێت. لەبەرئەم هۆیەیە «هیگڵ» بە یەكێك لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی مۆدرێن دایدەنێت.

پاشان ڕێنیسانسی فەلسەفی گواسترایەوە بۆ دەرەوەی ئیتالیا، واتە بۆ وڵاتانی دیكەی ئەوروپا. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو گواستنەوەیە كاتێكی زۆری خایاند. بڵاوبوونەوەی ڕێنیسانس لە فەرەنسا و ئینگلتەرە و هۆڵەندە و ئەڵمانیا، بە بەراورد بە ئیتالیا كە یەكەمجار ڕێنیسانسی تێدا دەركەوت، زۆر دواكەوت. ئەمەش لەبەرئەوە بوو، خوێندنی لاهوتی سەدەكانی ناوەڕاست، لەو وڵاتانەدا، دەستی بەسەر عەقڵی خەڵكەكەیدا گرتبوو. لێرەوە بیركردنەوەی لیبرالیانەی ئازاد، زۆر بە زەحمەت لەو وڵاتانەدا دەركەوت. سەرەتا لەسەر دەستی چەند نووسەر و زانایەكی كەم دەركەوت، لەوانە ئیراسمۆس، رابیلییە، مۆنتینی، كۆپەرنیكۆس، كلێبەر.

سەرچاوە:
الشرق الاوسط، ٢٠١٢/١٢/٢

# گفتوگۆ لەگەڵ **ئۆرهان پاموک**

و. لە سویدییەوە: هیوا قادر

**پێتخۆشە کە چاوپێکەوتن ئەکەیت؟**

پاموک: هەندێک جار بە وەڵامدانەوەی خراپ لەسەر هەندێک پرسیاری ناپێویست شپرزە ئەبم. ئەمەش زۆرینەی جار ئەو کاتانە ڕووئەدات کە چاوپێکەوتنەکە بە تورکییە نەک بە ئینگلیزی. تورکییەکی خراپ قسەئەکەم و شتی سەیروسەمەرە ئەڵێم. لە تورکیا ڕەخنەم لەسەر گفتوگۆکانم زیاتر لێگیراوە هێندەی ئەوەی لەسەر کتێبەکانم لێمبگیرێت. چونکە لە تورکیا گفتوگۆکەرانی سیاسی و ستون نووسەکان ڕۆمان ناخوێننەوە.

**بە شێوەیەکی گشتی لە ئەوروپا و ئەمەریکا پێشوازییەکی باش لە کتێبەکانت ئەکرێن. ئەی لە تورکیا ئەو جۆری پێشوازیکردنە چۆنە؟**



ئۆرهان پاموک

پاموک: ساڵە باشەکان تێپەڕین. کاتێک یەکەم کتێبەکانی خۆم نووسی بەبەردەم وەچەیەک لە نووسەرانی پێش خۆمدا تێپەڕی کە لەودیوو پەردەوە لە پەرێزدابوون بۆم، بۆیە وەک نووسەرێکی نوێ پیشوازیم لێکرا.

**مەبەستت لە وەچەی پێش خۆت لە نووسەران کێیە؟**

پاموک: مەبەستم لەو نووسەرانەیە کە بەوە ناسرابوون کە بەرپرسیاریەتییەکی کۆمەڵایەتیان لەسەرشانە واتا ئەوانەی بە دیدێکی ئەخلاقی و سیاسییەوە سەیری ئەدەبیان ئەکرد. ئەوانیش ئەو نووسەرە واقیعییە وشکوبرینگانەبوون و نووسەرانی ئەزمونگەرانەبوون. وەک نووسەرانی هەموو ئەو وڵاتە هەژارانە وابوون کە توانای خۆیان لەپێناو پارێزگاریکردن لە وڵاتەکانیان بەهەدەردابوو. من نامەوێت وەک ئەوان وابم، چونکە من هەر لە گەنجیمەوە سەرسامبووم بە فلۆبێر، فرجینیا وۆڵف و مارسیل برۆست؛ هەرگیزیش لایەنگیریم لە شتاینبێرگ و ئەو سۆسیالیستییەی مەکسیم گۆرگی نەگرتووە. ئەو ئەدەبەی لە شەستەکان و حەفتاکاندا نووسراوە بەرەو بەسەرچوون ئەڕوات، بۆیە وەک یەکێک لە نووسەرانی وەچەی نوێ پێشوازی لە من کرا.

کاتێک لە ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدەکاندا جارێکی تر کتێبەکانم بەچەندان چاپی یەک بەدوای یەک فرۆشران، هیچ کەس لە تورکیادا نەیئەوێرا خەونێکی




وای هەبێت، مانگی هەنگوینی من لەگەڵ بڵاوکراوە تورکییەکان و ڕۆشنبیراندا گوزەشت دوای ئەوەی ئەو پیشوازیکردنە بۆ ژمارەی چاپ و فرۆشی کتێبەکانم بوون نەک پێشوازییەک لە ناوەڕۆکی کتێبەکانم. بۆیە بەداخەوە لە ئێستادا سەرنجە سیاسییەکانی من نەناسراوە، ئەوەشی کە بە ناوی منەوە ئەوترێت زۆرینەیان لەو چاوپێکەوتنانەوە وەرئەگیرێن کە لە میدیای جیهانیدا لەگەڵم کراوە و لەلایەن ڕۆژنامەنووسە ناشیونالیستەکانەوە ئەشیوێنرێن بۆ ئەوەی زیاتر من وەک نووسەرێکی ڕادیکاڵ و سیاسییەکی گێل دەرکەوم وەک لە ڕۆشنبیرێک.

**کەوایە کاردانەوەیەکی دوژمنکارانە لەبەرامبەر ناو و ناوبانگی تۆدا هەیە؟**

پاموک: من قەناعەتم وایە ئەمە سزادانێکی منە لەبەرامبەر زۆری فرۆشی کتێبەکانم و سەرنجە سیاسییەکانم. بەڵام ناشمەوێت زۆر پێ لەسەر ئەمە داگرم، چونکە ئەمە بۆ من جۆرێکە لەبارگرانی. ڕەنگیشە بەهەڵە لە هەموو ئەم شتانە تێگەیشتبم.

**لە کوێ دائەنیشیت کاتێك ئەنووسیت؟**

پاموک: من هەمیشە قەناعەتم وایە ئەو شوێنەی تیایدا ئەخەویت و ئەو جێیەی لەگەڵ کەسانی تردا ژیانی تیادا ئەبەیتە سەر ئەبێت جیاوازبێت لەگەڵ ئەو جێیەی تیایدا ئەنووسیت. تەقسی ماڵ و وردەکارییەکانی بە شێوەیەک لە شێوەکان فەنتازیا ئەکوژن. ماڵ خەیاڵم ئەکوژێت. ژیانی ڕۆژانە و گیان داهێزرانی ماڵ ڕاکردن لێی و چوون بۆ ماڵێکی تر بۆ نووسین، وەک پێویستییەک وایە بۆ فەنتازیاکانم و ڕزگاربوونمە لە پەژموردەیی.

من بە درێژایی ئەو ساڵانە ئۆفیسێکی بچوک یان کونجێکم لە دەرەوەی ماڵەوە هەبووە بۆ کارکردن. من هەمیشە کۆمەڵێک ماڵی جیاوازم هەبووە.

بەڵام جارێکیان کاتێک ژنەکەم سەرقاڵی دکتۆراکەی بوو لە زانکۆی کۆلۆمبیا بۆ ماوەی چەند مانگێک خۆم لە ئەمەریکا خڵافاند. هەردووکمان لەیەکێک لەو شوقە تەنگانە ئەژیاین کە بۆ قوتابییە ژن و پیاو هاوردووەکان تەرخانکرابوون، بۆیە لە هەمان ژوردا هەم ئەخەوتم و هەم ئەشم نووسی. ئەو شوێنە تەواو منی خستبووە ناو کەشوهەوای خێزانییەوە ناڕەحەتی کردبووم. بەیانیان وەک ئەوەی بچم بۆ کار بەو چەشنە خوداحافیزیم لە خانمەکەم ئەکرد. ئەچومە دەرەوە و پیاسەم بەناو چەند گەڕەکێکدا ئەکرد و دوای کەمێک ئەگەڕامەوە وەک ئەوەی بچم بۆ ئۆفیسەکەم.

پێش دە ساڵێک لەوەوبەر شوقەیەکم دۆزییەوە کە

ڕووە بوسفۆڕ و شاری کۆن ئەیروانی. بیست و پێنج دەقەیەک بە پێ دوور بوو لە ماڵەکەمەوە. پڕبوو لە کتێب و لەسەر مێزی نووسینەکەمەوە دەرەوەم ئەبینی. بە شێوەیەکی گشتی من ڕۆژی دە سەعاتێک لەو ژوورەدا کارم ئەکرد.

**هەموو ڕۆژێك دە سەعات؟**

پاموک: بەڵێ، من کار زۆر ئەکەم. حەزم لێیەتی. خەڵک پێم ئەڵێن کە کەسێکی جدیم، ڕەنگە وابێت بەڵام من حەزم لەو کارەیە کە ئەیکەم. حەزئەکەم وەک منداڵێک کە یـاری ئەکات لەبەردەم مێزی نووسینەکەمدا دابنیشم. ئەمە بۆ خۆی کارێکە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا کارێکی خۆشی بەخشە.

**ناوەکەت ئورهان، هەر وەك ئەوەی لە ڕۆمانی بەفردا باستکردووە، وەك فەرمانبەرێك هەموو ڕۆژێك لە هەمان کاتدا چوویتەتە سەر کارەکەت. ئایە بەڕاستی هەمان ئەو دیسیپلینی کارکردنەت لەسەر خۆت هەیە؟**

پاموک: من ئەمەوێت سوربم لەسەر ئەوەی کە بڵێم کەسایەتی ڕۆماننووس وەک کەسایەتی فەرمانبەر وەهایە و تەواو جیاوازە لە شاعیر، لەکاتێکدا لە تورکیادا زۆر ڕێز لە کاری شاعیر ئەگیرێت. کە شاعیربیت واتای ئەوەیە بەناوبانگیت و جێی ڕێزیت. زۆرینەی سوڵتانە عوسمانییەکان و پیاوانی دەوڵەت شیعریان نووسیوە، بەڵام لە دیدی ئەم سەروەختەی خۆمانەوە ئەوانە شاعیرنین. چونکە لە سەد ساڵی ڕابردوودا بۆ ئەوەی پیشانت بدایە ڕۆشنبیریت ئەبوو شاعیربوویتایە. هەموو ئەو شاعیرانەش شیعرەکانی خۆیان لە کتێبێکدا کۆکردۆتەوە و ناویان ناوە دیـوان. نیوەی پیاوانی دەوڵەتی عوسمانی ئەم جۆرە دیوانانەیان هەبووە. ئەمەش گەشەی پێدراوە و وێنەیەکی دروستکردووە لەسەر نووسین، لەگەڵ چەندان یاسا و کەشی تایبەتی بە خـۆی. ئەم نووسینانەش زۆر ئاسایی و یەک شێوە بوون. کاتێک بیرۆکەکانی ئەوروپا هاتنە ناو تورکیاوە ئەم سەروەتە کلتورییە لەگەڵ بیرۆکەی ڕۆمانسیەت و مۆدێرندا یەکیان گرت و وێنەیەکیان لەسەر شاعیر دروستکرد کە هەڵگری حەقیقەتە. ئەمەش ڕۆڵێکی زیاتری دا بە شاعیر. ڕۆماننوس لەلاکەی ترەوەیە، کەسێکی بەسەبرە



بەڵام وەک مێرووڵەش گورجوگۆڵە و کارئەکات. ڕۆماننوس پرسیارەکانی ئێمە لە ڕێی ئیلهامە ڕۆمانسییەکانییەوە ناوروژێنێت بەڵکە لەڕێی لە ڕێی سەبری خۆیەوە ئایانوروژێنێت.

**ئایە قەت شیعرت نەنووسیوە؟**

پـامـوک: زۆرجـار ئـەم پـرسـیـارەم لـێ ئەکرێت. هەندێک شیعرم لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا نووسیوە و هەندێکیشیانم لە تورکیا بڵاوکردونەتەوە، بەڵام دواتر وازم لێ هێنا. ڕوونکردنەوەی من بۆ ئەمەش ئەوەیە کە شاعیر کەسێکە لە ڕێگەی خودایەکەوە قسە ئەکات و پێویستە لەناو شیعردا بژی. من هەوڵمدا شیعر بنووسم بەڵام بینیم خودایەک لە مندا قسەناکات. ئەمەش ناڕەحەتی کردم و هەوڵمدا




بزانم خودا ئەیەوێت چی بڵێت گەر بیەوێت لە مندا قسەبکات. بۆیە لە کاتێکدا بیرم لەمە ئەکردەوە بە شێوەیەکی میتۆدیانە و هێمنی دەستمکرد بە نووسین. نووسینی ئەدەب و پەخشانیش ئەمەی ئەویست. بۆیە وەک کارمەندێک دەستم کرد بە کار. زۆرینەی نووسەران ئەم جۆرە ناونانەی من بۆ نووسەربوون بە گاڵتەئەگرن، بەڵام من ئەمەم قبوڵە؛ من وەک کارمەندێک کارئەکەم.

**تۆ پێتوایە لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا ئەتوانیت ئاسانتر بنووسیت؟**

پاموک: نەخێر بەداخەوە. هەندێک جار ئەمەوێت کەسایەتی ڕۆمانەکانم بهێنمە ناو ژورێکەوە بەڵام نازانم کە چۆن دەرئەچێت. من ئێستا باشتر باوەڕم بە خۆمە، بەڵام هەندێک جاریش پیویستم بە یارمەتییە بۆ ئـەوەی هەمیشە دەوروخولی شتەکان نەدەم. یاخود جاری واش هەیە خۆت هەڵئەدەیتە ناوی. من وا بۆ سی ساڵ ئەبێت پەخشان ئەنووسم، بۆیە باوەڕم وایە کە کەمێک باشتربووم، بەڵام تائێستاش هەندێک جار ئەکەومە ناو پێچ و پەنای واوە کە کەس بـاوەڕ ناکات کەسی تیادابێت. کەسایەتی ڕۆمان خۆی نایەتە ژوورەوە بۆ لات، بەڵام ناشزانم چی بکەم و ڕوو لە کوێ بکەم. لەگەڵ ئەوەی سی ساڵیشە ئەنووسم هێشتا ئەم حاڵەتانەم بەسەردێت. دابەشکردنی کتێبێک بـەسـەر چەند بەشێکدا بڕیارئەدات کە من بە چ شێوازێک بیربکەمەوە. ئەگەر پێش وەخت من هەیکەلی ڕۆمانەکەم دارشتبێت کە چۆن ئەبێت ـ دیارە زۆرینەی جاریش وائەکەم ـ بەش بەشی ئەکەم و بیر ئەکەمەوە کە ئەبێت چی ڕووبدات لە هەریەکێک لەو بەشانەدا. بۆیە گرنگ نییە من لە بەشی یەکەمەوە دەست پێبکەم بۆ ئەوەی دواتر

بەشەکانی تر یەک بەدوای یەک بنووسم. کاتێک دەست پێ ئەکەم، دنیا وێران نابێت گەر دەست بە نووسینی هەر بەشێک بکەم کە ئەچمە ناوی. ئەتوانم پێنج بەشی سەرەتا بنووسم، گەر تاقەتیشم نەبوو بەردەوام بم ئەوا بازئەدەمە سەر بەشی پانزە و لەوێوە ئەنووسم.

**مەبەستت ئەوەیە کە بڵێیت هێڵەکانی هەموو کتێبەکەت پێشوەخت ئەکێشیت؟**

پاموک: بەڵێ، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی. بۆ نموونە ڕۆمانی ناوم سووره خستنەڕووی کۆمەڵێ کەسایەتی بوو، بۆیە منیش بۆ هەر کەسایەتییەک بڕیارمدا چەند بەشێکی بۆ تەرخان بکەم. کاتێکیش کە دەستم پێکرد هەندێک جار حەزم ئەکرد خۆم یەکێک بم لەو کەسایەتیانە. بۆیە کاتێک بەشێکم لەسەر شەکورە تەواو ئەکرد، بۆ نموونە ئەگەر ئەو بەشە بەشی حەوتەم بوایە، ئەوا بازم ئەدا بۆ بەشی پانزە چونکە ئەو بەشە بەشێکی تری ئەو بوو. حەزم ئەکرد خۆم شەکورە بم. بەبەردەوامی بازدان لە کەسایەتییەکەوە بۆ کەسایەتییەکی تر هەندێک جار توشی ڕەشبینی ئەکردم. بەڵام ئەو بەشەشی کە ئەبێتە دواهەمین بەش لە کۆتایدا ئەینووسم. دیارە بێ گومان حەزم بە گاڵتەکردن هەیە لەگەڵ خۆم و ئەپرسم ئەبێ کۆتاییەکەی چۆن بێت. من کۆتایی ڕۆمـان بە جۆرێک کۆتایی پێدێنم. پێش ئەوەی دواهەمین لاپەڕەکانی بنووسم ئەوەستم و دیسانەوە سەرلەنوێ بەشەکانی تر کە پێشتر نووسیومن ئەیان نووسمەوە.

**ئایە کەسێك هەیە لە کاتی نووسیندا نووسینەکانت بخوێنێتەوە؟**

پاموک: هەمیشە ئەوەی کە نوسیومە بۆ ئەو کەسەی












ئەخوێنمەوە کە ژیانی لەگەڵ بەش ئەکەم. زۆر سوپاسگوزاری ئەو کەسەش ئەبم زیاتر بەرهەمەکەم بخوێنێتەوە یاخود پرسیارم لێ بکات ئەمڕۆ گەیشتومەتە کوێ. ئەمە جۆرێک لە تامەزرۆیی و شەوقم لەلا دروست ئەکات، تەواو وەک ئەوە وایە دایکت یان باوکت بکێشێت بە شانتا و پێت بڵێن ئافەرم کوڕم. هەندێک جار گوێم لەهەندێک سەرنج ئەبێت کە ئەو کەسە شتێک هەیە بەدڵی نییە. ئەمەش باشە، من حەزم لەم کەشوهەوایە هەیە.
من هەمیشە بیر لە تۆماس مان ئەکەمەوە کە ئەو یەکێکە لە نموونە باڵاکان لەلای من. ئەو هەموو خێزانەکەی خۆی کۆ ئەکردەوە، شەش منداڵ و ژنێک، بە دەنگی بەرز بۆی ئەخوێندنەوە. من حەزم لە باوکێکە کە چیرۆک بۆ خێزانەکەی بخوێنێتەوە.




- ئەم چاوپێکەوتنە بەشێکە لە چاوپێکەوتنێکی دوور ودرێژ.

**سەرچاوە:**
Andra Färger
Orhan Pamuk
Ö-Mats Mullern

# گفتوگۆ لەگەڵ فرانسیس فۆکۆیاما

لە عەرەبییەوە: سەردەم

سازدانی: ممدوح المهینی

**فرانسیس فۆکۆیاما لە چەند دێڕێکدا**

فراسیس فۆکۆیاما خاوەنی کتێبی (کۆتایی مێژوو و دواهەمین مرۆڤ)ە، کە لە ساڵی ١٩٩٢ و لە کۆتایی ساڵانی جەنگی ساردا بڵاویکردەوە، توێژەر و بیرمەندێکی ئەمریکی بە ئەسڵ یابانییە. ئەو ڕۆژگارە، هاوکات لەگەڵ چاپکردنی ئەم کتێبەدا، ڕۆژگارێک بوو نەک تەنها کۆتایی تەحەداکردنی سۆڤیەت بوو بۆ خۆرئاوا، بەڵکوو چەندین کتێبی دیکە بە هەمان ئاراستەی ئەو کتێبەی فۆکۆیاما بڵاوکرانەوە. لەوانە کتێبەکەی ساموێل هینتینتۆنگ (پێکدادانی شارستانییەتەکان)، بەشی هەرە زۆری ئەو کتێبانە شانازییان بە سەرکەوتنی سەرمایەداری بەسەر سۆشیالیزمدا دەکرد و نوقڵانەی هاتنی سەردەمێکیان لێدەدا تێیدا دیموکراسی جێگیردەبێت و نمونە و بەهاکانی بەتەواوی جیهاندا بڵاودەبێتەوە.

بەڵام فۆکۆیاما لە کتێبێکدا کە ساڵی ١٩٩٥ لەژێر ناونیشانی (الثقه: الفصائل الاجتماعیه وبناء البحبوحه) بڵاویکردەوە، بەوپەڕی ئازایەتی و



فرانسیس فۆکۆیاما

بوێرییەوە بەخۆیداچووەوە و دەستکاری تێزە ڕادیکاڵەکەی سەبارەت بە کۆتایی مێژوو کرد و دانی بەوەدانا مەحاڵە شارستانیەت و کەلتور لە ئابوری جیابکرێنەوە.

یوشیهیرۆ فرانسیس فۆکۆیاما لە ٢٧ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٢ لە شاری شیکاغۆی ئەمریکا لەدایکبووە. باپیری لە باوکییەوە، ساڵی ١٩٠٥ لەدەست جەنگی نێوان روسیا و یابان، ڕایکردووە بۆ ئەمریکا و خەریکی کاری بازرگانی بووە. ئیدی یوشیۆ فۆکۆیامای باوک وەک هاوڵاتییەکی ئەمریکی دەژی و دەچێتە سلکی کەهنوتی مەسیحییەوە و دەبێت بە قەشە و لە زانکۆی شیکاغۆ و لە زانستی کۆمەڵناسیدا بڕوانامەی دکتۆرا بەدەستدێنێت. هەرچی هاوسەرەکەیەتی (واتە دایکی فرانسیس) سەر بە خانەوادەیەکی ئەکادیمی ناسراوی یابانە.

فرانسیس کە تاقانەی دایک و باوکی بوو، لەشاری نیۆیۆرک گەورەدەبێت و لە زانکۆی کۆرنێل-ی سەر بە ویلایەتی نیۆیۆرک، فەلسەفەی سیاسی تەواودەکات و لەوێدا بۆل وۆڵفویتز-ی سیاسی و ئەکادیمی ناسراوی کۆنزەرڤاتیڤ دەناسێت. فرانسیس دواتر درێژە بە خوێندنی باڵا دەدات، سەرەتا لە زانکۆی ییل، ئەدەبی بەراوردکاری دەخوێنێت. وەلێ زۆر بەخێرایی لە خوێندنی ئەدەب بێزاردەبێت و سەرلەنوێ ڕوودەکاتەوە لێکۆڵینەوە سیاسییەکان و دەڕوات بۆ زانکۆی هارفارد. لەو زانکۆیەدا بڕوانامەی دکتۆرا بەدەستدێنێت و تێزی بڕوانامەکەی لەسەر هەرەشەی یەکێتی سۆڤیەت بۆسەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە.

ساڵی ١٩٧٩ وەک توێژەرێک و چاودێرێک پەیوەندی بە دەزگای ڕاند-ەوە دەکات. لەنێوان ساڵانی ١٩٩٦ بۆ ٢٠٠٠ لە زانکۆی جۆرج مایسۆن لە واشنتۆنی پایتەختی ئەمریکا، وەک مامۆستای سیاسەت، کورسییەک وەردەگرێت. پاشان لە واشنتۆن و لە پەیمانگای نیتزە بۆ توێژینەوەی نێودەوڵەتی کە سەر بە زانکۆی جۆنز هۆبکنزە، تاکو ساڵی ٢٠١٠ دەبێتە مامۆستای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. ئەو ئێستا لە پەیمانگای دیموکراتی و گەشەپێدان و حوکمی یاسای سەر بە پەیمانگای فریمان سبۆگلی بۆ توێژینەوەی نێودەوڵەتی لە زانکۆی ستانفۆرد، کاردەکات.

***تۆ بە پێچەوانەی زۆربەی زۆری نووسەران و توێژەرانی ئەمریکا، گەشبین نەبویت بەوەی پێی دەوترێت (بەهاری عەرەبی). هەر وەك ئەوەی لە وتارێکی درێژدا**

**کە لە گۆڤاری (بەرژەوەندییەکان ئەمریکا) بڵاوتکردەوە، ئاماژەت بەوەدابوو.**

– ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەگەر تەماشای ئەورووپا بکەین، دەزانین دیموکراتی کاتێکی زۆری خایاند تاکو جێگیرببێت. سەد ساڵ یان بەشی زۆری سەدەی نۆزەهەم تێپەڕی، تاکو پرۆسەی هەڵبژاردن جێگیربوونی بەخۆیەوەبینی و بووە شتێکی سروشتی و خەڵک تێیدا بە ئازادی دەنگی خۆیان دەدەن. پێویستە هیچ کەسێک نەکەوێتە ژێر باری ئەو وەهمەی کە دەڵێ دەکرێ بەئاسانی و لە شەو و ڕۆژێکدا سیستمێکی دیموکراتی چالاک دابمەزرێت. بەتایبەتی ئەو ناوچەیە لە مێژوی خۆیدا سیستمی دیموکراتی بەخۆیەوە نەبینیوە تا یارمەتی ئەم وەرچەرخانەی بدات. ئەو ناوچەیە پێویستی بە حیزبی سیاسی و دادگای سەربەخۆ و حوکمی یاسا هەیە، هەموو ئەو شتانەش تاڕادەیەکی زۆر بوونیان نییە. بۆیە ئەو ناوچانە پێویستیان بە کاتێکی زۆرتر هەیە تاکو گەشەبکەن و پێشبکەون.

***هەروەها باست لە گرنگی ئەوە کردووە پێویستە لیبرالیەت، پێش دیموکراتی وەك سیستمێکی سیاسی، بکەوێت. لەم بارەیەوە دەڵێی چین لە دەیەی داهاتودا پێویستی بەوەیە. ئەی وڵاتانی عەرەبی پێویستیان بە چییە؟**

– لە ڕاستیدا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەورووپا، دەبینین بەخێرایی سیستمی دیموکراتی وەرنەگرت، بەڵکوو لەسەرخۆ و بەشێوەیەکی شێنەیی وەریگرت. لە ئەورووپا ململانێی ئاینی هەبوو، ئەم ململانێیانە رانەوەستان تا ئەو کاتەی جەنگاوەرە ئاینییەکان هەستیانکرد زۆر زەحمەتە تا ئەبەد لە جەنگ و کوشتنی یەکتری بەردەوامبن. بە تێڕوانینی من گرنگە بۆ چین یان بۆ وڵاتانی عەرەبی، بەم قۆناغەدا تێپەڕن، ئایا دەبێت هەردوکیان بەو قۆناغەدا تێپەڕن؟ لە ڕاستیدا نازانم.

***گومانێکی زۆر لەسەر ئیخوان موسلمین هەیە کە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بڕوایان بە پرنسیپەکانی دیموکراتی نییە. خەڵکانێك هەیە ڕەخنەی ئەوە لە ئیخوانەکان دەگرن کە دیموکراتییەت تەنها وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە دەسەڵات بەکاردەهێنن. بۆ نموونە لە میسر ترسێکی گەورە هەیە لەو هەوڵانەی ئیخوانەکان کە میسر بکاتە کۆمارێکی ئیسلامی، وەك ئەوەی لە ئێران ڕویدا؟**

– لە ڕاستیدا ئەو ئاماژانەی لە ئیخوان موسلمینی میسرەوە دێن، دڵخۆشکەرنین. پێناچێت ئەوان حەزبکەن خەڵکانی دیکە بەشداری پێبکەن، بەڵکوو دەیانەوێت هەر خۆیان قۆرخی دەسەڵات بکەن. بۆ نموونە کاتێ قسە لەسەر دەستور دەکەین، گرنگە ئەوە بزانین دەستور بایەخێکی زۆر گەورەی هەیە و جیاوازە لە پرۆسەی هەڵبژاردن، لە پرۆسەی هەڵبژاردندا هێندە بەسە کە ڕێژەی ٥١٪ دەنگەکان بەدەستبێنیت، ئیدی دەتوانی کۆمەڵێ بڕیاری دیاریکراو دەربکەیت. بەڵام دەستور وانییە و جیاوازە، چونکە دەستور ڕەنگدانەوەی تەواوی کۆمەڵگایە. لەبەر ئەم هۆکارە، پێویستە بیروڕا و بۆچونی کەمینەکانیش لەبەرچاو بگیرێت و دەرگای گفتوگۆ و ڕاوێژکردن و پرسوڕاگۆڕینەوە و هاوکاریکردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکرێتەوە. وەلێ پێدەچێت لەناو ئیخوان موسلمیندا، خەڵکانێک هەبن ئامادەی هەموو ئەوانە نەبن. بەڵکو دەیانەوێ سەبارەت بە مەسەلە بنچینەییەکانی دەستور، شێوازی بیروبۆچونی خۆیان بسەپێنن.

***مەسەلەکانی وەك ئازادی تاکەکەسی و ئازادی بیروڕا دەربڕین یان ئازادی پەرستن، لەسەر بنەمای بیرکردنەوەیەکی مەدەنی دادەڕێژرێن، دوور لە داخرانی ئاینی یان تایفی. ئایا تۆ لەو بڕوایەدا نیت گرنگە چاکسازی یان ڕیفۆرمێکی ئاینی هەبێت کە ڕێگاخۆش بکات بۆ وەرچەرخانی شێوە ژیانێکی دیموکراتیانەی**

**تەندروست. من لێرەدا باس لە بابەتێکی سەرەکی دەکەم کە ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندانی عەرەب و موسڵمانەکان، زیاد لە سەد ساڵ لەمەوبەر یان زیاتر خستویانەتەڕوو؟**

– باشە، دەکرێ ئاین بە چەندین شێواز و ڕێگای جۆراوجۆر لێکدانەوەی بۆ بکرێت. لێکدانەوەیەکی زۆر توند و دەمارگیرانە بۆ ئیسلام هەیە، بەڵام بێگومان ئەوە تەنها لێکدانەوە نییە. ئەگەر بێت و سەردانی مالیزیا یان ئەندەنوسیا بکەیت، دەبینیت تێگەشتنێکی جیاواز بۆ ئاینی ئیسلام هەیە. تەنانەت لەنێو جیهانی عەرەبیدا، خوێندنەوەی جیاواز جیاواز هەیە. ئەوەی بەلای منەوە گرنگە، ئەوەیە بە ڕێگایەکی عەمەلی بیر لەم مەسەلەیە بکرێتەوە. مرۆڤ هەر جۆرە ئیمانێکی هەبێت، ئەوا لە ئێستادا لە جیهانێکی فرە ڕەنگدا دەژی و خەڵکانێکی دیکە هەیە تێڕوانین و ئیمانیان بۆ ئاین جیاوازە. لەبەر ئەوە ئەوەی پێویستە ئەنجامبدرێت، ئەوەیە کۆمەڵگایە دروستبکرێت ڕازیبێت بە پێکەوەژیانی هەموان، بەبێ شەڕ و پێکدادان.

وەک پێشتر ئاماژەم پێدا، لە ئەورووپا دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی لیبرالیزم، دوای ململانێ ئاینییە خوێناوی و تاڵەکان هاتەئاراوە، دوای ئەوەی رابەرە ئاینییەکان و سەرکردەی جەنگاوەرەکان، تەواو دڵنیابوون لەوەی جەنگ و شەڕ و پێکدادانەکان پرۆسەیەکی بێهودەیە و جگە لە کوشتن هیچی دیکەی لێ سەوزنابێت. لەبەر ئەوە پێویست بوو کۆمەڵگایەکی لێبوردە بێتەئارەوە و هەموان لە ئامێز بگرێت. من لەوبڕوایەدام مەترسییەکان لە جیهانی



ئیسلامیدا، لە ململانێی تائیفی نێوان سونە و شیعەدایە. ئەوە سیستمی لیبرالییە دەتوانێت ئەم فرە ئاینییە لەخۆبگرێت و تێیدا هەر تاکێک لێکدانەوەی تایبەتی خۆی بۆ ئاین پیادەبکات، بەڵام دەبێ لێگەڕێت ئەوانی دیکە بە ئاشتی بژین.

***ئەی سەبارەت بە سوریا دەڵێی چی؟ سوریا گەورەترین کێشەیە لە جیهانی عەرەبیدا و ئیدارەی ئۆباما هیچ رۆڵێکی راستەقینەی بۆ ڕاگرتنی نەبینیوە. لە بەرامبەر ئەم کێشەیەدا، رەخنەیەکی زۆر لە هەڵوێستی ئەمریکا دەگیرێت؟**

– ئەوەی لە سوریادا روودەدات تراژیدیایەکی راستەقینەیە. لەو بڕوایەدام ئیدارەی ئۆباما سەبارەت بە دەستوەردان لە سوریا، زیاد لە پێویست خۆی دوورخستووەتەوە و تەرێزی کردووە. لەسەر ئۆباما پێویست بوو کۆمەک و پشتگیری وڵاتانی کەنداو بکات لە هەوڵەکانیان بۆ لابردن و دوورخستنەوەی ئەسەد. جێگای داخە تا ناکۆکی و ململانێکان بەردەوامبێت، بارودۆخەکە خراپتردەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی قووڵبوونەوەی زیاتری ناکۆکی و ململانێ ناوخۆییەکان، تەنانەت دوای ڕۆشتنی «ئەسەد»یش. لە راستیدا سوریا لەم بارودۆخەی ئێستایدا، دەبێتە دەوڵەتێکی تێکشکاوی شکستخواردوو، ئەمەش بۆ ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست مەسەلەیەکی مەترسیدارە.

***نهێنی دوودڵی ئۆباما لە چیدایە؟ ئەم مەسەلەیە لەماوەی دوو ساڵی رابردوودا، زۆر لە توێژەرە سیاسییەکانی دووچاری سەرسوڕمان کردووە. ئاشکرایە کەس داوای دەستتێوەردانی ئەمریکا ناکات، بەڵکو داوادەکرێت ناوچەیەکی دژە فڕین دابنرێت و چەك بە سوپای ئازاد بدرێت؟**

– لەوبڕوایەدام هۆکارەکەی تەنها بۆ ئەو ترسە زیاد لە پێویستەی ئیدارەی ئۆباما دەگەڕێتەوە، ئەویش بەهۆی داگیرکردنی عێراق و جەنگی ئەفغانستانەوە. ئۆباما









لەوبڕوایەدایە ئەمریکا دەبێت خۆی لە دەستتێوەردانی سەربازی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەدووربگرێت. بەڵام من لەوبڕوایەدام ئەمە هەڵەیە، چونکە لەمەدای دووردا، کاریگەری قووڵی دەبێت لەسەر ئیستیقراری ناوچەکە، ئەمەش زیان بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەگەیەنێت. لەسەر ئەمریکا پێویستە تاڕادەیەک ڕۆڵی سەرکردایەتی خۆی بۆ جیهان ببینێت و ئەو چاوەڕوانیە ئەخلاقییەی لێیدەکرێت جێبەجێی بکات. بەڵام بەداخەوە وەک دەبینین تا ئێستا ئەمە لە سوریادا روونادات.

***سەبارەت بەم قەیرانە، هەڵوێستی روسیا و چین چۆن دەبینیت؟**

– روسەکان تەنها نایانەوێت وەبەرهێنانە کۆنەکانیان لەگەڵ ڕژێمی ئەسەدا لەدەستبدەن، ئەمە سەرەڕای هەڵوێستی دوژمنکارانەیان بەرامبەر بە ئەمریکا. گەر لە بیرتبێت، ڤلادیمێر پۆتین، زۆر لە «میدڤیدیڤ» سەرۆکی روسیا تورەبوو، کاتێ ڕازیبوو هێزەکانی ناتۆ دەستوەردەنە ناو لیبیاوە و ڕژێمی قەزافی بروخێنن. ئەوە یەکێک بوو لەو هۆیانەی وایکرد پۆتین حەز بکات ببێتەوە بە سەرۆکی روسیا و «میدڤیدیڤ» لابەرێت. پۆتین نایەوێت جارێکی دیکە لەگەڵ بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاوڕابێت کە ئەوروپا و ئەمریکا لە پشت ئەو بڕیارانەوەبن. لەبەر ئەوە لە سوریادا ڕۆڵی ڕێگرێک دەبینێت. ئەمە سەرەڕای ئامادەبوونی روسیا لە سوریا، تەنانەت لەسەر ئاستی پەیوەندی شەخسیش.

***بارودۆخی سوریا، ئەو نیگەرانییە ئاشکرا دەکات کە سەبارەت بە چارەنوسی سیستمی نێودەوڵەتی هەیە. سیستمێك ئەمریكا دوای جەنگی دووەمی جیهان، بەشداربوو لە دامەزراندنی و پارێزگاریکردن لێی. پێدەچێت ئیدارەی ئۆباما زۆر بایەخ بەم کێشە گرنگە نەدات. ئایا لە جیهانێکدا دەژین دەکرێ پێی بڵێین جیهانی دوای ئەمریکا؟**

– پێموایە بەشێک لە وەڵامەکە لەناو پرسیارەکەدایە. کێشەیەکی زۆر هەیە پێویستی بە ڕابەرایەتی ئەمریکایە تا چارەسەریان بکات، چونکە کەسی دیکە جگە لەو ناتوانێت چارەسەریان بکات. بەڵام بەبێ ئەم ڕابەرایەتییە پێویستە، ئەوا جیهانێک دەبینین پڕ لە فەوزا. کێشەی ئەمریکا لەم ساڵانەی دوایدا، بریتییە لەو دەستتێوەردانە زیاد لە پێویستەی کە لەسەردەمی سەرۆکی پێشو «جۆرج دەبلیو بۆش»دا ڕوویدا. ئێمە ئێستا بە ئاراستەیەکی دیکەدا دەڕۆین، لە ئێستادا ئەمریکا زیاد لە پێویست خۆی لە دەستتێوەردان و چارەسەرکردنی پەشێوییەکان دەپارێزێت.

***فەرید زەکەریا لە نووسینێکیدا دەڵێ: (جیهان لە دوای ئەمریکا)، واتە جیهانێك لەژێر سایەی هێزەکانی دیکەی وەك چین و روسیا و هند. چیتر تێیدا ئەمریکا ڕابەرایەتی ناکات. لە بەرامبەردا «ڕۆبرت کاخان»ی مێژوونووس لە نووسینێکدا دەڵێ: (ئەو جیهانەی ئەمریکا دروستی کرد) و پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە دەبێت ئەمریکا ڕۆڵی خۆی لە ڕابەرایەتی کردنی جیهان ببینێت، وەك ئەوەی لەم چەند دەساڵەی دوایدا بینیویەتی. تۆ لەگەڵ کام ئاراستەیاندایت؟**

– لەو بڕوایەدام واقیع لەنێوان ئەم دوو تێڕوانینەدایە، ئەمریکا وەک یەکێک لەو هێزانەی جیهان دروست دەکات، پاشەکشە ناکات. لە ڕاستیدا ئەمە پشت بەو شێوازە دەبەستێت کە ئەمریکا بۆ بەکارهێنانی هێزی خۆی دەیگرێتەبەر. وەلێ هەنووکە چاودێری چین دەکەین کە هیچ کەسێک ناتوانێت گەشەکردنە خێراکەی ڕاوەستێنیت، بۆیە ناکرێ هێزی ئەم وڵاتە لەبەرچاو نەگیرێت و پشتگوێبخرێت. بە دڵنیاییەوە لەبارودۆخێکی لەم شێوەیەدا، هێزی ئەمریکا بەشێوەیەکی کەم لاواز دەبێت.

***جارێکیان بەراوردی نێوان میسرو لیبیا-ت کرد و جەختت لەوە کردەوە دەرفەتی سەرکەوتنی میسر لە وەرچەرخان بەرەو دیموکراسی، لە دەرفەتی لیبیا**

**گـەورەتـرە. هۆکاری ئەوەشت بۆ بوونی شوناسی سیاسی گـەڕانـدەوە، هەروەها بۆ کۆنی دەوڵەتی میسری گەڕاندەوە. بەڵام ئەوەی چاودێری هەواڵەکان بکات، دەبینێت رووداوەکـان بە ئاقارێکی جیاوازتردا تێدەپەڕن و تاڕادەیەك رەشبینییان پێوەدیارە. بە بڕوای تۆ هۆکاری ئەمە بۆچی دەگەڕێنیتەوە؟**

– ئـەوە راستە و پێدەچێت بەرەوپێشەوە چوونەکان باشنەبن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لە میسر دەوڵەتێک هەیە بەپێچەوانەی ئەوەی قەزافی لە لیبیا و لە میانەی چوار دەیەی حوکمڕانیدا ئەنجامیدابوو کە هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەتی وێرانکردبوو. وەلێ ئەوەی لە میسر جێگای تێڕامانە و یەکێکە لە کێشە رێگرەکان، ئەوەیە رێکەوتنێک لەسەر شوناسی سیاسی نییە. ئیخوان موسلمینەکان نوسخەیەکی جیاوازیان بۆ ئەو شوناسە سیاسییە هەیە کە جیاوازە لەوەی لای ئاقارە لیبرالییەکان هەیە.

***ئیدارەی ئۆباما گرەو لەسەر ئەوە دەکات ئیخوان موسلمین، لەحاڵەتی بەشداری پێکردنیان لە پرۆسە سیاسییەکەدا، ملکەچی واقیع دەبن و دەستبەرداری سەپاندنی ئایدۆلۆژییە ئوسوڵییە سەرتاپاگیرەکەیان دەبن. بەڵام تا ئێستا ئەو گرەوە لە راستییەوە نزیك نییە. لە واقیعدا لە میسر لێکنزیکبونەوەیەکی گەورە هەیە لەنێوان ڕەوتی سەلەفی و ئیخوان موسلمینەکاندا.**

– رەوتە ئاینییەکان هەروا لەخۆیانەوە و خۆبەخۆ لەناوناچن یان دوورناکەونەوە، ئەمریکاش ناتوانێت هیچیان لەگەڵدا بکات، تەنها ئەوە نەبێت هانیانبدات زیاتر بکرێنەوە و لیبرالیترین.

***بەشێوەیەکی بـەردەوام ئەو رەخنەیە لە ئەمریکا دەگیرێت بەخێرایی لەو وڵاتانەدا دەکشێتەوە کە دەچێتە ناوی، بێ ئەوەی بەشداربێت لە گەڕانەوەی هێمنی و ئەمن و ئاسایشیدا، یان لە بنیادنانی دەزگاکانی دەوڵەتدا، بەشێوەیەکی تەندروست و جێگیر یارمەتیان بدات. من ئەمە دەڵێم و بیر لە عێراق دەکەمەوە؟**

– ئەمریکا سەرەتا دەبێت وریابێت لە دەستتێوەردان، بەڵام ئەگەر ئەوەی کرد، پێویستە ماوەیەکی درێژتر بمێنێتەوە، تاکو یارمەتی بونیاتنان و گەڕانەوەی هێمنی و ئەمن و ئاسایش بدات. بەڵام ئەوەی تایبەتە بە عێراق، ئەوا بەپێی ئەو دانوستانەی لەنێوان هەردوو حکومەتەکەدا هەبوو، دەرفەتی مانەوەی ئەمریکا نەمابوو. هیچ دەرفەتێک لەبەردەم ئەمریکادا نەمابوو، تەنها ئەوەنەبێت بە خێرایی بکشێتەوە بکات.

***ئەی سەبارەت بە ئەفغانستان؟**

– ئەفغانستان کێشەیەکی جیاوازترە، لەوێ ئەو وڵاتە پێویستی بە مانەوەی ئەمریکایە. لە واقیعدا هەنووکە مشتومڕێکی گەرم هەیە سەبارەت بەوەی ئایا ئەمریکا لە ئەفغانستان بەشێوەیەکی تـەواو پاشەکشە بکات یان بوونێکی سەربازی گەورەی لەوێ هەبێت. هیوادارم هێزەکانی ئەمریکا لەو وڵاتـە بمێننەوە، تا هێمنی و ئاسایشی ئەو وڵاتە بپارێزن.

***دوای رووداوی ١١ سێپتێمبەر، لە توێژینەوەکانتدا جەختت لەسەر بابەتی (بونیادنانی نەتەوە-بناء الامم) کردووە، بۆچی؟**

– لە راستیدا ئەوە ئیختیارێک نەبوو. دوای رۆشتنی ئەمریکا بۆ عێراق و ئەفغانستان، کێشەی دەوڵەتی شکستخواردوو و بونیادنانی نەتەوە، سەرقاڵیکردم. دەبوایە بیر لەم کێشەیە بکرێتەوە لەگەڵ ئەو هەوڵە دووبارەبووانەی بۆ سەرکەوتنی ئەو دەوڵەتانە دەدرا. بەڵام ئەو هەوڵانە سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا. بۆیە بۆ من پێویست بوو بیر لە هۆکارە قووڵەکانی ئەو سەرنەکەوتنە بکەمەوە.

***تۆ گەرچی کۆمارییت، کەچی لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٨ دەنگت بە ئۆباما دا، بیرمە ئەو کاتە وتت: (نامەوێ پاداشتی کۆمارییەکان بکەم لەسەر ئەو سەرلێشێواندنەی لە عێراقدا دووچاری بوون)، لەم هەڵبژاردنەی دوایدا دەنگت بە کێ دا؟**

– دیسانەوە دەنگم بە ئۆباما دایەوە.

***بۆچی؟**

– لەو بڕوایەدام پارتی کۆماری تابێت بەلای (ڕاست – الیمین)دا دەیشکێنێتەوە و کۆمەڵێ هەڵوێستی زۆری هەیە من تەبانیم لەگەڵیدا، ئیدی بۆچی دەنگیان پێبدەم؟!

***کتێبەکەت (کۆتایی مێژوو و دواهەمین مرۆڤ) لای خوێنەری عەرەبی ناوبانگێکی باشی هەیە و لەوێدا وتوتە مێژوو لەلای لیبرالیزمی سەرمایەداری کۆتایی پێهاتووە. کەچی لە دواهەمین کتێبتدا (ڕیشەی سیستمی سیاسی)، وێنەکە زۆر ئاڵۆزە و دەڵێی هێزی دەوڵـەت و حوکمی بەهێزی یاسا و پەرلەمانێکی بەرپرسیار، هـەر هەموویان پێکەوە نایەن. واتە دیموکراتییەکی سەرکەوتو و چالاك، بە ئاسانی نایەت، ئەگەر ئەو ڕەگەزانەی بۆ فەراهەم نەکرێت.**

–بەڵێ ئەوە ڕاستە، بەڵام دەکرێ هەموویان پێکەوە لە سیاقێکی دووردرێژی گەشەکردندا بێن. لە ڕاستیدا گەشتن بەوە کارێکی زەحمەتە.

***زەحمەتە وەك دانیمارك-ت لێبێت، وەك ئەوەی لە کتێبەکەتدا ئاماژەت پێداوە؟**

– بەڵێ ئەوە ڕاستە، دامودەزگا سیاسییەکان لەگەڵ کاتدا گەشەدەکەن. بەڵام ئەوەش ڕاستە بۆ زۆرێک لە وڵاتەکان ڕێگایەکی ئاسان نییە تا وەک دانیمارک-یان لێبێت.

***دوا پرسیار: تۆ بۆچی بە کەمی لە میدیاکاندا دەردەکەویت. زۆر بە کەمی لەسەر شاشەی تیڤییەکان دەتبینین؟**

–ئەگەر من خەمی ئـەوەم بێت لەسەر شاشەی تیڤییەکانەوە دەرکـەوم، ئەوا بەدڵنیاییەوە هیچ توێژینەوەیەکی جدیی ئەنجامنادەم.



**سەرچاوە:**
الشرق الاوسط، ٢٠١٣/١٧/٢.



عەلی ڕەزا مەحموری

ئەو بەیانییە ساردەی سێی دی مانگی هەزار و سێسەد و شەست، تەنها حەزم دەکرد سەیری کەڤاڵە هەورێک بکەم کە لە ساتی خۆرهەڵاتندا پەمەیی بووبوو. ئێمە بەدوای یەکدا لە دامێنی گردێکەوە سەردەکەوتین و من سەیری سەرەوەم دەکرد کە کتوپڕ ڕێژنەی گوللە بەسەر سنگمدا تێپەڕی. من بە پشتا کەوتمە سەر زەوییەکە، سییەکانم گەرم و پڕبوون لە خوێن و دوای سێ خولەک، لە کاتێکدا کە هێشتا سەیری هەورە نارنجی و پەمەییەکەم دەکرد، مردم. قەت ئەو کەسەم نەبینی کە لە پشت تاشەبەردەکانی بان تەپۆڵکەکەوە تەقەی لێکردبووم. ڕەنگە سەربازێکی بیست ساڵە بوو بێت، لەبەرئەوەی گەر کەمێک ئەزموونی هەبوایە، لە نێوان سێ نەقیب و دوو مولازمدا کە لە دەستەکەی ئێمەدا بوو، سەربازێکی ئاسایی هەڵنەدەبژارد.

باوکم ئارەزووی بوو وەک برا دکتۆرەکەم بچم بۆ ئوسترالیا. بەڵام لەوەیە من ئەو توانایەم نەبووبێت. کۆتاییەکانی هاوین هەر کە دیپلۆمم وەرگرت، فرگەی تاران بۆردومان کرا. جەنگ دەستی پێکردبوو. دایکم نۆ مانگ لەماڵەوە زیندانی کردم. هەموو ڕۆژێ ڕۆژنامە و جارجار کتێبیشی بۆ دەکڕیم. دواجار ڕۆژێک ماندوو بووم و لەگەڵ پەروانە لە پارکێک ژوانمان دانا. پەروانەم لە ساڵی دووەمی ناوەندییەوە دەناسی و ساڵی چوارەم بەڵێنمان دابوو بۆ هەمیشە بۆ یەک وەفادار بین. پەروانە قژی نارنجی و جوان بوو هەمیشە سووراوێکی ڕەنگ مسی بریقاوەی لە لێوی دەدا. ساڵی سێیەمی ناوەندی کاتێک بۆ یەکەمجار و دوایین جار دوانیوەڕۆ بە ئەسپایی چووبوومە ماڵەکەیان، قژیم بینی.

هێشتا ئەو شووشە بۆنە دیارییەم نەدابوو بە پەروانە، کە لەسەر ڕێگە کڕیبووم و ئەو نامەیەش کە لە نۆ مانگی زیندانی ماڵەوەدا مەشقم لەسەر

نووسینی کردبوو، کە گەڕۆکە خۆبەخشەکان ئێمەیان گرت. تا ئەو کاتەی ئێمەیان دەخستە دواوەی پیکابەکەوە، هێشتا تێنەگەیشتبووم چی ڕوویداوە. دوای ئەوەیش تەنها سەیری نینۆکەکانم دەکرد تا چاوم بە چاوی پەروانە نەکەوێت.

بە هەراوزەناوە ئەویان رادەستی خێزانەکەی کردەوە و منیشیان برد بۆ زیندانێک کە لە باشووری شار بوو، بەڵام ڕێک نەمدەزانی کوێیە. کاتێک پەروانەیان لەبەر ماڵەوەیاندا لە پیکابەکە دابەزاند، یەکێک لە هاوسێکان پەنجەرەکەی کردبووەوە و سەیری ئێمەی دەکرد. تا ئەو کاتەی بەڕێکەوتین هێشتا لەوێ بوو.

لەناو ژوورە تاکەکەسییەکەمدا دڵێکی گەورەیان بە شتێکی نووک تیژ لە سەر دیوارەکە هەڵکەندبوو. لایەکی دڵەکە خوار بووبۆوە. دوو ڕۆژ قاچەکانم ڕاکێشابوو و سەیری دەرگاکەم دەکرد. دواجار هاتن و منیان بردە بنکەکەی دەرەوەی شار. ڕەبیەکە دیوارەکانی خشت بوون و سەرەوەیان تەلی دڕکاوی پێوە بوو. لەوێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کە سەریان تاشیبوون، سواری پاس بووین و چووین بۆ سەربازگەی فێرکاری. دوای شازدە کاتژمێر کە لەبەر سەربازگەکەدا دابەزین، عەریفێک ئێمەی ریز کرد و ئەوەندە بە چواردەوری سەربازگەکەدا ڕاوینانین تا دوای هەفتەیەکیش دەشەلین. هەموو سەربازی ڕاکردوو بووین. شەوی دواتر دوای ئەوەی گۆشتاوێکی روونیان داینێ، دووبارە ریزیان کردین و جلوبەرگێکیان بەسەردا دابەشکردین وەک گوێنی فشوفۆڵ بوو.

دوایین جارێک کە دایک و باوکم بینی، ئەو ساتە بوو پاسەکەی ئێمە بە چواردەوری گۆڕەپانی ئازادیدا دەخولایەوە تا بەرەو سەربازگەی فێرکاری بچین. ئەو دووانەی لە تەنیشت یەکێک لە باخچەکانی چواردەوری گۆڕەپانەکە وەستابوون و کاتێک منیان بینی دەستیان بۆ ڕاوەشاندم. سەربازەکانی دیش بە سەری تاشراوەوە لە پشت جامی پاسەکەوە دەستیان بۆ ئەو دووە ڕاوەشاند. بابە و دایە پێکەنین و پتر هاتنە پێش و دەستیان بۆ هەموومان ڕاوەشاند. ئێمەیش لە جێگەکەی خۆمان کەمێک هەستاین و دەستمان بۆ بابە و دایە ڕاوەشاند. نازانم چۆن دەیانزانی پاسەکەمان ئەو کاتژمێرە لە گۆڕەپانی ئازادییەوە تێدەپەڕێت. دوای پێنج مانگ کە گوللەکان سنگیان کونکردم، هێشتا ئەو نامەیە لە گیرفانی پانتۆڵەکەمدا بوو کە نۆ مانگ بۆ نووسینی بیرم دەکردەوە. هەر ئەو کاتە شووشەی بۆنە دیارییەکەیان لە زیندانەکە هەڵگرتبوو.

من چەندین کاتژمێر لە تەنیشت دەوەنێکی وشکی گەورەوە، کە لە سەری ئەسپ دەچوو و تاشەبەردێکیش کە ڕەنگێکی سەوزی سەیری هەبوو، مامەوە. هەورە پەمەییەکە وردە وردە بووە نارنجی و زەرد و پاشان تەواو نەما. ستوونەکەی ئێمە لە قووڵایی خاکی دوژمندا ڕێگەی ون کردبوو کاتێک ڕێژنە گوللە دەستی پێکرد، کەس نەیتوانی من لەگەڵ خۆی بکشێنێتەوە. دوانیوەڕۆ عێراقییەکان هاتن و بە پیکابێک منیان برد بۆ ساردخانە. ڕووتیان کردمەوە و هەموو جەستەمیان پشکنی. بێگومان



منیان لەگەڵ سیخوڕێک یا کەسێکی دی لێ تێک چووبوو، لەبەرئەوەی بڕیاریاندا نەمنێژن.

چوار هەفتە لە چەکمەجەیەکی کانزایی گەورەدا مامەوە کە گڵۆپێکی نیۆن بە ساپیتەکەیەوە بوو. هەر جارێک چەکمەجەکەیان رادەکێشا گڵۆپەکە دادەگیرسا. چەندینجار چەند کەسیان هێنا تا من ببینێت. هەندێکیان کەلەپچە کرابوون و هەندێکیشیان دەستەکانیان ئازاد بوو. بەڵام دواجار کەس منی نەناسییەوە. هەموو سەریان رادەوەشاند و دەڕۆیشتن. رۆژانی کۆتایی بوو کە دوو کەسی تریان هێنا و خستیاننە چەکمەجەکانی پەنای منەوە. نینۆکی دەستەکانی هەردووکیان دەرکێشابوون و پێستەکەیان پڕ بوو لە پەڵەی شینی سووتاوی. دوای سێ رۆژ هەرسێکمانیان بە ئامبۆلانسێکی جام تاریک برد بۆ گۆڕستانێکی چۆڵ. هیچ یەک لە گۆڕەکان کێلیان نەبوو. پێشتر جێگەی ئێمە ئامادە کرابوو، منیان خستە گۆڕەکەوە و دوو دیلی ئێرانی کە جلی زەردیان لە بەردابوو خۆڵیان بە سەرما کرد. پاشان گردە خۆڵێکیان بە ئەندازەی باڵام دروست کرد کە لە تەنیشت یەک دنیا گردی دییەوە بوو.

هیچ یەک لە گردە خۆڵەکان ناویان نەبوو. تەنها پلاکێکی سەوزیان لەسەر هەر گردێک چەقاندبوو، کە ژمارەی سپییان لەسەر هەڵکەندبوو. بە درێژایی گۆڕە بێناوەکان، ریزە دارێکی کاڵیپتۆس سێبەریان کردبوو. ئەو برایەم لە نامەکانیدا هەمیشە دەینووسی، ئوستڕالیا پڕە لە داری کاڵیپتۆس و هیچ ئێرانییەکی دی لێرە نییە.

ئەوبەری دارە ناسکە کاڵیپتۆسەکان، تەلارێکی دوو نهۆمی چیمەنتۆیی هەبوو. ئەو کەسانەی جارجارێ لە پەنجەرەی تەلارەکەوە سەرێکیان دەهێنایە دەرێ، ئەگەری هەبوو بیانتوانیبا پلاکە سەوزەکانی سەر هەر گردێک ببینن. ئەو بەرەی تری گۆڕستاکە مەزرایەکی گەورە بوو کە لە دوورەوە، هێڵی باریک و درێژ لە تەلی دڕکاوی سنوورەکەی پیشان دەدا. بەیانیان ژمارەیەک خەڵکیان بە ترێلە دەهێنا تا لەسەر مەزراکە کار بکەن و پاشنیوەڕۆیان کە بە تەنیشت گۆڕستانەکەدا تێدەپەڕین رستەگەلی فارسی پچرپچڕ دەبیسترا. خۆرئاوای هەشتا و حەوتەمین رۆژ کە سێبەری کاڵیپتۆسەکان تا کۆتایی گۆڕستانەکە دەهات، سێ کەس کە بۆ

هەڵکەندی گۆڕی تازە هاتبوون، نەپندی هاتنە سەر گۆڕەکەی من و سەلکی گوڵە لالەیەکیان لە تەنیشت پلاکی گۆڕەکەی منەوە ناشت. دیار نەبوو ئەو سەلکەیان لە کوێوە هێنابوو، بەڵام بە دڵنیاییەوە منیان لەگەڵ کەسێکی دی لێ تێک چووبوو. مرۆڤێک کە بێگومان زۆر گرنگ بووە و بە ناشتنی گوڵی لالە لەسەر گۆڕەکەی هەستیان بە رازی بوون و شانازی دەکرد. لە سبەیەوە ئەو دیلانەی کە بە جلی زەردەوە دەچوون بۆ مەزراکە، لە گردە خۆڵەکەی من رادەمان و لەگەڵ جووڵەی ئارامی ترێلەکە سەریان بەرەو ئەملاوە دەسووڕا.

سەلکە لالەکە هێدی هێدی رەگاژۆبوو و لاسکەکەی چەکەرەی کرد. دوای هەفتەیەک، سێ ئەفسەری عێراقی کە قەیتانی پۆستاڵەکانیان لە دەوری دەلنگی پانتۆڵەکانیان گرێ دابوو، هاتن و لەسەر گردە خۆڵەکەوە وەستان. ئەوان سەلکە لالە و تەنانەت پلاکە سەوزەکەیشیان هەڵکێشا. رەنگە بۆ سڕینەوەی شوێنەواری پەرستگای دیلەکان بووبێت کە فەرمانیان دا بلدۆزرەکان دارە کاڵپیتۆسەکانیش لە رەگەوە هەڵکێشن. بێڵی ئاسنی تەنانەت ئێمەیشی لە زەوییەکە هێنایە دەر و بەسەر یەکیدا رشتین. لە هەموو ئەم ماوەیەدا لە لای تەلارە چیمەنتۆییەکەوە دەنگی هاواری فارسی و عەرەبی دەبیسترا کە لە یەکتری بەرزتر دەبوونەوە. دواجار بە بێڵی میکانیکی ئێمەیان رشتە دواوەی چەند لۆرییەکەوە. کاتێک لۆرییەکە بەرێکەوت، هێشتا دەنگی جووڵەی ئەو ئۆتۆمبیلانە دەبیسترا کە ئارامگاکەی ئێمەیان تەخت دەکرد. قامکەکانی دەستی چەپم بۆ هەمیشە لەوێ لە ژێر خۆڵەکەدا بەجێما.

لۆرییەکان تا دوانیوەڕۆ بەردەوام دەڕۆیشتن، بەر لە خۆرئاوا گەیشتینە جێگەیەک کە شاخی بەرزی لێبوو. لۆرییەکانیان لە حەوشەی رەبییەیەکی چەپەک وەستاند، دیوارەکانیان بە دۆخاو سپی کردبوو. هەتاوی خۆرئاوا لە دەروازەی رەبییەکەوە دەیدا لە ناوەوە و چوارگۆشەیەکی سووری لەسەر دیواری حەوشەکە دروستکردبوو. دوو رۆژ لەو جێگەیە ماینەوە و هەموو خۆرئاوایەک چوارگۆشە سوورەکە دەکەوتە سەر دیوارەکە. بەیانی رۆژی سێیەم دووبارە بەرێکەوتین. جادەیەکی پڕ چاڵ و چۆڵی و بەردەڵان بوو ئێمە جارجارێ لەو وڵاخە بەرزانە دوادەکەوتین کە لە قەراغی جادەکەوە تێدەپەڕین. دەمەونیوەڕۆ گەیشتینە دەربەندێکی قووڵ کە کەوتبووە ناوەندی کۆمەڵە شاخێکی دارستاناوییەوە. لەوێ ئێمەیان رشتە ناو چاڵێکی درێژەوە کە وەک کەناڵ وابوو. چاڵەکە پێشتر ئامادە کرابوو. عەسری هەمان رۆژ لۆریتریش هاتن و ئەو ژمارە سەربازەیان رشتە سەر ئێمە کە تازە گولله بارانیان کردبوون. جله فشوفۆڵەکانیان خوێناوی و کونکون بوو و هێشتا هەندێکیان خوێنی تازەیان لەبەر دەڕۆی. پاشان بلدۆزەرەکان هاتن و چاڵەکەیان داپۆشی.

رێک سەری ژنێک کەوتبووە سەر ملم کە قژە خورمابیە درێژەکەی ئاڵابووە دەموچاوی و چاوەکانی دادەپۆشی. قاچی لاواز و سپی پیاوێک کەوتبووە سەر سەنگم و دەمی داچەقیوی یەکی دی بە سکمەوە نووسابوو. منیش لە سەر لا کەوتبوومە سەر سنگی پیاوێک کە پەراسووەکانی شکابوون. ئەم پەرێشانییە زۆری پێنەچوو. دوای شەست و پێنج رۆژ گروپێک

سەرباز و پلەدار هاتن و بە پرتاو خۆڵەکەیان لادا تا شوێنی ئێمە بدۆزنەوە. ئەوان دەسریان لە دەمیان پێچابوو، بە خێرایی هەموومانیان خستە دوای لۆرییەکەوە. ڕەنگە کەسێک ئەو شوێنەی بە ڕێکخراوێک وتبێت و ئێستا دەبوو شوێنەواری بسڕێتەوە.

کە بەڕێکەوتین سەربازەکان خەریکبوون چاڵی درێژ و خاڵییان بە تایەی کۆنە پڕ دەکردەوە و ڕووەکەیان بە خۆڵ دادەپۆشی.

ئەو شەوەی کە لۆرییەکان لە جادە کوێستانییەکانەوە تێدەپەڕین. بۆنێکی خۆش دەهات. شوانێکی شەوگەڕ لە دامێنی شاخێک ئاگرێکی کردبۆوە، لە پێشتر ڕێزێک هەنگەڵانی لە تەختە دروستکراو لە دامێنێکی تر لە ژێر تریفەی مانگدا بوون. هەوا پڕ بوو لە بۆنی گیای کێوی و مێروو.

گەر پەروانە لەوێ بوایە تا بەیانی نەدەنووستین. لەسەر سیسەمێک کە چەرچەفی پاکوخاوێنی هەبێت. ڕادەکشاین و سەیری ئەو گوڵ ئەستێرانەمان دەکرد کە دواوەیان دادەگیرسا و لە پەنجەرەی کراوەوە دێنە ژوورەوە و هەڵدەبن و دەکوژێنەوە. دوای تۆزێک دنیا بووە هەور و باران دایکرد. من لە سەر ئەوانی دی بووم و ئێسکەکانم تەڕ بوون. بەیانی کاتێک گزنگ لە پشت دارەکانی لووتکەی شاخەکەوە سەردەکەوت گەیشتینە ئەو جێیەی چاوەڕێمان بوون. لۆرییەکە لە تەپۆڵکەیەکی خوارەوە پێچی کردەوە و دەشتەکە لە ڕووناکی کزی ئاسماندا دەرکەوت. دەشتەکە بەو کونە بێ ژمارانەی کە لێیان هەڵکەندبوون وەک شانەی هەنگ وابوو.

کە هەتاو هەڵدەکشا، ئەو پیاوانەی دەمامکیان بەستبوو هاتن و ئێمەیان خستە گۆڕەکانەوە. بێزیان نەدەهات دەستمان تێوەدەن. بێڵی درێژیان پێبوو و ئێمەیان هەڵدەدایە ناو گۆڕێکەوە. دەستێکی دییان خستە گۆڕەکەی منەوە کە ئەڵقەیەکی ژەنگگرتوو لە پەنجەیدا بوو. ئەو ددانە دەستکردانەی پیاوێک کە لە لۆرییەکەدا لە تەنیشتمەوە بوو لە دەمی هاتبووە دەرێ. یەکێک لەو سەربازانەی بە خێرایی تێدەپەڕی بە نووکە شەقێک فڕێی دەدایەوە گۆڕەکەوە. ددانەکان ڕەش بووبوونەوە و خوێنی وشکەوە بوویان پێوە لکابوو. نینۆکی ئەو دەستەی ئەڵقەکەی پێوەبوو، شین بووبۆوە. دوای تۆزێک ئێسکی درێژی قاچی کەسێکی تریان فڕێدایە خوارێ. لە ناوەڕاستی قاچەکەدا، شتێکی بچووک هەڵتۆقیبوو، چما لە ناوەڕاستەوە پێکیانەوە لکاندبوو. بێگومان پێشتر قاچی شکابوو، بەڵام من هیچ جێیەکم نەشکاوە، لەبەرئەوەی دایکم وەسواس بوو لە منداڵییەوە وریابوو یارییەک نەکەم مەترسی هەبێت.

دیاربوو گۆڕەکانیان بە پەلە هەڵکەندووە. دیواری گۆڕەکەی من تەواو خوار بوو بوو و زەوییەکەیش هەڵتۆقیبوو. گەر زەوییەکەیان دوو، سێ بێڵ قووڵتر هەڵکەندایە، بێگومان گۆڕستانە دێرینەکەیان دەدۆزییەوە، کە هەروا چەند پەنجەیەک خوارتر بوو. ڕێک لە ژێر گۆڕەکەی مندا، گۆڕی شازادەیەکی ئاشووری هەبوو کە شمشێرە درێژە برۆنزەکەی بە هەر دوو دەست لەسەر سنگی گرتبوو و گەر کەمێک بەرزی بکردایەتەوە، نووکی شمشێرەکەی ڕۆدەچووە نێو دوو ئێسکی سمتمەوە.

وەک هەوەڵین جار کە نێژرام، لەسەر گۆڕەکەم

تەپۆڵکە خۆڵێکیان بە هێندەی باڵام دروستکرد و پلاکێکیان بە چەند ژمارەیەکی سپی لەسەر چەقاند. بۆ سبەی باران دایکرد و دوای دوو هەفتە زەوی سەوزبوو. گیا کێوییەکان چەندین جار وشک بوون و رۆچوون و دووبارە سەوز بوونەوە. دوو هەزار و هەشت سەد و شەست و چوار رۆژ لەوێ مامەوە. رەگی گیاکێوییەکان بە دیواری گۆڕەکەوە شۆڕبووبوونەوە و شازادە ئاشوورییەکە هەروا بە دوو دەست شمشێرەکەی گرتبوو. رۆژێکیان دیسان ژمارەیەک بە بێڵەکانیانەوە هاتن و گۆڕەکانیان کردەوە و ئێمەیان خستە ناو کیسەی سپییەوە. ژمارەیان لە هەر کیسەیەک دەدا. کیسەکانیان خستە لۆرییەکی زەردەوە و تا شەو دەیانئاژوو. ئێمە دەگەڕاینەوە. هێشتا لە خاکی دوژمندا بووین، بەڵام لە دوورەوە ئاسمانی ئێران دەبینرا. کاتێک گەیشتینەوە سنوور، دنیا تاریک بووبوو. لە رەبییەیەک کە لە ناو خاکی ئێراندا بوو، چەند لۆرییەکی گەورە لە ژێر پرۆجکتەری بەرزدا چاوەڕێمان بوون. گەر دایە و بابە یا پەروانە دەیانزانی گەڕاومەتەوە، بێگومان لەوێ چاوەڕێم بوون. بەڵام کەس دیار نەبوو. وەک چوارشەممە سوورەی ساڵێک وابوو کە لە دوو رۆژ پێشترەوە دارمان بۆ ئاگربازی کۆدەکردەوە، بەڵام عەسر دایکردە باران و دارەکان تەڕ بوون. هەموو گەڕانەوە ماڵێ و کەس نەمایەوە.

ئێمەیان خستە ناو لۆریەکانەوە و بردیانین بۆ فرگە، لەوێ منیان بەو هەموو بارە زیادەیەوە کە لە ئێسکی بێگانە هەمبوو، خستە فرۆکەوە و فڕی. کاتێک لە تاران نیشتینەوە، دنیا هەور بوو. ئەوان ئێمەیان برد بۆ یەکێک لە کۆگا گەورەکانی فرگەی میهرئاباد. هەمان ئەو جێگەیەی کە کاتی وەرگرتنی دیپلۆمەکەم بۆردومان کرا. ئەوان دەرگای گەورەی کۆگاکەیان داخست و ئێمەیان لەو کیسانە دەرهێنا کە ژمارەیان پێوە بوو. ناو کۆگاکە پڕ بوو لە تابووتگەلی یەک شێوە و بە وردی ئێمەیان لە ناو تابووتەکاندا



دادەنا. هەندێک دوورتر وەستابوون و دەگریان. کاتێک کارەکەیان تەواو بوو، ئالآیەکی گەورەیان لەسەر هەر تابووتێک دانا و وێنەیەکیان بە پێشەکەوەیەوە لکاند. وێنەی گەنجێکیان لە تابووتەکەی من دابوو کە سمێڵێکی باریکی هەبوو. من لە ژیانمدا سمێڵم نەبووە، دیار بوو لە جێیەکی خاکی دوژمن ژمارەکەی من هەڵە بووە.

ئەو سەربازانەی کە جلەکانیان دەڵب نەبوو و قەیتانی سوور بە شانیاندا هاتبووە خوارێ، یەک یەک تابووتەکانیان بەرزکردەوە و لە گۆڕەپانە کراوە و گەورەکەی دەرەوەی کۆگاکە رێکیانخستن. ئاپۆرایەکی زۆر لە دەوروبەری گۆڕەپانەکە گردبووبوونەوە. زۆریان دەگریان و هەندێکیش وێنەیەکی لە چوارچێوە گیراوی گەنجێکیان بەرزکردبۆوە. باوک و دایکمیان لەگەڵ نەبوو. ئاسەوارێکی پەروانەیش نەبوو. گەر دەموچاوێکم دەبوو، رەنگە کەسێک پەیدابوایە بمناسێت. کامێرامانی زۆر لە ناو ئەو گۆڕەپانەوە دەهاتن کە سەربازەکان چواردەوریان گرتبوو و وێنەی هەموو شتێکان دەگرت. کەسێکیش لەودویو تابووتەکانەوە لەسەر سەکۆیەکی بەرز وەستابوو و وتاری بۆ خەڵکەکە دەخوێندەوە.

لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا رووخسارێکی ئاشنا هەبوو. وێنەی گەنجێک، کە قژی خورمایی و زەردەخەنەیەکی لەسەر لێو بوو. وێنەی خۆم بوو. ئەو پیرەژنەی لەچکی قاوەیی کردبوو ئەو وێنەیەی بە بان سەرییەوە گرتبوو. دایکم بوو. خۆی بوو. زۆر پیر بووبوو. باوکم نەهاتبوو، ئەوان کاتێک لە دەوری گۆڕەپانی ئازادی سلاویان بۆ دەکردم پێکەوە بوون. دایە چکۆلە بووبۆوە. بێگومان بابە مردووە، گەرنا نەیدەهێشت دایە بە تەنیا بێت.

دوای ئەوەی وتار و وێنەگرتن تەواو بوو. هەر وێنەیەکیان خستە پیکابێکەوە و لە گۆڕەپانەکە چوونە دەرێ. گاڤێک بە چواردەوری گۆڕەپانی ئازادیدا دەسووڕاینەوە، خەڵکەکە جارجارێ لە تەنیشت باخچەکانەوە دەوەستان و سەیری کاروانی پیکابەکانیان دەکرد. منیان برد بۆ ماڵێکی کۆنە کە حەوشە و حەوزی هەبوو. لەوێ لە پێشترەوە قەرەوێڵەیەکیان بۆ ئامادە کردبووم و ئەوەندەیان گوڵدانی پڕ لە مۆم دانابوو هەنگەکانی گێژ دەکرد. تا شەو ژمارەیەک دەهاتن، ناوچەوانیان بە تابووتەکەوە دەنووساند، دەگریان و دەڕۆیشتن. بە درێژایی ماوەکە تەنها پیرەژنێک مابۆوە. لووتە گەورەکەی پیرەژن لە گریاندا سووربووبۆوە. کاتێک دەگریا زۆر لە دایکم دەچوو. رەنگیشە هەموو مرۆڤەکان کاتێک دەگرین وەک یەکیان لێ بێت. هەر پێنج خولەک جارێک هەڵدەستا و گۆشەیەکی تابووتەکەمی ماچ دەکرد. بەڵام هەر جارێک دەیویست سەری تابووتەکە لابدات، چەند کەسێک دەیان گرت و دووبارە لە سەر کورسییە رەشە چەرمەکە دایان دەنیشاندەوە.

بۆ سبەی تابووتەکەی منیان خستە ناو هەمان پیکابەوە و بردیان بۆ سەر تەپۆڵکەیەکی دەرەوەی شار. چواردەوری تەپۆڵکەکە پڕ بوو لە دار و درەختی کۆن، لەوێ چەند گۆڕێکی گەورە و بە شکۆیان بۆ ئێمە هەڵکەندبوو. کاتێک دەیانویست من بخەنە شوێنی خۆم، سەری تابووتەکیان لادا. هێشتایش چەند کەسێک پیرەژنەکەیان گرتبوو، بەڵام پێویستی نەدەکرد، ئەو هەرگیز جووڵەی نەدەکرد. حەپەساو سەیری ئەڵقەیەکی ژەنگگرتووی

دەکرد کە بە دەوری ئێسکی ئەو دەستەی دییەوە بوو. ئەو تەنانەت نەش دەگریا.

ئەوان منیان بە باشی ناشت، بەردێکی رەشیان خستە سەر گۆڕەکەم کە هێندەی خۆم دەبوو و وێنەی گەنجێکی سمێڵ باریکیان لەسەر دانا. هێشتا پیرەژن لە بەردەکە رامابوو. کورسییەکیان بۆ دانابوو تا دابنیشێت، بێگومان باداری هەبوو. وەک دوێنێ ژمارەیەکی زۆر گردبووبوونەوە و کامێرامانەکان وێنەی هەموو شتێکیان دەگرت. لەوێیش بڵندگۆیەکیان دانابوو و کەسێک وتاری دەدا. دنیا هەور بوو و فلاشی کامێراکە وەک بروسکە لە ئاسماندا دەدرەوشایەوە. پاشان هەموان رۆیشتن و پیرەژنیشیان لەگەڵ خۆیان برد.

لەم بەرزییەوە تاران تا چاو هەتەر دەکات دیارە. ئەوەندە دوورە ناتوانم ماڵی پەروانە بدۆزمەوە. رەنگە ئەو نامەیەی کە نۆ مانگ مەشقم بۆ نووسینی دەکرد، هێشتا لە جێگەیەک بێت لە ئەرشیفەکانی عێراق. بێگومان شووشەی بۆنەکەیش لەگەڵ خۆڵ و خاشاک خراوەتە ژێر گڵ. گەر پەروانە رۆژێک بۆ هەوا گۆڕین بێتە ئەم دەوروبەرە، تێدەگەم هێشتایش سووراوێکی کاڵی بریقاوە دەکات یا نا. وەرزێکی خۆشە. دنیا جارجار هەتاوە و جارجاریش دەبێتە باران. پەڵە هەورێکی گەورە بە ئاسمانەوەیە کە سەرەوەی رەنگی پەمەیی گرتووە. پەپولەیەکی نارنجی بەسەر ئەو گیایانەوە نیشتۆتەوە کە گوڵی زەردیان گرتووە. ئێستا هەڵدەستێت و بەرەو دارە کۆنەکان دەچێت.

سەرچاوە:

http://kawac.blogfa.com/post-38.aspx



ئەلبێرتۆ
مۆراڤیا

# شێرە خۆرەکە

نووسینی: ئەلبێرتۆ مۆراڤیا
و. لە عەرەبییەوە: دڵسۆز حەمە

که  ئەو خانمە خێرخوایەی  سەر بە ڕێکخراوی سەرپەرشتیکردنی منداڵانە هاتەسەردانمان، یەکسەر ئەو پرسیارەی کردەوە کە هەموویان دەیانپرسی ئەو هەموو منداڵە بۆ دەخەنەوە ؟ ژنەکەشم کە ئەو ڕۆژە  هەستی بە دڵتەنگی دەکرد لەولاوە لێی ڕاپەڕی  و ڕاستوڕەوان  گوتی:
(ئەگەر لەتوانامانداا بوایە  دیارە ئێواران  ئێمەش دەچوین بۆ  سینەما ، لەبەرئەوەی  پارەمان نیە ،هەر سەرلەئێواران  زوو دەچینە  بن  جێگە ، ئیتر ئابەوجۆرە  بۆ خۆی  منداڵ  دروست دەبێت )
دیار بو خانمەکە بەم قسەیە زۆر بێزار بوو، هیچی نەگوت  و چوە  ئەولاوە، بەڵام  من  بە ژنەکەمدا هەڵشاخام  و  پێمگوت کە پێویست ناکات هەمیشە ئینسان ڕاستیەکە بڵێت، دوای ئەوەش  پێویستە ئینسان پێش  درکاندنی هەر ڕاستیەک  بزانێت بەرانبەرەکەی کێیە ، لەگەڵ  کێ  هەڵسوکەوت دەکەیت. لە تەمەنی گەنجیمدا  ، پێش ئەوەی ژن بێنم ، زۆرجار خۆمم بەخوێندنەوەی ئەو هەواڵانەوە سەرقاڵ  دەکـرد کە لە ڕۆژنـامـە  ناوخۆییەکاندا بڵاودەبونەوە ، لەوێدا  باسی هەموو  ئەو جۆرە کارەساتانە دەکـرا  کە ڕەنگە توشی مرۆڤ بێت وەکو ڕوداوەکانی دزی ،کوشتن ،ڕوداوی  خۆکوژی ، ڕوداوەکانی هاتوچۆ و ڕێگاوبان ،لە نێوان ئەو هەموو کارەساتانەدا ، کارەساتێک هەبوو کە هەرگیز بەخەیاڵمدا نەدەهات کە توشی  من ببێت ، ئەویش (ببمە  جێگای بەزەیی) ، بە مانای کەسێک  سۆز و بەزەیی ئەوانی تر بجولێنێت بەهۆی چارەڕەشی و بەدبەختیەوە لە ژیاندا بێئەوەی  پەیوەندی هەبێت بە کارەساتێک یان ڕوداوێکی تایبەتیەوە کە توشی هاتبێت ، بەڵکە  هەموو  گرفتەکەی ئەوەیە کە دەژی و لە ژیاندا  ماوەتەوە و  هیچی تر .
وەکو باسم کرد ، ئەوکات من کوڕێکی گەنج  بووم ، نەمدەزانی بەخێوکردنی خێزانیکی گەورە مانای چیە ، بەڵام  دەبینم  ئێستا هێواش هێواش  بەتەواوی گەیشتومەتە ئـەوەی  کە بە ( کەسێکی جێگای بەزەیی) دەتوانرێت گوزارشتی لێبکرێت ، ئەوە  بۆتە جێگای سەرسوڕمانم ، بۆ نمونە جاران دەمخوێندەوە نوسرابوو (لە  هەژاریەکی کولەمەرگیدا دەژین ) ، بەڵێ  ئەوەتا ئێمە لە هەژاریەکی  کولەمەرگیدا دەژین ،یان  دەیانگوت (لە ماڵێکدا دەژیـن  هەر بەناو ماڵە ئەگینا داری بەسەر بەردەوە نیە) ، ئێ ئەوەتە  ئێستا  منیش  لە (تووڕمارئانشیۆ) دەژیم ، خۆم و ژنەکەم  و شەش  منداڵەکەم لە ژورێکی خاڵیداین  کە  لە  ژمارەیەک  دۆشەکی  زۆر زیاتر کە لەسەر  زەویەکە  ڕاخـراون  هیچی تری تێدا نیە  ، وەختێکیش  باران دەبارێت  ، ئاوەکە وەها بەسەرسەرمانا  دێتەخوارەوە ، وەکو چۆن بەسەر ئەو  کورسیانەدا دێتەخوارەوە کە لەسەر شەقامی  (ڕێبیتا) ن ،  یان ڕەنگە  خوێندبێتمەوە (هەرکە ژنە  هەژارەکە  بۆی دەرکەوت کە  دووگیانە بڕیاری دا کە  خۆی  لەو  بەرهەمی  خۆشەویستیە  ڕزگار بکات) ئێ باشە ژنەکەی منیش بڕیارێکی  لەوجۆرەی داوە کە هەردووکمان لەسەری ڕێیکەوتوین، ئەوکاتەی بۆمان دەرکەوت کە بۆ جاری حەوتەمین دووگیانە ، لە ڕاستیدا  بڕیارماندا  وەختێک  ئاووهەوا خۆشتر و ، کەمێک گەرمتر بێت لە ئێستا  منداڵەکە لە یەکێک لە کڵێساکاندا بە جێبهێڵێن ، واتە  بە جێی بێڵین بە هیوای   چاودێری  و خێرەومەندی ئەو کەسەی کە یەکەمین کەس  ڕێکەوتی  دۆزینەوەی  دەکات .
بە  هەوڵ  و یارمەتی ئەو خانمە  خێرخوازانە ژنەکەم داخڵی نەخۆشخانەی  منداڵبوون  کرا هەتا منداڵەکەی ببێت ، هەرکە باری تەندروستی باشتر بو  خۆی

وکۆرپەکەی گەڕانەوە بۆ (توورمارئانشیۆ) ، کە هاتە ژورەکەوە گوتی: (ئەزانیت، هەرچەندە خەستەخانە هەر خەستەخانەیە ، بەڵام بەدەست خۆم بوایە حەزم دەکرد لەوێ بمامایەتەوە و نەگەڕامایەتەوە ئێرە) . هەر کە ئەم قسانە لە دەمی هاتنە دەرەوە یەکسەر ساواکە وا قیژاندی کە باوەڕ ناکەیت ، وەکو ئەوەی لە مانای قسەکانی ژنەکەم حاڵی بوبێت ، منداڵێکی زۆر شیرین و بەردڵان بوو دەنگێکی وەها بەرزی پێوەبوو کە شەوانە بەخەبەردەهات دەیکردە گریان و خەوی لە هەموومان دەزڕاند .

کە مانگی نیسان هات وهەوا بە جۆرێک خۆش ببو دەتتوانی بێ پاڵتۆش بچیتە دەرەوە ، من و ژنەکەم لە (توورمارئانشیۆ) بەرەوە ڕۆما دەرکەوتین. ژنەکەم ساواکەی گرتبوە باوەشی، ئەوەندەی جل تێوەپێچابوو وەکو ئەوەی بە نیازبێت لە چاڵەبەفرێکدا بە جێی بێڵێت بێئەوەی ئازاری پێبگات .

هەر ئەوەندە گەشتینە شار ، وەک ئەوەی بیەوێت ڕاستی ئەو بێزاریەی خۆی بشارێتەوە سەبارەت بەم شتەی کە بە نیازە بیکات ، بە بێ پچران کەوتە قسەکردن ، هەناسەی توند بوبوو ، نیشانەی شەکەتی زۆر بەسەر ڕوخساریەوە دیاربوو ، سەروپرچەکەی پەشێو و بەهەموو لایەکدا بژ بوبۆوە چاوەکانی بە جۆرێک دەرپەڕیبون ، دەمێک باسی ئەو کڵێسایانەی دەکرد کە ڕەنگە منداڵەکەی تێدا بە جێبێڵین، زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکرد لە کڵێسایەکدا بە جێیبێڵین کە خەڵکی دەوڵەمەند ڕووی تێدەکەن ، ئەگەر ئەوانەی هەڵیدەگرنەوە هەر وەک خۆمان هەژار بن باشتر وایە هەر لەبەردەستی خۆماندا بمێنێتەوە . دەمێکی تر ڕای دەگۆڕی و دەیگوت نا باشترە کە کڵێسایەک بێت نەزری مەریەمی پاکیزە کرابێت ، چونکە مەریەم خۆشی کوڕێکی هەبوە لەبەرئەوە لەوانەیە لەم جۆرە شتانە بمانبەخشێت و کوڕەکەش بخاتە بەر ڕەحمەت و بەزەیی خۆیەوە. ئەمجۆرە قسەکردنە شەکەتیان کردم و مێشکیان تەقاندم، بەتایبەتی کە زۆر هەستم بە زەلیلی خۆم دەکرد ، ڕقم لەم کردەوەیەی خۆم بو کە بەنیاز بوم بیکەم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵم دەدا قەناعەت بە خۆم بێنم کە دەبێت زاڵ بم بەسەر هەستی خۆمدا و خۆم هێمن نیشان بدەم ، هەتا یارمەتی ئەویش بدەم کە خۆی ڕابگرێت ، هەندێک بۆڵەبۆڵی کرد. بۆ ئەوەی ڕێگە لە قسەی زیاتری بگرم پێمگوت : ( من بیرۆکەکم هەیە ، بۆچی لە کەنیسەی پەترۆسی پیاوچاک بە جێی نەهێڵین)

ژنەکەم تۆزیک دوودڵ بوو ئینجا گوتی (نا ، ئەوێ زۆر گەورەیە و کەس ئەو منداڵە نایبینێت ، ئەو کڵێسا بچکۆلەیەم پێ باشترە کە دەکەوێتە کۆتایی شەقامی (کوندوقی) ئەوێ پڕە لەو دوکان و بازاڕە کەشخانەی کە دەوڵەمەندێکی زۆر ڕووی تێدەکەن ،من ئەوێم بەلاوە گونجاوترە.)

سواری پاس بوین و لەناو خەڵکەکەدا بە بێدەنگی دانیشتم ، ژنەکەشم خەریکی چاککردنی قوماتە خوریەکە بو کە هەرجار ناجارێک توندتری دەکردەوە، منداڵەکەش خەوی لێکەوتبوو ، ڕوخساری لەناو ئەو هەموو قوماشەی تێوەی پێچرابو سوری دەکردەوە ، جلەکانی وەکو جلوبەرگەکەی ئێمە شڕ بوو ، تاقە شتێکی جوان لەبەریدا ئەو جوتە دەستکێشە شینە بوو کە بە خوری چنرابوو ، لە ڕاستیدا دەستەکانی تا ئەوپەڕی واڵا کردبۆوە وەکو ئەوەی شانازی بەو دەستکێشانەوە بکات .

لە (لارجۆ گۆڵدنی) دابەزین ، دیسانەوە ژنەکەم

دەستی کردەوە بە درێژدادڕی ، ئینجا لەبەر دوکانی یەکێک لە زەرەنگەرەکاندا وەستا ، کاتێک سەیری ئەو خشڵانەی دەکرد کەلەناو جامخانەکەدا و لەسەر ڕەفەی بە قەدیفەی سوور داپۆشراو پیشاندرابون گوتی: ( دەبینیت چەند جوانە ! خەڵک ڕودەکەنە ئەم دوکانانە تا خشڵ و شتی جوان بکڕن ، بەلام خەڵکی هەژار ئیشی بەم جێگایە نیە ، لە کاتێکدا لەم دوکانەوە دەچنە یەکێکی تر ، لە ساتەوەختێکیشدا خۆیان دەکەن بە کڵێساکەدا بۆ نوێژکردن ، دوای ئەوە ، کە میزاجیان هێمن و سەرحاڵن ، منداڵەکە دەدۆزنەوە و دەیبەن)
ئەم هەموو قسانەی کرد ، لەکاتێکدا وەستابوو سەرنجی خشڵەکانی دەدا و توند منداڵەکەی بە سنگی خۆیەوە نوساندبوو ، چاوەکانی بەتەواوی کرابونەوە .
کە قسەی دەکرد وەکو ئەوە وابو لەبەر خۆیەوە ، لەگەڵ خۆی قسە بکات ، بەلام من هەر نەمدەتوانی چەندوچونی لەگەڵ بکەم . ڕومان کردە کڵێساکە ، کڵێسایەکی بچوک بوو ، هەمووی وا بۆیە کرابوو لەوەی دەکرد سەراپا مەرمەڕی زەرد بێت ، ژمارەیەک میحراب و مینبەرێکی گەورەی هەبوو، ژنەکەم گوتی : (من شێوەیەکی ترم لە خەیاڵدا بوو ، ئابەم حاڵەوە هیچ بە دڵم نیە ، لەگەڵ ئەوەشدا پەنجەی لە ئاوی پیرۆز هەڵکێشا و نوێژی کرد و پاشان بە دەوری شوێنەکەدا و بە هەنگاوی کورت کورت لە ڕۆشتندا بەردەوام بوو. زۆر بە چاوێکی پڕ ترس و گوماناوی سەرنجی شوێنەکەی دەدا و منداڵەکەی بە سنگی خۆیەوە دەنوساند.
ڕوناکیەکی سارد و پرشنگدار لەو گڵۆپەوە پەرش دەبۆوە کە بە قوببەی کڵێساکەدا هاتبوە خوارێ ، ژنەکەشم لە میحرابێکەوە دەچوە یەکێکی تر و لە هەموو شتەکان وورد دەبۆوە ،کورسیەکان ، میحرابەکان ، وێنەکان هەتا بتوانێت بڕیاری ئەوە بدات ئاخۆ ئەم شوێنە گونجاوە منداڵەکەی تێدا بە جێ بێڵین یان نا . بەڵام من لە دوایەوە و لە دووری مەسافەیەکەوە دەڕۆیشتم بە دوایدا و بە درێژایی کاتەکەش چاوێکم لەسەر دەرگاکە بوو چاودێریم دەکرد .
لە پڕ کچێکی گەنجی بەژن ڕێک هاتە ژورەوە ،کراسێکی سووری لەبەردا بوو، قژە زەردەکەی وەکو ئاڵتون هاتبوە خوارەوە . کچەکە سوژدەی برد ، لەو کاتەدا تەنورەکەی زیاتر بە لەشیەوە چەسپ بوو ، بۆماوەی دەوروبەری خولەکێک نوێژی کرد و بێئەوەی سەیری ئێمە بکات چوە دەرەوە .
ژنەکەم کە بە ووردی چاودێری کچەکەی دەکرد لە پڕ گوتی:ئەم شوێنە گونجاو نیە ، ئەو خەڵکانەی هاتوچۆی ئێرە دەکەن وەکو ئەو کچە پێدەچێت زۆر بە پەلە بن بۆ ئەوەی خێرا دەرچنە دەرەوە بۆ سەیری ئەو دوکان و بازاڕانە ، با بڕۆین .
ئیتر بە پەلە چوە دەرەوە .
هاتینەوە سەر جادەکە ماوەیەک ڕۆشتین بە هەنگاوی خێرا و بەدرێژایی شەقامی (کورسۆ) ژنەکەم لە پێشەوە و منیش بە دوایدا ، هێندەی نەبرد نزیکی (پیازیا ڤێنیسیا ) خۆمان کرد بە کڵێسایەکی تردا ، ئەمەیان فراوانتر دیار بوو ، نیمچە تاریک بوو ، پڕ بوو لە وێنەو تابلۆی بە ئاڵتون ڕوکەش کراو ، دۆڵابی شوشەیی کە پر بوون لە دڵی زیوین لەبەر ڕوناکیە کزەکەدا دەبریقانەوە ، تاڕادەیەک ژمارەیەک خەڵکی زۆر لەناو کڵێساکەدا بوون ،هەر بە چاوخشاندنێکی خێرا بۆم دەرکەوت ئەمانە لەو کەسانەن کە خەڵکێکی خۆشگوزەرانن ، ژنەکان

هەر هەموویان شەپقەیان لەسەر کردبوو لە کاتێکدا پیاوەکانیش جلوبەرگی پۆشتە و ڕێکوپێکیان لەبەردا بوو.

لەسەر مینبەرەکەوە واعیزێک وەستابوو ، دەستی بە ڕاستوچەپدا بادەدا و وەعزی دەخوێند ، هەموو ڕویان لەدەمی ئەو کردبوو ، دۆخەکەم بەلاوە گونجاو بوو. لە کاتێکی وادا پێموابو کەس هەستمان پێناکات ، بە گوێی ژنەکەمدا چرپاندم : لێرە جێی بهێڵین ؟ ژنەکەم بە جۆرێک سەری دانەواند کە مانای ڕازی بوون بوو ،ڕومانکردە قوژبنێکی لاتەنیشتەوە کە ئەوەندە تاریک بوو بە زەحمەت چواردەوەری خۆتت دەبینی ، کەس دیار نەبوو ، ژنەکەم بە سوچێکی قوماتەکە دەموچاوی منداڵەکەی داپۆشی و لەسەر یەکێک لە کورسیەکان داینا، وەکو ئەوەی خۆی لە بوخچەیەک ڕزگار بکات کە دەستی گرتوە ،ئینجا کەوتە سەر ئەژنۆ بۆ ماوەیەکی درێژ دەستی کردە نوێژکردن و بە هەردوو لەپی دەموچاوی خۆی شاردبۆوە ، بەڵام من کە نەمدەزانی چی بکەم خۆم بەسەیر کردنی ئەو سەدان دڵە زیوینەوە سەرقاڵ کردبوو کە بە چەندەها قەبارەی جیاواز دیواری نوێژخانەکەی داپۆشیبوو ، لە کۆتاییدا ژنەکەم هەستایە سەرپێ و نیشانەی سووربون ڕوخساریەوە دیاربوو لەسەرخۆ دەستی کردە ڕۆشتن و لە جێگاکە دوورکەوتەوە ،منیش لە دوایەوە بە مەسافەیەکی کەم دەرۆیشتم ، ئالەو ساتەوەختەدا کابرای واعیز بە دەنگێکی بەرز قیژاندی: ( بۆ کوێ دەچیت ئەی پەترۆس ؟؟) لەمکاتەدا وا شپرزە بووم وەکو ئەوە بوو پرسیارەکە ئاڕاستەی من بکات ، ئالەو کاتەدا کە ژنەکەم پەردەی پشت دەرگاکەی بەرزکردەوە کە بڕواتە دەرەوە دەنگێک لە پشتەوە زەندەقی بردین و گوتی: خانمەکەم بوخچەکەت لەسەر ئەو کورسیەی ئەوێ لە بیر چوو .

ژنێک سەرتاپا ڕەشی پۆشیبوو ،لەو جۆرە ژنە ئیماندارانەی هەموو ڕۆژەکەی لە هاتوچۆی نێوان کڵێسە وژووری پیرۆزیەکاندا دەباتەسەر ، ژنەکەم وەڵامی دایەوە « ڕاست دەکەیت ، ئای خوایە گیان ، زۆر سوپاست دەکەم ،ئەوە بیرم چوو» لەبەرئەوە بوخچەکەمان دیسانە هەڵگرتەوەو و هاتینەدەرەوە هەستمان دەکرد نیوە مردوو بوین .

دوای ئەوەی هاتینە دەرەوە ژنەکەم گوتی «لەوەدەچێت کەس ئەم منداڵەی نەوێت» قسەکە وا لەدەمی هاتە دەرەوە ، وەک ئەوەی کەسێک بێت کەلوپەلێکی هێنابێتە بازار و پێی وا بێت بە زویی دەیفرۆشێت و ساغی دەکاتەوە، بەڵام ڕێک بە پێچەوانەوە کەسی دەست نەکەوێت لێی بکڕێت ، سەرلەنوێ بە خێرایی هەنگاوی دەنا ، وەها پێی لە زەویەکە گیردەکرد هەناسەی توند بوو بوو ، دەتگوت پێی ناکەوێتە سەر زەوی .

گەشتینە کڵێسای(پیازا سانتی ئەبوستولی ) کڵێساکە کرابۆوە ،هەر کە ژنەکەم چوە ژورەوە و بینی چەند فراوان و کراوە و پەنهانە یەکسەر چرپاندی «ئەمە ئەوەیە کە دەمانەوێت»

ڕۆشت و تەواو سوور داگەڕابوو ، بەرەو سوچێکی لاتەنیشت ڕۆشت و منداڵەکەی لەسەر یەکێک لە کورسیەکان دانا و بە خێرایی بێئەوەی نوێژێکی کورت یان تەنانەت ناوچەوانی منداڵەکەش ماچ بکات ، وەکو ئەوەی زەوی لە ژێر پێیەکانیدا ئاگری گرتبێت بەرەو دەرگای دەرەوە بە خێرایی ملی نا ، بەڵام هەر لەگەڵ چەند هەنگاوێکی هەڵهێنا ، لە پڕ کڵێساکە بە دەنگی گریانێکی بەکوڵ هاتە لەرزین ، وادیارە کاتی شیرپێدانی منداڵەکە بوو

، لەبەرئەوەش  منداڵێک بوو ڕێک وەخت وسەعاتی خۆی باش دەزانی ، لەبەر برسێتی دەستی کردبوە گریان ، ئا لەو دەقیقەیەدا ژنەکەم لەوەدەچوو عەقڵی لەدەست دابێت ، یەکەمجار ڕوەو دەرگای دەرەوە ڕایدەکرد ، ئینجا ئاوڕی دایەوە و هێشتا هەر ڕایدەکرد .

لەسەر یەکێک لە کورسیەکان دانیشت وبێ بیرکردنەوە قۆپچەی کراسەکەی ترازان بۆ ئەوەی مەمکی بداتێ ، هەر کە مەمکی دەرهێنا ، ساواکە وەک گورگی هار پەلاماری دا ، دەستی کردە شیرخواردن ، بەهەردوو دەستی مەمکەکانی توند گرتبوون و لە گریان کەوت .

بەڵام هەر هێندەی نەبرد گوێمان لە یەکێکیان بوو هاواری دەکردە سەر ژنەکەم «نابێت شتی وابکەیت لەم شوێنە ، بڕۆدەرەوە لێرە ، بڕۆ سەرجادەکە» ئەوە دەنگی سەرپەرشتی کەری ژوری پیرۆزیەکان بوو ، پیاوێکی پیر بە لەشولارێکی بچوکەوە ڕیشێکی سپی بە چەناگەیدا هاتبوە خوارێ ، دەنگی لە چاو لەشولاریدا زۆر گەورە بوو ، ژنەکەم هەستایە سەرپێ ،چەندێ توانی سنگی خۆی وسەری منداڵەکەی داپۆشی ئینجا گوتی:

« بەڵام خۆت دەزانیت پاکیزەش منداڵەکەی لەباوەشگرتوە وەک چۆن لەو هەموو وێنانەدا دیارە» کابرا زۆر بە توڕەیی وەڵامی دایەوە:

«جا تۆ خۆت بە پاکیزە دەشوبهێنیت ئەی ژنی بێ ئەسڵ و فەسڵ»

چاکە ، ئەو کڵێسایەشمان بە جێهێشت وچوینە ناو باخی(پیازیا ڤێنیسیا) دانیشتین ، لەوێ ژنەکەم هەردوو مەمکی دایە منداڵەکە تا تێری خوارد ئیتر خەوی لێکەوتەوە .

ئێوارە داهاتبو ، ئیتر کڵێساکان دەرگاکانیان دادەخست ، ماندویی و شپرزەیی بڕستیان لێبڕیبوین ، هیچ بیرۆکەیەک لە هەگبەکەماندا نەمابوو تابیر لە جێبەجێکردنی بکەینەوە ، هەستم بە نائومێدیەکی زۆر دەکرد، وەختێک بیرم لەو هەموو شتە دەکردەوە کە بەسەرماندا هات ، لەوەی کە ئێمە خەریکی کارێکین نەدەبو هەرگیز بیکەین لەبەرئەوە بە ژنەکەمم گوت: « گوێ بگرە ، زۆر دواکەوتین و من ناتوانم ئاوا بەردەوام بم ، دەبێت بڕیارێک بدەین »

بە هەندێک بێزاریەوە وەڵامی دایەوە: « بەڵام خۆ ئەوە گۆشت و خوێنی خۆتە ، دەبێت لە هەر کوێ بۆمان هەڵکەوت جێی بێڵین ، لە هەر سوچێکدا وەکو چۆن خەڵکی تۆپەڵێک ناوسک فڕی دەدات پشیلە بیخوات ؟» گوتم: « نا ، وا ناڵێم ، بەڵام هەندێک شت هەیە مرۆڤ دەبێت یەکسەر و بێ بیرکردنەوە بیکات و تەواو، ئەگینا هەرگیز دەستی تێناچێت»

ئەویش وەڵامی دایەوە « ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە تۆ دەترسیت لەوەی من ڕای خۆم بگۆڕم و بیگەڕێنمەوە ماڵەوە ، بەڵێ ، ئێوەی پیاوان هەمووتان ترسنۆکن»

تێگەیشتم کە بەهیچ شیوەیەک لەم کاتەدا چەندوچونی لەگەڵ نەکەم ، لەبەرئەوە بە زمانێکی نەرم پێمگوت : « توڕە مەبە ، من لە هەستی تۆ تێدەگەم ، بەڵام بیرت نەچێت هەرچیەکی لێبێت لەوە باشترە لە ( توورمارئانشیۆ) گەورە بێت، لە تاقە ژورێکدا کە ئاودەست و چێشتخانەی تیا نیە ، ژورێک زستانان پڕە لە مارومێروو و لەهاوینیشدا مێشو مەگەز»

بێدەنگ بوو و وەڵامی نەدایەوە .

دەستمان کردەوە بە ڕۆشتن بێئەوەی بزانین بەرەو

کوێوە دەڕۆین ، شەقامێکی تەسک و بچوکم بینی لە خوارمانەوە ، بە تـەواوی چۆڵ و هۆڵ بوو لەم شەقامە جیادەبۆوە کە بەسەریدا دەڕۆشتین ، ئۆتۆمۆبیلێکی خۆڵەمێشم بینی لە بەردەم یەکێک لە دەرگاکاندا وەستابوو ، یەکسەر بیرێک بە مێشکمدا هـات ،چومە لای ئۆتۆمۆبیلەکە ،دەسـتـم دایە دەرگاکەی کرایەوە ،بە ژنەکەمم گوت : «خێراکە ، ئەمە فرسەتی ئێمەیە ، لەسەر کورسیەکەی دواوە داینێ» ئەویش وایکرد ، منداڵەکەی لەسەر کورسیەکەی دواوە دانا و دەرگاکەی داخست ، لە چاوتروکانێکدا ئەوەمان کرد بێئەوەی کەس هەستمان پێ بکات ،ئینجا قۆڵیم گرت و بەرەو (پیازا دیکوری ) بە پەلە ڕێگامان گرتە بەر.

مەیدانەکە چۆڵ ونیمچە تاریکیش بوو ، تەنها چەند چرایەکی خـوارەوەی بیناکان دەسوتان ،باقی چراکانی تر کوژابونەوە ،ڕۆما لە خوارمانەوە ، لە خوار شوراکەوە دەبریقایەوە ،ژنەکەم بەرەو نافورەکە ڕۆشت و لەسەر یەکێک لەو کورسیانەی لەوێدا بوو دانیشت ،پشتی کردە من و یەکسەر دایە پرمەی گریان ، پێمگوت : «ئەرێ ئێستا چیتە؟ » ئەویش گوتی« هەست دەکەم زۆر بیری دەکەم دوای ئەوەی لەوێدا جێمهێشت ،هەست دەکەم زۆر بیری دەکەم ، هەست دەکەم شتێکم لەوێدا وون کردوە ، خۆی بە سنگمەوە نوساندبوو»

هەوڵم دا هێوری بکەمەوە بۆیە گوتم : « بێگومان وایـە ، بەڵام ماوەیەکی تر ڕادێیت « شانی هەڵتەکاند و بەردەوام بوو لە گریان .

لە پڕێکا فرمێسکەکانی ووشک کردەوە ،وەکو چۆن ئاوی باران بە هەڵکردنی ڕەشەبا لەسەر شەقامەکە ووشک دەبێتەوە ، لە شوێنەکەی خۆی ڕاست بۆوە و تورەیی لێدەباری ، پەنجەی بۆ یەکێک لەو بینایانە ڕاکێشا کە بەسەر مەیدانەکەدا دەیڕوانی : «هەر ئێستا دەچم بۆ ئەوێ و داوای بینینی پاشا دەکەم و هەموو شتێکی تێدەگەیەنم .»

توند قۆڵیم گرت و بەسەریدا قیژانم : « ئا ڕاوەستە ،تۆ شێت بویت ، نازانیت کوا ئێستا پاشا ماوە »

گوتی : « گرنگ نیە بەلامەوە ، لەگەڵ ئەو کەسە قسە دەکەم کە هاتۆتە جێگای ئەو»

بە ڕاکردن بەرەو دەروازەی کۆشکەکە تێیتەقاند ، هەر خوا بۆخۆی دەزانێت کە ڕەنگە چی ڕویدابا ئەگەر لە ساتەوەختێکی نائومێدیدا پێمنەگوتبا : «باشە ،گوێم لێبگرە ، من جارێکی تر بیرم لەم شتە کردەوە ، وەرە بچینەوە لای ئۆتۆمبیلەکە و منداڵەکە بهێنینەوە ، مەبەستم خۆمان بەخێوی کەین ، فەرقی چیە ، خۆ منداڵیکە وەکو ئەوانی تر »

ئەم قسەیە خاڵی یەکلایی کەرەوە بوو کە ئیتر ئەم بیرۆکەیە بەسەر بیرۆکەی بینینی پاشادا زاڵ بوو ،وەختێک بەرەو ئەو شەقامە بچوکەی ئۆتۆمبیلە خۆڵەمیشیەکەی لێوەستابوو بەپەلە دەڕۆیشت ، گوتی : « تۆ بڵێی هێشتا هەر لەوێدا مابێت » وەڵامم دایەوە : « بێگومان هەر لەوێیە ، خۆ هەمووی پێنج خولەکی بەسەردا تێپەڕیوە »

هەر بەوجۆرە بو ،هێشتا ئۆتۆمبیلەکە لە جێگای خۆیدا بوو، بەڵام ئا لەوساتەوەختەی کە ژنەکەم دەرگاکەی کـردەوە ، پیاوێکی کورتەباڵا کە پێدەچوو لە ناوەڕاستەکانی تەمەنیدا بێت ، پیاوێک سەروسیمای لە کابرایەکی گرنگ دەچو لە دەرگای ماڵەکە هاتە دەرەوە ، هاواری لە ژنەکەم کرد :« ئا ڕاوەستە ... ڕاوەستە چیدەکەی لە ئۆتۆمبیلەکەم ؟» ژنەکەم بێئەوەی هەر تەماشاشی بکات لە

کاتێکدا دانەوییبۆوە تا قوماتەکە لەسەر کورسیەکە هەڵگرێت  وەڵامی کابرای دایەوە  :
«هەر ئەوەم دەوێت کە هی خۆمە »
بەڵام پیاوەکە دیسان جەختی کردەوە :»بەڵام چیت هەیە لەوێدا ، ئەوە ئۆتۆمبیلی منە ؟ تێدەگەیت ؟ ئۆتۆمبیلی من!»
خۆزگە  لـەو کاتەدا ژنەکەمت دەبینی ، خۆی ڕاپسکان و بەرەو کابرا  ڕۆشت وهاواری دەکرد: « کێ هیچی  تۆی بردوە ، مەترسە ، کەس لێرە نیە شت لە تۆ بەرێت ،بەڵام ئۆتۆمبیلەکەت ، ئەوە من تفی تێدەکەم .. سەیر کە »
هەربەڕاستی تفێکی  کردە دەرگای ئۆتۆمبیلەکە ، پیاوەکەش  بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە گوتی :»بەڵام ئەو تۆپەڵە پێچراوەیە چیە !»
ژنەکەم بە توندی وەڵامی دایەوە : « تۆپەڵ نیە ، ئەوە منداڵی  منە ،دەتوانیت ببینیت ئەگەر دەتەوێت .»
ڕوخساری منداڵەکەی دەرخست تا پیاوەکە ببینیت ، بەردەوام بوو لە قسەکردن گوتی:» بەحەیاتی  تۆ و ژنەکەت منداڵی وا جوان ناخەنەوە ئەگەر  سەرلەنوێ لە دایکیش ببنەوە ، نزیک  نەکەویتەوە لێم ، ئەگینا هەر ئێستا هاواری پۆلیس دەکەم  و پێیان دەڵێم کە تۆ هەوڵت داوە منداڵەکەم لێ بدزیت .»
ئینجا دەستی کرد بە جنێودان و هەڕەشەکردن، پیاوە  داماوەکە خەریک بوو لە هۆش خۆی بچێت و بکەوێتەسەرزەوی ، کابرا  دەمی داپچڕیبو  ، سوور بوبۆوە  ، لە کۆتایدا بە هەنگاوی هێمن و لەسەرخۆ کەوتەوە ڕۆشتن تا لە سووچی شەقامەکەدا گەیشتەوە بە من..

سەرچاوە:
http://www.al-maseera.com/201210//Alberto-Moravia.html

# چەند شیعرێکی واڵت ویتمان

و. لە ئینگلیزییەوە: ئازاد بەرزنجی

واڵــت ویتمان (Walt Whitman)، شاعیری گــەورە و ئازادیخوازی ئەمریکایی کە بە باوکی شیعری نوێی ئەمریکایی دەژمێردرێ؛ لە ساڵی ١٨١٩ دا هاتۆتە دونیاوە. لە سەرەتای ژیانیدا لە چاپخانە کاری کردووە و خوێنەرێکی باش بووە، هەر لە ئینجیل و شەکسپیر و هۆمیرۆسەوە تا شاعیرانی هیندستان و ئەڵمانیا و دانتێ و بێگومان ئەم خوێندنەوانەشی کاریگەرییان لەسەر دونیای شیعری هەبووە.

هەروەها ویتمان بە چالاکیی سیاسیشەوە خەریک بووە و لە بنیاتنەرانی دیموکراسیی ئەمریکایی بووە.

ماوەیەک سەرنووسەری گۆڤاری «برۆکلین ئیگڵ»بووە کە ئۆرگانی پارتی دیموکرات بووە لە ئەمریکادا و تیایدا هێرشی توندی کردۆتە سەر فاشیزم و دیکتاتۆری و هەموو جۆرەکانی دەمارگیری و بەرگرییەکی سەختی لە دیموکراسی کردووە.

ویتمان باوەڕی بە ئازادیی تاکەکەس هەبووە و ئەو ئازادییەشی لە خۆشەویستیدا بینیوەتەوە. ئەو خۆشەویستی و دیموکراسیشی پێکەوە گرێداوە.

واڵت ویتمان جگە لە دیوانە بەناوبانگەکەی، واتە (پەلکەگیا)، کۆمەڵێک کتێبی تریشی نووسیوە.

ساڵی ١٨٩٢ لە شاری «نیو جیرسی» کۆچی دوایی کردووە.

# ماڵئاوا ئەی خەیاڵم



ماڵئاوا، ئەی خەیاڵم!
ماڵئاوا، ئەی هاودەمم، ئەی خۆشەویستیی شیرینم
من ئەڕۆم، بۆکوێ، نازانم.
یان بەرەو چ چارەنووسێ، ناشزانم ئاخۆ جارێ دی
دەتبینمەوە!
کەواتە ماڵئاوا، ئەی خەیاڵم

ئێستا لێگەڕێ با بۆ دواجار و بۆ تاوێ
ئاوڕێ لە دواوە بدەمەوە
سەعاتەکەی ناو دەروونم هێواشتر و لاوازترە
ڕۆیشتن، و کەوتنی شەوانە، و پاشان وەستانی ترپەی دڵ

لەمێژە ئێمە پێکەوەین، خۆشیمان دی، نازی یەکتریمان ڕاگرت
شادمان بووین- ئێستاش دابڕان بەڕێوەیە- ماڵئاوا، ئەی خەیاڵم

وێڕای ئەوەش، لێمگەڕێ با پەلەنەکەم
ئێمە زۆر پێکەوە ژیاین، خەوتین، یەکمان لەئامێزگرت و
هەر بەڕاستی یەکێک بووین
بۆیە گەر بمرین، پێکەوە ئەمرین (بەڵێ، ئەوساش هەر پێکەوە ئەبین)
گەر بۆ جێیەک بچین هەر پێکەوە ئەچین تا ڕووبەڕووی ئەو شتە بینەوە
کە ڕووئەدا
لەوانەیە باشتر و شادمانتربین و
شتێک فێربین
لەوانەیە ئەوە تۆ بیت کە من بەرەو سترانە ڕاستەقینەکان
ئەبەی (کێ ئەزانێ؟)
لەوانەیە ئەوەی دەسکی دەرگای دونیای فانی ئەکاتەوە
تۆ بیت
کەواتە دواجار هەر ئەبێ بڵێم:
ماڵئاوا و ماڵت ئاوا
ئەی خەیاڵم.

## تۆ.. ئەی ئەو ژنەی گەلێ جار
## بە بێدەنگی دێمەلات

تۆ.. ئەی ئەو ژنەی گەلێ جار
بە بێدەنگی دێمەلات
تا لەگەڵتابم...
وەختێ شان بە شانت ئەڕۆم
یان لە پاڵتا دائەنیشم
یان پێکەوەین لە ژوورێکا
تۆ نازانیت
چ ئاگرێک هێور هێور
لە ناخمدا
لە پێناوی تۆی ئازیزا
توند توند من ئەهێنێ و ئەبا



## نیوەشەوێکی ساماڵ

ئەی ڕۆح ئێستا کاتی تۆیە
کاتی فڕینی ئازادت
بەو شتانەدا کە بەدەرن لە وشەکان
دوور لە کتێب
دوور لە هونەر

ڕۆژ ئاوابوو
وانەش تەواو

تۆش وا بە بێدەنگ هەڵئەسی
نیگا ئەکەی

لەو شتانە ڕائەمێنی کە خۆشتئەوێن:
شەو و
ڕاکشان و
مەرگ و
ئەستێرە.



## نوقمی بیرکردنەوە

«دوای خوێندنەوەی هیگڵ»
نوقمی ڕامان بووم لە گەردوون
شتێکی بچووکم بینی لە «چاکە»
سەقامگیرانە، هێدی هێدی
بەرەو نەمری هەنگاوی ئەنا.
زۆریشم دی لە «خراپە»
بە هەڵەداوان ڕێی تەی ئەکرد
ون ئەبوو
نەدەما و ئەمرد.

## نووسینی سەر کێلە قەبرێ

ئەی ئەو کەسەی، لەناو ئەم گۆڕەدا نوستووی
چ دووعایەکت بۆ بکەین؟
چ لەوحێک و نووسینێکت بۆ هەڵواسین، ئەی ملیۆنێر؟
ئێمە نازانین چۆن ژیایت
ئەوەندە ئەزانین عومرت
لە سەودا و مامەڵە و ناو دەڵاڵەکاندا بەسەربرد
نە قارەمانییەکت جێهێشت، نە نەبەردێک و، نە فەخرێ.



# دانیشتووم و ئەڕوانم

دانیشتووم و ئەڕوانمە گشتە غەمەکانی دونیا و
گشت زوڵم و ڕیسواییەکان
دەنگی گریانی پەنهانی شپرزەی لاوانێک ئەژنەوم
کە ئەشکەنجە ئەچێژن و لە کردەی خۆ پەشیمانن
لەنێو کەمدەستەکانیشدا، دایکێ ئەبینم
کە بە دەست ستەمی مناڵەکانیەوە ئەتلێتەوە،
فەرامۆش کراوە، لاواز و داڵەگۆشت بووە،
وا خەریکە گیان ئەسپێرێ
ژنێ ئەبینم ستەمدیدەی دەست مێردەکەیەتی
پیاوێ ئەبینم کچانی لاو فریوئەدا و غەدریان لێ ئەکا
گرێکانی ئیرەیی و عیشقی ناکام ئەبینم کە هەوڵی شاردنەوەیان ئەدرێن
ئەم دیمەنانە لەسەر ڕووی زەوی ئەبینم
ئاسەواری شەڕ و ئافات و بێدادی ئەبینم،
شەهیدان و زیندانییان ئەبینم
قاتوقڕیی نێو دەریا ئەبینم، ئەو دەریاوانانەی کە تیروپشک ئەکەن
تا لەپێناوی مانەوەی ئەوانی تردا
یەکێک بکەنە قوربانی
ئەو سووکی و ڕیسواییانە ئەبینم کە کەسانی لەخۆبایی
بەسەر خەڵکی زەحمەتکێش و نەدار و ڕەشپێست و هاوچەشنانیاندا ئەهێنن
دانیشتووم و لە هەموو ئەمانە — گشت ئەم دزێوی ومەینەتییە
بێکۆتاییانە — ئەڕوانم
ئەیانبینم و ئەیانبیستم و خامۆشم.

# ئەی کەشتییەوان، کەشتییەوانەکەم



ئەی کەشتییەوان، کەشتییەوانەکەم! گەشتە ترسناکەکەمان کۆتایی هات
کەشتییەکە نەهامەتییەکانی تێپەڕاند و ئێمەیش بە ئاکام گەیشتین
بەندەرەکە نزیکە، گوێم لە دەنگی زەنگەکانە، خەڵکی هەموو نوقمی شادین
لەکاتێکا گشت چاوەکان، نیگای سەری کەشتییەکە ئەکەن
چەند قایمە و سەرسەختانە بەرەو پێشەوە مل ئەنێ!
بەڵام ئاخ دڵی من، دڵی من، دڵی من
ئاخ، ئەی ئەو دڵۆپە سوورە ڕژاوانەی
کەوتوونەتە سەر تەختی کەشتییەکە
سەر ئەو جێیەی کەشتییەوانەکەم تیایدا
سارد و بێ گیان ڕاکشاوە.
ئەی کەشتییەوان! کەشتییەوانەکەم! هەڵسە و گوێ بۆ دەنگی زەنگەکان ڕادێرە

هەڵسە- بۆ تۆیە وا ئاڵا هەڵئەدرێ-
بۆ تۆیە شەیپوور لێئەدرێ
ئەو چەپکەگوڵ و تاجەگوڵینانە بۆ تۆیە
ئەو ئاپۆرەی کەنار دەریایە بۆ تۆیە
ئەو حەشاماتە بێئۆقرەیە تۆ بانگ ئەکەن و
ڕوخساری تامەزرۆیان ڕووڵەتۆیە
ئەی کەشتییەوان! ئەی باوکە ئازیزەکە
با باسکم بالیفی سەرت بێت
ئەمە خەونە و هیچی تر نا
وا ئەتبینم، سارد و مردوو
لەسەر دەفەی ئەم کەشتییە وا پاڵکەوتووی

کەشتییەوانەکەم بێ وەڵامە
لێوانی زەردهەڵگەڕاون و بێ جووڵەیە
باوکم هەست بە باسکم ناکا
بێ ترپەیە و بێ ئیرادە



کەشتییەکە بە سەلامەتی لەنگەری دا و
دەنگی لێ بەرز بووەوە
کۆتایی بە گەشتی هێنا
کەشتیی سەرفراز
لە سەفەری پڕترسی وا گەڕایەوە
ئەی ڕۆخەکان شادمان بن
ئەی زەنگەکان، بێنە دەنگ!
وەلێ من
بە دڵی پڕ ماتەمەوە
بەسەر تەختی کەشتییەکەدا دێم و دەچم
سەر ئەو جێیەی
کەشتییەوانەکەم تیایدا
سارد و بێ گیان، ڕاکشاوە.

## بۆ غەریبێ

ئەی ڕێبوارە غەریبەکە
تۆ نازانیت من چەند تامەزرۆی دیدارتم
تۆ ئەو پیاوەی یا ئەو ژنەی کە من بەدواتا ئەگەڕێم
(ئەمە وەک خەونێک دێتە لام)
بێ دوودڵی، من ڕۆژێک لە ڕۆژان
ژیانێکی شادمانم لەگەڵ تۆدا بردۆتەسەر
هەمووشتێکم دێتەوە یاد
کاتێ بەلای یەکتریدا گوزەر ئەکەین
بە ڕۆحسووکی، بە دڵنەرمی، بە پاکژی و پێگەیشتوویی.
تۆ لەگەڵ مندا گەورەبوویت
کوڕ بوویت یاخود کچۆڵە
لەگەڵ تۆدا من خواردوومە و
لەگەڵ تۆدا من خەوتووم

چیتر جەستەت
هەر بەتەنها هی خۆت نییە
جەستەی منیش
هەر بەتەنها هی خۆم نییە
تۆ ئۆخژنی چاو و ڕوخسار و هی پێستی بەدەنی خۆت
بە من ئەدەی
لەبری ئەوەش
ڕیش و سینە و دەستەکانم بۆ خۆت ئەبەی
من لەگەڵتا ناکەومە دوو
من بیرت لێ ئەکەمەوە
وەختێ تەنیا دائەنیشم
یاخود شەوێک
بەتەنیا لە خەو هەڵئەسم
هەر ئەبێ چاوەڕوانی بم
دوودڵ نیم لەوەی جارێ تر
هەر ئەتبینم
من نامەوێ لە دەستت بدەم.



## جارێکیان بە شارێکی جەنجاڵدا گوزەرم کرد

جارێکیان بە شارێکی جەنجاڵدا گوزەرم کرد
لە پێناوی پاشەڕۆژا
وێنەی پێشانگا و ساختومان و دابونەریتەکانی
لە مێشکمدا چەسپاند
وەلێ ئێستا من لەو شارە
هیچم بیرناکەوێتەوە
ژنێ نەبێ
کە بەڕێکەوت یەکمان بینی و خۆشیویستم

ڕۆژ بە ڕۆژ و
شەو بە شەو
لەگەڵ یەکدا بووین
هەر بۆیە جگە لەو من
هیچی ترم یاد نەماوە
ئەڵێم جگە لەو ژنەی کە
بە شەوقەوە عەودالم بوو
هیچی ترم یاد نەماوە
دووبارە پێکەوە ئەگەڕێین
دڵداری ئەکەین و
لەیەک جودا ئەبینەوە.
جارێکی تر دەستم ئەگرێ، نابێ بڕۆم
وا لە پەنامدا
لێوەکانیشی بێدەنگ و
غەم لێنیشتوو و
هەڵلەرزیون.



## بۆ پەرێ

من لە تۆدا ئەو ڕێژگەیە بەدی ئەکەم
کە تابێ بەرینتر ئەبێ و
باڵایانە پەرش ئەبێ
وەختێ تێکەڵ
بە دەریای گەورە و مەزن ئەبێ

## بۆ سۆزانییەکی ڕەمەکی



لەسەرخۆبە
لەگەڵ منا ئاسوودە بە
من واڵت ویتمانم
وەکو سروشت ئازاد و پڕ لە ئارەزووم
کەی خۆر دەسبەرداری تۆ بوو
هەنگینێ منیش دەسبەردارت ئەبم
کەی ئاو وەستا
هەنگینێ وشەکانیشم
لە درەوشانەوە و
وژەوژی خۆیان بۆ تۆ ئەوەستن.

## بۆ تۆ

ئەی غەریبەکە
کاتێ بەلامدا ئەگوزەری و
ئەتەوێ لەگەڵما بدوێی
بۆچی لەگەڵمدا نادوێی؟
بۆچی لەگەڵتدا نەدوێم؟

سەرچاوە:
Walt Whitman, Leaves of Grass, Oxford, New York, 1990

## مران ٥ ژوین ١٩٢٠ شەممە

بەردەوام ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم تۆبڵێی تۆ لەوە گەیشتبیت کە بەهۆی چوارچێوەی بیرکردنەوەی منەوە دەبێت بەناچاری وەڵامەکانم ئەوەبن کە ئێستا هەن. بەڵێ وەڵامێکە لەڕادەبەدەر لەسەرخۆ، لـەڕادەبـەدەر فریودەرانە و، تەبا و خۆنواندنیشی تیابێت (بەناچاریی وابوو) هەمووکاتێک، شەووڕۆژ لە وەڵامدانەوەی تۆدا لەرزم لێ دێت و ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم. نائومێدانە ئەم پرسیارە بەجۆرێک لە خۆم دەکەم کە وادەزانیت بۆ ماوەی هەفتەیەکی تەواو، بێ ئەوەی هیچ شەوێکی لێ ببوێریت، فەرمانم پێ دەکرێت مێخێک بە بەردێکدا دابکوتم، کە لەیەک کاتدا هەم چەکوش وەشێنەکەم و هەم خودی مێخەکە. میلنا! ئەوە پڕوپاگەندەیە، باوەڕناکەم ئەمشەو بەهۆی مان گرتنەوە پەیوەندیی ڕێگای ئاسن لەگەڵ تیرولدا ببڕێت.

– ف–

## مران ٥ ژوین ١٩٢٠

نامەکەت گەیشت. پیرۆزباییت لێ دەکەم. زیاد لە هەرشتێکی ئەم نامەیە ئەوەیە کە ڕەنگە لەمەودوا کاتێک من لە پراگ بم نەتوانیت نامەم بۆ بنووسیت.

پێش هەرشتێک دەمەوێت جەخت لەوە بکەم بۆ ئەوەی هەموو دنیا، لەوانە خۆیشت میلنا، شتەکان لە یەکتری جیابکەنەوە. کەواتە لەوەدەچێت یەکێک هەڕەشە لە یەکێکی تر بکات، هەڕەشەکەرەکە هەر هیچ نەبێت دوراودوور لە هۆکاری هەڕەشەکە ئاگادارە و کەچی وا خۆی دەربخات کە هیچ پەیوەندیەکی بەوەوە نیە.

ڕەنگە تۆ لەسەر هەق بیت کە ئیتر نامەم بۆ نەنووسیت. لە نامەکەتدا چەند شتێک هەیە بەڵگەی ئەو ڕاستیەن. من ناتوانم دژی ئەو شتانە هیچ بڵێم. بەڕاستییش ئەوانە هەمان ئەو مەسەلانەن کە من بە وردی دەیانزانم و زۆر بە جیدیی دەست نیشانیان دەکەم. لەو چوارچێوەیەشدا من زۆر دەزانم. بەڵام هەر لەبەر ئەوەی هەوا لەوێ ئەوەندە کەم دەبێتەوە ناتوانم هەناسە بدەم و دەبێت بحەسێمەوە. سبەی نامەت بۆ دەنووسم.

– ف–

## مران ١٣ ژوین ١٩٢٠ یەک شەممە

دەمەوێت ئەمڕۆ شتێک بڵێم لەوانەیە چەند شتێکی تر ڕوون بکاتەوە، میلنا (ئای چ ناوێکی دەوڵەمەند و گرانە! تەنانەت لەوە گرانترە بتوانیت بەرزی بکەیتەوە. لەسەرەتادا زۆر حەزم بەو ناوە نەدەکرد. وەک ڕۆمیەک یان یونانیەکم دەهاتە بەرچاو کە لە بوهێمیادا گیری خواردبێت و کەوتبێتە ژێر زۆر و ستەمی چیکەکانەوە. هێزی دەنگەکەی فریودەرە. لە ڕووی شێوە و ڕەنگەوە سەیر ئەوەیە کە ژنێکە. ژنێک کە دەتوانیت لە دنیا، لە ئاگر، –نازانم لە کامیان– هەڵیبژێریت و لە ئامیزی بگریت و ئەوییش بە ویست و دڵنیاییەوە خۆی بە ئامێزتەوە بقرسێنێت. ئەم دەنگی (ئای)ە باش نیە، ئاخۆ ئەم ناوە لە کۆڵتان نابێتەوە؟ یان لەوانەیە خۆت بە خۆشی و شادیەوە بارەکە لەسەر شانت لابدەیت؟

تۆ دوو جۆرە نامە دەنووسیت، مەبەستم ئەوە نیە بە قەڵەم دەنووسیت یان بە مەرەکەب. هەرچەندە بە قەڵەم نووسین زۆر شت دەگەیەنێت و هۆکارە بۆئەوەی خوێنەر بە پەرۆشەوە دوای بکەوێت. بەڵام بەڕاستیی ئەم جیاوازیە یەکلایی کەرەوە نیە. بۆ نموونە دوا نامەت بە نەخشەی ئاپارتمانەکەوە، ئەگەرچی بە

قەڵەم نووسیبووت بەڵام دڵخۆشی کردم. میلنا ئەوەی دڵخۆشم دەکات ئەو نامانەن کە ئارامیی و ئاسوودەییم پێ دەبەخشن. (میلنا، ئەوە بزانە کە من تەمەنم چەند ساڵە، دەرکی بێ تواناییم بکە. لە هەمووی گرنگتر ترس و بێزاریی من و گەنجیی خۆتە. هەست بە تەڕوبڕی و بوێریی خۆیشت بکە. دەزانیت بێزاریی من روو لە زیادیە، لەبەرئەوەی لە دنیا دواکەوتووم. لەلایەک گوشارم زۆر لەسەرە و لەلایەکی ترەوە گەلێک بێزارم. لەم لایشەوە بوێریی تۆ واتا پێشڕەویی کردن، واتا کەم بوونەوەی گوشار و باڵ گرتنی ئازایەتی)

من لەپاڵ نامەکاندا دادەنیشم و شادمانیم لەڕادەبەدەرە. نامەکان وەک باران وان بەسەر ئاگردا ببارێن. لێ، میلنا کاتێک نامەکانی دی دەگەن، تەنانەت ئەگەر لەوانەی پێشوو چاکتریش بن (هەرچەندە من بەهۆی بێ



تواناییمەوە دوای چەندرۆژێک دەزانم کامەیان چاکە).
ئەو نامانەی بە هاوار و سەرسووڕمانەوە دەست پێ دەکەن (ئەگەرچی من زۆر دوورم) و نازانم بە چ ترسێکەوە کۆتاییان دێت. ئەوکاتە میلنا، دەڵێی لەژێر زەنگێکی سامناکدام و لەرزم لێ دێت، ناتوانم ئەو نامانە بخوێنمەوە و ناچارییشم بیان خوێنمەوە، تەواو وەک گیاندارێکی زۆر تینوو. هەروەها بە ترسێکی زۆر گەورەوە بەدوای قەنەفەیەکدا دەگەڕێم خۆمی لەژێردا بشارمەوە. هەڵدەلەرزم و بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت لەو سووچەدا دەستی نزا بەرزدەکەمەوە نەکا تۆ، وەک چۆن بە شێوازی نامەکەت هێرشت هێناوە و هاتوویتە ژوورەوە هەر ئاواییش لە پەنجەرەکەوە باڵ بەیەکدا بدەیت و بفڕیت. من ئیدی بەرگەی ئەو زریانە ناگرم کە هەموو ژوورەکەمی داگیرکردوە. بۆ ئەم جۆرە نامانە دەبێت تۆ سەرێکی شکۆمەندانەی وەک سەری میدۆزات هەبێت، چونکە مارە ترسناکەکان بە دەوری سەرتا فیشکەفیشکیانە، لەڕاستیا مارە بێزارکەرەکانیش ترسناکتر لەوانەی تۆ بە دەوری سەرمدا فیشکەیان دێت.

ئەو نامەیەی چوارشەممە نووسیبووت ڕۆژی پێنج شەممە پێم گەیشت. هۆ منداڵ، هۆ منداڵە گچکەکە (ئەوە منم هەر بەم شێوازە لەگەڵ میدۆزادا دەدوێم) پێ دەچێت تۆ هەموو گەمە گەوجەکانی من (دەربارەی Zid nechapo) بە جیدیی وەربگریت. بەهەرحاڵ من دەمویست کەمێک بتخەمە پێکەنین. بەدحاڵی بوونی نێوان من و تۆ لە ئەنجامی ترسێکی زۆرەوەیە. تکات لێ دەکەم ناچارم مەکە بە زمانی چیکی نامەت بۆ بنووسم. ئەو نامەیەی من سەرکۆنەکردنی تیا نەبوو. دەبوو من سەرزەنشتی ئەوەت بکەم کە دیدێکی گەلێک جوانت بەرانبەر بەو جوولەکانە هەیە کە دەیانناسیت (لەوانە خۆیشم) جوولەکەی تریش هەن! هەندێک جار حەزدەکەم هەموو ئەو جوولەکانە، بەخۆیشمەوە، فڕێ بدەمە ناو کەنتۆری جلەکانەوە. ماوەیەک بوەستم و پاشان دەرگای کەنتۆرەکە بکەمەوە بۆئەوەی بزانم هەموویان خنکاون یان نا، ئەگەر خنکابن جارێکی تر دەرگای کەنتۆرەکە دابخەمەوە و لەسەر ئەم کارە هەر بەردەوام بم.

ئەوەی لەبارەی وتاربێژییەکەتەوە وتم زۆر بەڕاستم بوو. (ئەم جەنابی ئیرنستە زۆر خۆی هەڵدەقورتێنێتە نامەی نێوان من و تۆوە) ڕەنگە منییش نادادپەروەریی لەگەڵدا بکەم (نازانم لەم بارەیەوە چی بڵێم) نادادپەروەرییەکی ترسناکییش. بەڵام ئەو هەستەی من و تۆ بەوەوە دەبەستێتەوە زۆرە و تابێت پتەوتریش دەبێت. بەکورتی وتم: خۆزگا بمتوانیایە دەربارەی ژیان و مردن قسەم لەگەڵدا بکردایە! لێ من لێی دەترسم، ئەو زۆر لە من چاکترە. دەزانیت میلنا، کە تۆ چوویت بۆلای ئەو هەنگاوێکی گەورەت نا کە تۆی لە ئاستی خۆت هێنایە خوارێ. لێ ئەگەر بێیت بۆلای من ئەوە یەکسەر دەکەویتە ناو چاڵەکەوە. ئاخۆ ئاگات لەمە هەیە؟ نا، لەو نامەیەدا من مەزن نەبووم بەڵکوو تۆ بوویت) دەمویست لەبارەی وتاربێژییەوە بدوێم، بەلای تۆیشەوە هەر جیدیی بوو. بڕوام وایە هەڵەی تیا نەکەم.

دیسان بیستوومە کە نەخۆشیت، میلنا، کاتێک ئەم نامەیە دەنووسم ڕەنگە تۆ ناچاربیت بڕۆیتە ناو جێگا، یان بەتەمای چوون بیت. یان ڕاکشابیت. ئایا مانگێک لەمەوبەر من پیاوێکی باشتر نەبووم. من دڵم لات بوو (ئەگەرچی ئەمە هەر لای خۆم بوو) دەمزانی تۆ نەخۆشیت. هەنووکە ماوەیەکە من تەنیا بیر لە نەخۆشی و چاکبوونەوەی خۆم دەکەمەوە. ئەگەرچی هیچیان پەیوەندیان بە تۆوە نیە.

ئەمڕۆ کەمێک پێش نەخۆش کەوتنم (هەروەها کەمێک دوای خەو لێ کەوتنم) خەوێکی نەفرەتیی، ئەگەرنەڵێم زۆر ترسناکم بینی. (باشبوو کاریگەرییەکەی زۆر نەمایەوە) ئەو خەوە قێزەونە، دەبوو بەڕاستیی لە باجی خەونێکی کورتا بیدەم. چونکە مرۆڤ کاتێک

لە خەوێکی وا هەڵدەسێت کە خەوەکە سووڕی خۆی تەواو کردبێت، پێش ئەوە ناتوانێت خۆی لە خەوێکی وا بدزێتەوە. خەو بە مەلاشووی مرۆڤەوە دەنووسێت.

لە ڤیەنا بووم. تارادەیەکی زۆر وەک خۆم لەکاتی گەیشتنمدا بۆ ئەوێ وێنام کردبوو (بەپێی خەیاڵ و وێنا کردنەکەم ڤیەنا تەنیا گۆڕەپانێکی بچووک و ئارامە، لایەکی ماڵەکەی تۆیە و لایەکەی تری ئەو ئوتێلەیە کە بڕیارە من تیادابەزم. لای چەپی وێستگەی شەمەندەفەری ویستە واتا ئەو شوێنەی لێی دادەبەزم. وێستگەی شەمەندەفەری فرانتز جوزیفیش ئەو شوێنەیە کە لەوێوە دەڕۆمە دەرێ. بەڵێ، لەپاڵ ساختمانەکەمدا ڕیستۆرانتێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەوکەسانەی ڕوەکین و منیش لەوێ نان دەخۆم. نەک بۆ خواردن بەڵکوو بۆئەوەی هەندێک بارقورسی بۆ پراگ بێنمەوە. بۆ ئەمە دەڵێم؟ لەڕاستیا ئەمە بەشێک نیە لە خەونی من، چونکە من تائێستا شیرزەی ئەو خەونەم) دەی. ڤیەنا هەرگیز وا دەرنەچوو کە وتم، بەڵکوو شارێکی گەورە و ڕاستیی بوو. سەرلەئێوارە بوو، دنیا تاریک و شێدار بوو. هەستم بە هاتوچۆیەکی سەیر دەکـرد. باخێکی میللی چوارگۆشە و درێژ کەوتبوە نێوان ئەو خانوەی من تیا نیشتەجێ بووم و خانوەکەی تۆوە.

لەپرێکدا و پێش ئەوەی نامەکانی منت پێ بگات من گەیشتبوومە ڤیەنا (ئەم مەسەلەیە دوایی زۆر ماندوی کردم) لەگەڵ ئەوەیشدا تۆ ئاگادارکرابوویت و وا بڕیار بوو بت بینم. خۆشبەختانە (ئەگەرچی لەوساتەدا هەستم بە گوناهـ دەکرد) من تەنیا نەبووم. وابزانم ئەوانەی لەوێ بوون میوانداریەکی گچکەیان سازدابوو منیش کچێکم لـەگـەڵـدابـوو. بـەڵام لە بارەیانەوە من چ وردەکاریەکم لەیاد نیە. وادەزانم بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەوان هاوڕێی من بوون. پێم خۆشبوو بێدەنگبن، بەڵام پێ دەچوو بەردەوام باس لە شتی تایبەتی من بکەن. من تەنیا گوێم لە هەرا و هوریای تاقەت پڕوکێنی ئەوان دەبوو هیچی لێ تێ نەدەگەیشتم، نەیشم دەویست تێی بگەم. من لای ڕاستی ماڵەکەمەوە لە کەنار شۆستەکە وەستام و تەماشای خانوەکەی تۆم دەکرد. بەڵەخانەیەکی نزم بوو. ژوورێکی میوانی جوان و سادەی لە بەرد دروستکراوی لە بەردەمدا بوو کە دەچووەوە سەر قاتی دوەم.

وا هەرئێستا کاتی خواردنی بەیانیە. مێزەکە لە ژووری میوان بوو. لە دوورەوە مێردەکەتم بینی هاتەژوورێ و لـەلای ڕاسـتـەوە لـەسـەر کورسیەک دانیشت. هێشتا خەواڵوو بوو، باڵی کردبووەوە و خۆی دەکێشایەوە. پاشان تۆ هاتیت و بەجۆرێک لە پشت مێزەکەوە دانیشتیت کە ڕێک بەرانبەر بە من بوویت. نەک بەوجۆرەی



هەموو لایەکی ڕووت دیاربێت، زۆر دوور بوویت. سیمای مێردەکەت گەلێک باشتر دیاربوو. نازانم بۆ، تۆ وەک شتێکی مەیلەو شین کە بە سپیدا بڕوانێت، وەک ڕۆحێک مابوویتەوە. تۆیش باڵت کردەوە بەڵام نەک بۆ حەسانەوە و خۆکێشانەوە. ئەمەیان بۆ تۆ زیاتر کارێک بوو بۆ خۆنواندن.

زۆری بەسەردا تێپەڕنەبوو- لێ هێشتا هەر ئێوارە وەختەکەی دوێنێ بوو. من و تۆ لەسەر شەقامەکە بەیەکەوە بووین. تۆ لەسەر شۆستەکە وەستابوویت. لەوکاتەدا من پێیەکم لە سەر شەقامەکە و دەستی تۆم گرتبوو. بە ڕستەی کورت کورت و خێرا قسەمان دەکرد، زیاتر لە ڕاز و گلەیی دەچوو. ئەم دیمەنە نزیکەی تا کۆتایی خەونەکانم بەردەوامبوو.

من ناتوانم هەمووی بەیاد بێنمەوە. تەنیا دوو ڕستەی سەرەتا و دوو ڕستەی کۆتاییم لەیادماوە. گفتوگۆی نێوان ئەو دوو بەشە ئازارێکی هێند ناخۆشە مەحاڵە باس بکرێت.

حاڵەتێک لەڕووی تێدا کاری تێ کردبووم، لەباتی سڵاو خێرا وتم: ((تۆ بەجۆرێکی تر وێنای منت لای خۆت کردبوو؟)) تۆ وەڵامت دایەوە کە: ((ڕاست و ڕەوان من وێنای تۆم واکردبوو کە مۆدەتر بیت)) (ئەگەر ڕاستت دەوێت فۆنەتێکی ئەو وشەیەی وتت لەمە ڤیەنانەتر بوو بەڵام من لەبیرم نەماوە)

ئەمە ئەو دوو ڕستەیەی یەکەمە کە وتم (من وام بیر لێ کردۆتەوە. ئایا تۆ دەتوانیت بەتەواوی ئەوەم بۆ بەرجەستە بکەیت کە من لە مۆزیکدا بەتەواویی بێ بەهرە و توانام، بەجۆرێک کە لە شوێنێکی تردا ئەو بێ بەهرەییە نەبینیت؟) لەڕاستیدا ئەم دوو ڕستەیە هەموو شتێکی یەکلایی کردەوە. لەمە زیاتر دەبێت چی بێت؟ بەڵام لەم بێنە و بەردەیەدا دەمەقاڵێیەک دروست بوو. لای تۆوە وشەگەلێکی هەرە نادیار و لای منەوە پرسیارە سەرکون کەرەکان.

لەم کاتەدا ئەوانەی دەوروبەرمان سەریان کێشایە ناو باسەکەوە. بەپێی بۆچوونەکان من بۆیە هاتبووم بۆ ڤیەنا تا سەردانی قوتابخانەیەکی کشتوکاڵی بکەم کە لە دەوروبەری شاردا بوو. پێ دەچوو لەوکاتەدا من دەرفەتی ئەو کارەم هەبێت. دیارە ئەوان لە دڵسۆزیەوە هەوڵیاندا لە دەستم ڕزگاریان بێت. ئەگەرچی من دەرکم بەمەکردبوو بەڵام هەر چووم بۆ وێستگەکە. بێگومان بەو هیوایەی ئەم بڕیارە جیدیانە کاریگەریان لەسەر توانای تۆ هەبێت. هەموومان چووین بۆ ئەو وێستگەیەی لەونزیکانە بوو. لێ لەوەی دەکرد ناوی ئەو شوێنەم لەبیرچووبێتەوە کە قوتابخانەکەی تیایە. ئێمە لەبەردەم تابلۆیەکی گەورەدا وەستابووین کە ڕێنمایی کات و گەیشتن و ڕۆیشتنی شەمەندەفەری لەسەر نووسرابوو. یەکێک کە ئەمووستی بەسەر ناوی وێستگەکاندا دەگێڕا لێی پرسیم بۆ کوێ دەچم. لێ من نیازی هیچ وێستگەیەکم نەبوو. لەوساتەدا دەرفەتێک هەڵکەوت تۆزێک چاودێریت بکەم. لەڕاستیا تۆ هەر چۆن بویتایە بۆ من جیاوازیی نەبوو. تاقە شتی گرنگ لای من قسەی تۆ بوو، تۆ زۆر لە خۆت نەدەچوویت. بەهەرحاڵ گەلێک ڕەش داگەڕابوویت. لاواز. کەس نەیدەزانی بەرانبەر بەو کوڵمە گۆشتنانەت هێند بێ بەزەیی بێت (ئەرێ بەڕاست تا ئەو ڕادەیە دەم و چاوی تۆ دڵڕەقە؟) سەیر ئەوەبوو جلەکانی بەرت لە هەمان جل و بەرگی من و گەلێک پیاوانەبوو کە بەڕاستیی من پێم خۆش نەبوو. بەڵام دوایی کۆپلەیەک لە نامەیەکم بیرکەوتەوە (کۆپلەی شیعرێک بوو ((dvoje saty manaprece slusne vgpadam)) ئەوەندە قسەکانت کاریگەریان لەسەردانام کە لەو چرکەساتەوە بووم بە هەواداری جلەکانت.

ئێستا کاتی ئـەوە هاتووە کۆتایی پێ بێت. هاوڕێکانم هێشتا بەسەر تابلۆی ڕێنماییەکەوەبوون و دەگـەڕان. دوا باسمان شتێکی لەم بابەتە بوو: سبەی یەکشەممە بوو. بە بۆچوونی من تۆ لە ڕۆژی

یەکشەمواندا کاتت بۆ من هەیە. تۆ شتی ناپەسەندت پێ قبووڵ ناکرێت. ئەگەرچی وەک ئەنجام پێ دەچوو خۆت بەدەستەوە دابێت، وتت دەبێت هەوڵ بدەیت چل دەقیقە بۆ من تەرخان بکەیت. (بێگومان ترسناکترین بەشی ئەم گفتوگۆیە خودی وشەکان نەبوون، بەڵکوو شێوازی وتنەکە و بێ هوودەیی شەڕە بێ دەنگ و بەردەوامەکەت بوو. ((من نامەوێت بێم بۆ ڤیەنا، کێشەکەم ئەوەیە ئەگەر بە هەموو ئەو شتانەوە بێم بۆ تۆ چ سوودێکی هەیە؟)) لێ ئەگەر تۆ بۆ ماوەی چل دەقیقە ئازادیت هەبوایە ئیتر من لە دەستت ڕزگارم نەدەبوو. تۆ نازانیت. ئەگەرچی تۆ بە ڕووکەش هەموو بیری خۆت لەسەر ئەو مەسەلەیە چڕکردۆتەوە بەڵام توانای بڕیاردانت نیە. پاشان من لێم پرسیت: ((دەکرێت من هەموو ڕۆژەکە لە چاوەڕوانیدابم؟)) تۆ بە بەڵێ وەڵامت دایەوە و ڕووت بەلای ئەو کەسانەدا وەرگێڕا کە چاوەڕێت بوون. وەڵامەکە بەو مانایەبوو کە ئیتر تۆ هەرگیز نایەیت و تەنیا دەتەوێت من لە چاوەڕوانیدا بژیم. بە دەنگێکی لاوازەوە وتم: ((من چاوەڕێ ناکەم)) کە زانیم گوێت لە دەنگم نەبوە هیچ چارێکم نەما ئەوە نەبێت نائومێدانە لەپشتتەوە هاوارم کرد. بەڵام تۆ نە مەبەستت بوو نە بایەخت پێدام. بۆیە بە لارەلارە گەڕامەوە و بەناو شاردا وێڵ وێڵ دەستم بە سووڕانەوە کرد.

بەڵام دوای دوو سەعات نامە و گوڵ و خۆشەویستی و دڵدانەوەکان گەیشتن.

– ف –

میلنا، دیسان ناونیشانەکان ڕوون نین، کارمەندانی پۆست دووبارە دەیان نووسنەوە و چاکیان دەکەن. دوای ئەوەی یەکەمجار داوام لێ کردبوویت ناونیشانەکان زۆر چاک بوون. نموونەیەکی زۆر لەو دەست خەتانەی هەرچەند، هەندێک جار ناخوێنرێنەوە بەڵام جوان و جۆراوجۆرن. ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی پۆست چاوی منی ببوایە تاڕادەیەک دەیتوانی تەنیا ناونیشانەکانی تۆ بخوێنێتەوە نەک ناونیشانی تر. بەڵام ئیتر ئەوە بەڕیوەبەرایەتی پۆستە (....)

## مران ١٥ ژوین ١٩٢٠ سێ شەممە.

دیسانەوە ئەم بەیانیە زوو خەوم بە تۆوە بینیەوە. بە جووتە لەپاڵ یەکتردا دانیشتبووین و تۆ ڕووت وەرگێڕابوو. ڕوو وەرگێڕانەکەت نەک لەبەر تووڕەیی بەڵکوو دلۆڤان بوویت. من گەلێک خەفەتبار بووم. نەک لەبەر ڕوو وەرگێڕانەکەت بەڵکوو لە دەست خۆم کە بەشێوەیەک ڕەفتارم لەگەڵدا کردبوویت وەک لەگەڵ هەر ژنێکی خامۆشی تردا. لەبەرئەوەی کە گوێم لە قسەیەکی ناخی تۆ نەبووبوو، یان ڕاشکاوانەتر ئەو دەنگەی کە لەگەڵ مندا دەدوا. یان لەوانەیە لەبەرئەوە نەبێت کە گوێم لە دەنگەکە نەبوە بەڵکوو لەبەرئەوەی وەڵامیم نەدابوەوە. من لەوە نائومێدتر بووم کە لە خەونەکەی پێشووتردا بەسەرما تێپەڕی، دوورکەوتمەوە.

لە شوێنێکدا شتێکم خوێندەوە لەگەڵ ئەم باسەدا دەگونجێت. چەند بتوانم هەوڵ دەدەم بیرم بکەوێتەوە. شتێک بوو لەم بابەتە: خۆشەویستەکەم ئەستوونێکی ئاگرینە بە هەموو زەویدا دەگەڕێت، وائێستا گەمارۆی منی داوە. بەڵام ڕێنمایی ئەو کەسانە ناکات کە گەمارۆی داون، بەڵکوو ڕێنمای کەسانێکە کە دەبینن.

دڵسۆزت

(من تەنانەت ناوی خۆیشم ون کردوە. تابێت کورت و کورتر دەبێتەوە، وائێستا ئەمەی لێ ماوەتەوە: دڵسۆزەکەت)

## مران، ۲۱ ژوین ۱۹۲۰

تۆ ڕاست دەکەیت، هەر ئێستا کە لۆمەکەت دەربارەی وشەی «منداڵی گچکە» دەخوێنمەوە، بەداخەوە نامەکانت لە ئێوارەیەکی درەنگدا گەیشتن. من دەمەوێت بەیانیی زوو لەگەڵ ئەندازیار بولزانودا گەڕانێکی کورت بکەم. بەڕاستیی بەخۆم دەڵێم: بەسە، تۆ ناتوانیت ئەمشەو ئەم نامانە بخوێنیتەوە. ئەگەر بەتەمایت بەیانی بۆ گەڕان بچیتە دەرەوە دەبێت کەمێک بخەویت. من پێش ئەوە خەریکی خوێندنەوە بووم و تێگەیشتم و بێزاریم نەما. ئەگەر لێرەبوویتایە (مەبەستم تەنیا لە نزیکییەکی فیزیکی نیە) دەمتوانی هەناسەیەکی ئاسوودە بدەم و سەر بخەمە داوێنتەوە. دیارە ئەمە نیشانەی نەخۆشیە. وانیە؟ هەرچۆنێک بێت من تۆ دەناسم و دەزانم وتەی «منداڵی گچکە» ئەوەندە ترسناک نیە. دەشێت تەنیا گاڵتەیەک بێت. بەڵام هەمووشتێک بۆ من دەبێت بە هەڕەشە. ئەگەر ناچاربوویت نامەم بۆ بنووسیت ((لە نامەکەی دوێنێتدا پیتی (و) زۆر بوون. چۆن وێرات ئەو هەمووو (و) بۆ من بنووسیت؟ ئەوکاتە، ئەگەر تۆ هەروا بە جیدی بمابیتایەتەوە، بڕوام بەخۆم دەهێنا کە سووکایەتیم پێ کردوویت و بەوەیش تەواو دڵتەنگ دەبووم. سەلماندنی ئەمە کارێکی دژوارە.))

پێویستە ئەوە لەبیرنەکەین کە هەرچەندە جیاکردنەوەی تراژیدیا لە کۆمیدیا لەخۆیدا ئاسانە، کاتێکیش پەیوەندیی بە کەسانێکەوە هەبێت ئەوەندە گرنگبن کە ژیانی ئێمەی پێوە بەسترابێت ئەوسا ئاسانتر دەبێت. لەڕاستیا ئەوە مەترسیەکی هێند گەورەیە کە چاوی میکرۆسکۆبی و وردبینی بە مرۆڤ دەبەخشێت. تاقە جارێکیش بەسە ئەو چاوەت هەبێت بۆئەوەی ئیتر هەر بەتەواویی مەحاڵ بێت جیاکاری بکەیت. لەم لایەنەوە من هەرگیز بەهێز نەبووم، تەنانەت لەکاتێکدا کە لەوپەڕی بەتواناییدا بوویێتم. بۆ نموونە کاتێک لە پۆلی یەکی سەرەتایی بووم، چێشت لێنەری



ماڵەوەمان پیاوێکی وشک و باریکەلەی لووت درێژ و گۆنا تێک قوپاو بوو. ڕەنگی زەرد بەڵام پتەو، زۆریش بەتوانا و چالاکبوو. ئەو هەموو ڕۆژێک ئێمەی دەگەیاندە قوتابخانە. ئێمە لە ماڵێکدا دەژیاین کەوتبوە نێوان کلاینەرینگ و گروسەرینگ. لەڕۆیشتندا یەکەمجار بە گۆڕەپانێکدا تێ دەپەڕین تا دەگەیشتینە تاین گاسە ئینجا بەناو گوزەرگایەکدا دەگەیشتینە فلایش مارک گاسە و لەوێشەوە بۆ فلایش مارک. هەموو بەیانیەک ئەمە کارمان بوو. کە لە ماڵ دەهاتینە دەرەوە چێشت لێنەرەکە دەیوت بە مامۆستاکەت دەڵێم ئەو ڕۆژە چەند لاسار بوویت، لەڕاستیا ڕەنگە من ئەوەندە لاسار نەبوویێتم. بەڵکوو تاڕادەیەک کەلەڕەق، بێ کەڵک، خەمبار و بێ تاقەت بوویم. دەکرا لە هەموو ئەمانە شتێکی جوان بۆ مامۆستا دروست بکرایە. من ئەمەم دەزانی. بۆیە هەڕەشەی چێشت لێنەرەکەم بە گاڵتە وەرنەدەگرت. لەبەرئەوەیش کە ڕێگای قوتابخانە گەلێک دوورودرێژ بوو لەسەرەتاوە وام بەبیرداهات کە دەشێت لە ڕێگادا هەمووشتێک ڕووبدات. (ئەمە لەو منداڵبازاڕیە دەچێت کە وەک ڕێگاکان درێژە ناکێشن. ئەم پەشۆکان و

جیدیەتە ڕەنگ مردوە وردەوردە گەشە دەکەن) من هەر زۆر بەگومان بووم بە مامۆستاکەم بڵێت. بەتایبەتیی کە هێشتا لە ئاڵتشاتررینگ بووم لەوە بەگومان بووم کە ئایا چێشت لێنەرەکە، ئەگەرچی تەنیا لە سنووری ماڵەکەی ئێمەدا قسەی دەیخوارد. بەڵام بۆ مامۆستایەکی بەڕێز کە فەرماندەیەکە و لە هەموو دنیادا قسەی دەخوات هیچ دەڵێت یان نا؟ من شتێکی لەو بابەتەم دەوت و چێشت لێنەرەکە بە لێوە باریک و بێ بەزەییەکانی زۆرجار وەڵامی دەدامەوە. لێ مەرج نەبوو بڕوای پێ بکەم. بەڵام ئەو هەر دەیوت و دەیوتەوە. لە شوێنێکی نزیک بە دەرگای چوونە ژوورەوەی فلایش مارک گاسە (هێشتا ئەم دوانە مێژوویەکی کەمێک سەرنج ڕاکێشیان لای من هەیە. تۆ کە منداڵ بوویت لە چ کۆڵانێکدا دەژیایت؟) ترسی هەڕەشەکە گەیشتە ئەوپەڕی. قوتابخانە بێ لەم قسانە هەر بۆخۆی کابووسێک بوو. چێشت لێنەرەکەیش دەیویست لەوە خراپتری بکات. من دەپاڕامەوە و ئەو سەری ڕادەوەشاند. چەند پاڕانەوەکەم زیاتربوایە، ئەوەی بۆی دەپاڕامەوە و بەلای خۆمەوە بەهادارتر بوو بەڵام مەترسیەکە زیاتر دەبوو. من بێ جووڵە ڕادەوەستام و داوای لێبوردنم دەکرد. بەڵام ئەو بەدوای خۆیدا کێشی دەکردم. من هەڕەشەم لێ دەکرد کە بە باوک و دایک دەڵێم. ئەو بە قسەکانم پێدەکەنی. ئەو لەو چرکەساتەدا بەتواناترین کەس بوو. من خۆم بە دووکان و کۆڵەکەکانەوە دەنووساند و هەنگاوم نەدەنا ئەگەر ئەو لێم خۆش نەبێت. یان لەدواوە داوێنیم ڕادەکێشا (بۆ ئەوییش ئەمە ئاسان نەبوو) بەڵام ئەو هەر منی بەدوای خۆیدا کێش دەکرد و پێی دەگوتم کە ئەوەیش بە مامۆستا دەڵێت. تادەهات درەنگتر دەبوو، سەعاتی کڵێسەی یاقوب زەنگی هەشتی لێ دەدا. گوێم لە دەنگی سەعاتەکە دەبوو. منداڵەکانی دی دەکەوتنە ڕاکردن. من بەردەوام زۆر لە درەنگ کەوتن دەترسام. ئیدی هەردووکمان ناچاربووین ڕابکەین. بەدەم ڕاکردنەوە هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو قسەکان بە مامۆستا دەڵێت یان نا. چاکە، بەڵام ئەو هیچ کاتێک پێی نەدەوت لێ من هەمیشە چاوەڕێم دەکرد بیکات. تەنانەت شیمانەی (وتنەکەی) زیاتر دەبوو، دەیوت (دوێنێ پێم نەوت بەڵام ئەمڕۆ پێی دەڵێم) هەرگیز لەمە زیاتری نەدەکرد. هەندێک جاریش ڕوویدەدا- بیری لێ بکەرەوە میلنا- لە ڕێگای قوتابخانە ئەوەندە لە دەستم تووڕە دەبوو پێی بە زەوییەکەدا دەکوتا، هەندێک جار ژنی بازرگانی بەردی خەڵوزەکە کە لەوێ وەستابوو تەماشای دەکردین. میلنا! چ شێتیەکە! من لەگەڵ ئەم هەموو چێشت لێنەر و هەڕەشە و تۆز و خۆڵە دێوئاسایەدا کە ٣٨ ساڵ منیان پێ شێل کردوە و سیەکانمیان گەستوە، تا چ ڕادەیەک من تۆم خۆش دەوێت.

لێ بەڕاستی من نیازی ئەوەم نەبوو هەموو ئەم شتانەت پێ بڵێم یان هیچ نەبێت بە جۆرێکی تر پێت بڵێم، ئیتر کات درەنگە. دەبێت تەواوی بکەم و بچمە ناو جێگا، من توانای خەوتنم نیە چونکە دەستم لە نووسینێک هەڵگرتوە کە بۆ تۆ بوو. بەڵێ ئەگەر دەتەوێت ئاگاداریت لەسەر ژیانی من هەبێت ئەو نامە ترسناکەت لە پراگەوە بۆ دەنێرم کە شەش مانگ لەمەوبەر بۆ باوکم نووسیوە و هێشتا نەمداوەتێ.

سبەی، یان ئەگەر کەوتە شەوێکی درەنگ دووسبەی وەڵامی نامەکەت دەدەمەوە. من چەند ڕۆژێک زیاتر لێرە دەمێنمەوە چونکە بڕیارم داوە باوکم و دایکم لە فرانزباد نەبینم. هەرچەندە ئەم کەوتنەی من لە باڵکۆندا زەحمەتە بڕیاری لەسەر بدرێت. جارێکی تریش سوپاس گوزاری نامەکەتم.

- ف-

سەرچاوە:
نامەهای بە میلنا

# خوان ڕامۆن خیمەنێز ژیان و هەڵبژاردەیەک لەشیعرەکانی

نووسینی: ڕۆبەرت بلیی
و. لە ئینگلیزییەوە: هێرش سەعید

خیمەنێز، هاوڕێ لەگەڵ ئەنتۆنیۆ مەچادۆ و ئوناموتۆ، پێشڕەویی ژیانەوەیەکی مەزن و گەشیان کرد لە شیعری ئیسپانی ساڵانی ١٩١٠. ئەو شاعیرانە پێکڕا خەونیان بە پشکوتنێکی نوێی ئیسپانیاوە دەبینی. خیمەنێز بەهێز و پتەو نەبوو، جەستەیەکی لاواز و هەستیار بوو کە زیاد لە جارێک لە نەخۆشخانەی بوژانەوە sanatorium ڕووت کرابوویەوە بۆ چارەسەر. سەرباری ئەمەش دڵسۆزی و خۆ تەرخانکردنی بۆ شیعر لەوپەڕی تەندروستی و وردییدابوو. چەند ساڵێکی بە سەرنووسەریی گۆڤارە شیعرییەکانەوە بەسەر برد و کۆمەڵێ بڵاوکراوەی گرتە ئەستۆ بۆ بە چاپ گەیاندنی شیعری نوێ. چەندین پاشنیوەڕۆی بێ برانەوەی لە لێ وردبوونەوە و تاووتوێکردنی دەستنوسی شاعیرانی گەنجدا بەڕێ کرد.



خوان ڕامۆن خیمەنێز

پەرۆشیی ئەم و نەفەس درێژیی مەچادۆ بۆ کارکردن، بوونە ڕێ خۆشکەریی بۆ نەوەی مەزنی ٢٨: (لۆرکا، ئەلیکساندرێ، سالیناس، گیلێن). شیعرە بەراییەکانی لۆرکا لاساییکردنەوەی خیمەنێزە. شیعرەکانی وی خانووگەلێکی ڕۆشن و پڕ لە هەوای کراوە بوون لە پێکهاتەی درەختی بی و بە چەند دیزاینێکی نوێوە کە هەموو شاعیرە نوێیەکانی ئیسپانیا خۆیان لە یەکێک لە خانووەکانی ئەودا دەبینییەوە بەرلەوەی بگوێزنەوە بۆ خانووەکانی خۆیان.

ئەو دەیگوت کە شیعر باڵاترین شێوەی پەیڤینە. کرۆکەکەی ژیانێکی ناوەکیی پەنهانە. خیمەنێز، خۆتەرخانکردنێکی سەخت و دژوار بۆ هونەری شیعر سەربار دەکات: "شیعری نووسراو وەک یەکێک لە شێوەکانی دەربڕین، بەردەوام لای من وا دەرکەوتووە کە بۆ وتن دەست نەدات." ئەو دەپرسێت، دەبێ چ جۆرە ژیانێکمان هەبێت تاکوو بە قووڵی هەست بە شیعر بکەین؟ هەر لە وەڵامدا دەڵێت ئەو (خۆی) پێویستی بە کەمێک گۆشەگیری و دوورەپەرێزییە. کاتێک خەڵکی بانگیان کرد، بتوانێ زۆر بە سادەیی بڵێت، "ئەمڕۆ خوان ڕامۆن خیمەنێز لە ماڵ نییە." کەچی گەرموگوڕی و خۆشڕوییەکەشی یەکەم شت بوو کە خەڵکی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. لە ١٩٠٣ دا، خوێندنەوەیەکی ئەدەبی دەنوسێت بۆ ستایشی سۆلێدادێس (خەڵوەت)، کە یەکەم کتێبی ئەنتۆنیۆ مەچادۆیە. کتێبی پەخشانە شیعریی (پلاتیرۆ یی یۆ) "خۆم و پلاتیرۆ، ١٩١٧" کە تێیدا وتوویژ لەگەڵ گوێدرێژێکا دەکات، ئێجگار بەربڵاو بوو، ئەمێستاش وەک کتێبی عەشقە بۆ ئەندەلوسیا.

لە ١٩١٦ دا. گەشتێک دەکات بۆ نیویۆرک، تاکو هاوسەریی لەگەڵ زینۆبیا کامپروبی بکات، کە براکەی خاوەنی ڕۆژنامەیەکی ئیسپانی –

زمانە لە نیویۆرک. کتێبی شیعرەکانی لەبارەی ئەو گەشتەیەوە شاکارێکە بەناوی "یادنامەی شاعیرێک کە تازە هاوسەریی کردووە." ئەو کتێبەی کۆمەڵێک پەخشانە شیعری زۆر سەرنجڕاکێش لەخۆدەگرێ لەبارەی نیویۆرکەوە: وەسفی سەردانیی خانووە بچوکەکەی واڵت ویتمان دەکات لە لۆنگ ئایلەند، وە لەبارەی ئەو سەعاتەی کە لە یانەی نووسەران ماوەتەوە (ئەو شوێنەی کە خەونی بە سوتاندنیەوە دەبینی؛ یانەکە شوێنێک بوو بۆ کات بەسەربردنی نووسەرە ئاست نزمەکانی نیویۆرک). پاشان گەشتێک دەکات بەرەو بۆستن، بۆ ستایشکردنی پەنجەرە ئەرخەوانییەکانی بییکن هیڵ.

بەردەوام گۆڕانکاریی لە شیعرەکانیدا دەکرد بەرەو ستاییلە نوێکان. زۆرجار وەک ژن شیعری ناوزەد دەکرد. جارێکیان چیرۆکی هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی لە شیعرێکا پوخت کردەوە، شیعرەکە ئاواهی دەست پێدەکات "سەرەتا کە دێتە لام پاکیزەیە." دەیوت، بەرائەتی شیعرە بەراییەکانی خۆمم خۆشدەویست. دواتر شیعرەکانم دەستیانکرد بە خۆ نمایشکردن و سنگ دەرپەڕاندن و خۆ نوواندن، ئیتر ڕقم لێیان هەستا. پاش مودەتێک، شیعرەکانم جارێکی تر گەڕانەوە بەرەو دڵسافیی و ڕاشکاوی و سادەگۆیی. جارێکی تر بەرائەتیان بۆ گەڕایەوە و دووبارە عاشق بوونەوە. لە دوواجارا ڕوژد و ڕووت بوونەوە. "شیعری ڕووت، ئەوەی کە لە هەموو ژیانما خۆشم ویستووە."

خوان ڕامۆن خیمەنێز لە ساڵی ١٨٨١ لە مۆرگ ی باشوری ئەندەلوسیا لەدایک بووە. لە شارۆچکەکەیەوە شیعرە سەرەتاییەکانی خۆی ناردووە بۆ ڕۆژنامەکان لە سەڤیل، نووسەرەکانی ئەوێ بەهرەکەیان ناسیوەتەوە و گۆڤارەکانی مەدرید شیعرەکانیان بڵاو کردۆتەوە. تا ئەوکاتەی داوەتنامەیەکی پێ دەگات بە ئیمزای چەند نووسەرێکەوە، ئیتر لە ١٩٠٠ دا کە تەمەنی هەژدە ساڵە، دەگاتە مەدرید بۆ بەشداریی کردن لە ژیانی ئەدەبی ئیسپانییدا.

سەرەتا بە بڵاوکردنەوەی کتێبی شیعریی دەست پێدەکا و دواتر لە ١٩٠٦ دا خوێندنەوەیەکی ئەدەبی بڵاودەکاتەوە بەناوی ڕێناسیمێنتۆ (ڕێنیسانس) بۆ بەرز ڕاگرتنی شیعری نوێی ئیسپانی. لە ١٩٠٥ دا، دەگەڕێتەوە بۆ مۆرگ و حەوت ساڵی تر لەوێ دەمێنێتەوە. دەست دەکات بە نوسینی کتێبە سەرنجڕاکێشەکەی "پلاتیرۆ یی یۆ".

کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ مەدرید، بە کۆبەرهەمی ڕابیندرانات تاگوورەوە دێتەوە کە خۆی و ژنەکەی وەریانگێڕاوە. لەوێ لەگەڵ شاعیرە گەنجەکاندا درێژە دەدات بە کارکردن و ئێستودیانتێس (خوێندکاران) بڵاودەکاتەوە، کە لە بەیتە شیعری هەشت بڕگەیی پێکهاتووە. شاعیرانی ئینگلیز دەخوێنێتەوە و ییتس تەرجەمە دەکات، و بەردەوام دەبێت لە بڵاوکردنەوەی کتێبە شیعرییەکانی.

لە ١٩٣٦ دا شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا هەڵدەگیرسێ. هیچ شتێک نایبەستێتەوە بە فرانکۆ وە (فرانسیسکۆ فرانکۆ دیکتاتۆری ئیسپانیا، و.کوردی)، بۆیە ڕوو دەکاتە تاراوگە. ئەوکاتەی شەڕی ئیسپانیا تەواو دەبێت، لۆرکا مردووە و ڕافائیل ئەلبێتی، خۆرخێ گیلێن، پێدرۆ

سالیناس، ئێمیلیۆ پرادۆس، مانوێل ئەلتۆراگیلێ و لوییس سێرنوزا لە تاراوگەن.
خـوان ڕامـۆن کە دێتە ئەمریکا، سەرەتا بۆ ماوەیەک لە (چێڤی چەیس، ماریلاند) دەژی، بـەڵام کۆمەڵەی ئەدەبیی ئەمریکا پشتگوێی دەخەن. دوواتر دەگوێزێتەوە بۆ پوییێرتۆ ریکۆ، لەوێ تا کاتی مردنی لە زانکۆی پوییێرتۆ ریکۆ وانە دەڵێتەوە.
خۆشەویستیی بۆ ژنەکەی یەکێک دەبێت لە مەزنترین دڵسۆزییەکانی ژیانی، وە زۆرینەی شیعرەکانی بۆ ئـەو دەنـووسـێـت. کاتێک لە ١٩٥٦ دا خەڵاتی نۆبڵ وەردەگرێت، ژنەکەی لە سەرەمەرگدا دەبێت، بە پەیامنێرەکان دەڵێت کە لێی دوورکەوتنەوە، ئەو ناڕوات بۆ ستۆکهۆڵم، دەبایە ژنەکەی خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتایە، ئەو هیچ ئارەزوویەکی نییە بۆ وەرگرتنی. دوای ئەوەی ژنەکەی دەمرێت، هیچ شیعرێکی تر نانووسێت و چەند مانگێک دوای ئەو لە بەهاری ١٩٥٨ دا دەمرێت.



## (سەرەتا کە دێتە لام پاکیزەیە)

سەرەتا کە دێتە لام پاکیزەیە،
تەنها جلی بەرائەتی لەبەرایە؛
منیش خۆشمەوێ وەک چۆن منالْمان خۆشەوێ.

پاشان دەست دەکات بە لەبەرکردنی
ئەو جلانەی کە لە شوێنێکا هەڵیگرتوونەتەوە؛
ئیتر ڕقم لێی دەبێت، بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم.

وردەوردە دەبێتە شاژنێک،
خشڵەکانی دەدرەوشێنەوە...
چ داخ و کەسەرێکە!

... دیسان ئەگەڕێتەوە بەرەو ڕووتی.
منیش زەردە ئەمگرێ.

خێرا لەوێوە دەگەڕێتەوە بۆ
بەرائەتی جارانی.
دووەمجار بڕوام پێکرد.

پاشان جلەکانی دائەکەنێ و
بەتەواوی ڕووت دەبێتەوە...

شیعری ڕووت، هەمووکاتێ هی من بووە،
کە لە هەموو ژیانما خۆشم ویستووە!

## (مانگی پولردە)

دەرگا بازە،
دەنگی زیکزیکەکان دێ.
ئەرێ بەو ڕووتییەوە دەسوڕێیتەوە
لە دەشتا؟

وەک ئاوێکی جاویدانی،
کە بەناو هەموو شتیکا دەڕوات و دێت.
ئەرێ بەو ڕووتییەوە دەسوڕێیتەوە
لە هەوایا؟

ڕەیحانە نەنوستووە،
مێرووله سەرقاڵە.
ئەرێ بەو ڕووتییەوە دەسوڕێیتەوە
لە ماڵا؟

## (پاپۆڕ)

هەموو لە خوارەوە نوستوون.
لەسەرەوە من و ڕانەر* بەخەبەرین.

ئەو، ئافەریدەی جەستەکان، بە دەستی پڕ لە کلیلی
بادراوی نێو قوفڵەکانەوە، سەیری ئاراستەی قیبلەنماکە دەکات.
منیش، کە چاوم بڕیوەتەوە ئەبەدیەت،
ڕێبەریی گەنجینەی ئاوەڵای ڕووحەکان دەکەم.

---

*ڕانەر: سوکان بەدەستی کەشتی

## (من، من نیم)

من، من نیم.
من ئەوەم کە
لە تەنیشتمەوە دەڕوا و من نای بینم.
ئەوەی کە ڕێدەکەوێ جاروبار سەردانێکی بکەم و
جارانی تریش بەتەواوی لەیادی کەم.
ئەوەم کە بێدەنگ دەبێت، هەرکاتێک من دەپەیڤم،
ئەوەم کە دەبورێت و خۆش ڕوویی دەنوێنێ،
وەختێک کە من ڕق هەڵدەگرم،
ئەوەم کە دەچێت بۆ پیاسە، کاتێک من لە
ماڵەوەم،
ئەوەم کە بە ڕاوەستاوی دەمێنێتەوە، کاتێک من
دەمرم و بەلادا دەکەوم.

**سەرچاوە:**
The Winged Energy of Delight, Selected Translations by Robert Bly



#ماڵئاوایی دواهەمین بیرمەندی ئیسلامی میانڕەو جەماڵ بەنا

ئامادەکردنی: سەردەم

جەمال بەنا لە ١٥ی کانونی یەکەم لە شاری مەحمودییەی سەر بە پارێزگای البحیرە لەدایکبووە و لە ڕۆژی چوارشەمە بەرواری ٣٠ی کانونی یەکەمی ئەم ساڵدا، واتە ٢٠١٣، لە قاهیرەی پایتەختی میسر و بەهۆی نەخۆشییەوە، لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی قاهیرە و لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. جەمال بەنا بیرمەندێکی ئیسلامی میانڕەوە و برا بچوکی حەسەن بەنایە کە لە ساڵی ١٩٢٨ ڕێخراوی ئیخوان موسلمینی لە میسر دامەزراندووە. بەڵام جەمال بەنا لەگەڵ بیروڕای ئەو ڕێخراوەدا ناکۆک و ناتەبابووە و خیلافێکی فیکری قووڵ لەنێوانیاندا هەبووە. بەجۆرێک هەندێ لە زانا ئیسلامییەکان، پێیانوایە بیروڕاکانی جەمال بەنا لادان و دەرچوونە لە ئیجماعی ئەهلی کتێب و سوننە.



جەمال بەنا

جەمال بەنا پێیوایە ئافرەت ئەگەر شارەزایی لە قورئاندا هەبێت، ئەوا مافی ئەوەی هەیە پێشنوێژی بۆ پیاوان بکات. هەروەها پێیوایە حیجاب فەرز نییە بەسەر ئافرەتدا و ئافرەت ئازادە لەوەی حیجاب دەپۆشێ یان نا. باسکردنی حیجاب لە قورئاندا تەنها تایبەت بووە بە ژنەکانی پێغەمبەر. جگە لەوانە پێیوابووە جگەرە کێشان لەکاتی ڕۆژوگرتندا، ڕۆژووەکە ناشکێنێت، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی لەکاتی ڕۆژوگرتنیاندا، ناتوانن واز لە جگەرەکێشان بێنن. لەسەرو هەموو ئەو شتانەوە ئەم بیرمەندە ئیسلامییە لەو باوەڕەدایە نابێت پیاو بە تەنها مافی تەڵاقدانی هاوسەرەکەی هەبێت. چونکە ئەو دووانە بە ڕەزامەندی هەردوولا بوونەتە هاوسەری یەکتر، بۆیە لەکاتی جیابوونەوەشدا، پێویستە هەردوولا ڕازیبن و لەسەر مەسەلەی جیابونەوەکە ڕێکەوتبن.

جەمال بەنا هەرچەندە خۆشەویستیەکی زۆری بۆ حەسەن بەنای برای هەبوو، وەک باوک لێیدەڕوانی، چونکە نزیکەی بیست ساڵ لەخۆی گەورەتربوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لەلایەنی فیکرییەوە، زۆر زوو لە حەسەن بەنا و ڕێخراوی ئیخوان موسلمین دوورکەوتەوە و ڕێڕەوێکی دیکەی هەڵبژارد، بگرە جەمال بەنا یەکێکە لەوانەی زۆرترین ڕەخنەی لەو ڕێخراوە و لە ڕێخراوە ئیسلامییە تەقلیدییەکانی دیکە گرتووە. لەبەرئەوەیە ڕێخراوی ئیخوان موسلمین کەیفیان پێینەدەهات و چارەیان نەدەویست. هۆکاری هەرە سەرەکی ئەو چارەنەویستنە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جەمال بەنا ڕەخنەی توندی ئاراستەی شێوازی ڕێخستنی ئیخوان موسلمین دەگرت کە لە شێوازی ڕێخستنی حیزبی شیوعی دەچوو. ئەمە جگە لەوەی جەمال بەنا نووسەرێکی کراوەتر بوو، هەوڵیدەدا فیکری ئیسلامی تازەبکاتەوە و دووریبخاتەوە لە توندڕەوی و دەمارگیری. هەربۆیە بە یەکێک لە بیرمەندە پێشەنگەکانی ڕۆشنگەری ئیسلامی دادەنرێت و بیروڕاکانی هەم لایەنگری هەبوو هەم نەیار، خەڵکانێک هەبوون تەواو لەگەڵ بیروڕاکانیدابوون و خەڵکانێکیش هەبوون، بەپێچەوانەوە، تەواو دژی بیروڕاکانی بوون.

هەندێ لە نووسەرە عەرەبەکان هیواداری ئەوەبوون حەسەن بەنای برا گەورە، بیروڕاکانی جەمال بەنا تەبەنی بکات و لەپێناو پێشخستن و گەشەکردنی باشتری ڕێخراوەکەی، ئیخوان موسلمین، بیانخاتەگەڕ. لایەنێکی گەشی ئەم بیرمەندە ئیسلامییە ڕیفۆرمخوازە، بریتییە لەو بەڵگەنامە مێژووییانەی لەسەر ڕێخراوی ئیخوان موسلمین نوسیویەتی و تێیدا باس لە ڕێڕەوە هەڵبەز و دابەزەکەی ئیخوان دەکات لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی میسر. ئاشکرایە ئەم پیاوە هەر لە منداڵییەوە بە چاوی خۆی بینیویەتی برا گەورەکەی و هاوڕێکانی، سەرقاڵی دروستکردنی ڕێخراوێکی ئیسلامی

بوون کە دواتر لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا دەبێتە یەکێک لە ڕێخراوە مەترسیدارەکان بۆ سەر عەقڵی موسڵمان. جەمال بەنا لەو بارەیەوە کتێبێکی بە ناونیشانی (لە بەڵگەنامە نادیارەکانی ئیخوان موسلمین)

ئـەم بیرمەندە لە خێزانێکی هــەژار و دەستکورت هاتووەتە دونیاوە، باوکی بانگدەری مزگەوت و سەعاتچی بووە، چوار برای هەبوو، گەورەکەیان حەسەن بەنا بووە و خۆشی بچوکی هەموویان بووە. پەیوەندی نێوان باوک و برا گەورە و برا بچوک، پەیوەندییەکی باش و سۆزئامێز بـووە، هەرچەندە جیاوازی بیروڕا لەنێویاندا بەئاشکرا ڕەنگیداوەتەوە. جەمال بەنا کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ بووە و هەر لە تەمەنی گەنجییەوە حەزی لە خوێندنەوە بووە. نەفسبەرزی و خۆڕاگری لە باوکییەوە بۆ مابوەوە. جەمال بەنا ساڵی ١٩٤٥، واتە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا، یەکەم کتێبی بە ناونیشانی (سێ بەربەست لەبەردەم نەمری) بڵاودەکاتەوە. ساڵی دوای ئەوە، واتە ١٩٤٦ کتێبی دووەمی بە ناونیشانی (دیموکراتییەکی تازە) بڵاودەکاتەوە. لەم کتێبەیدا تێڕوانینێکی تازە بۆ ئیسلام دێنێتە ئاراوە، تێڕوانینێک تەواو جیاوازە، بگرە تەواو دژ بەو تێڕوانییە کۆنەیە کە لە عەقڵیەت و بیروڕای زۆرینەدا جێگیرو چەسپاوە. دواتر لەسەر نوسینی کتێب و کاری وەرگێڕان بـەردەوام دەبێت تاکو زیاد لە ١٥٠ کتێب بڵاودەکاتەوە. سەرەڕای ئەو هەموو بەرهەمە، لەنێوان ساڵانی ١٩٦٣ بۆ ١٩٩٣ لە زانکۆی (العمالیە) و هەندێ پەیمانگای تایبەتمەندا وانەی وتووەتەوە.

ئەم بیرمەندە پێیوابووە مرۆڤ خۆی لەخۆیدا ئامانجە و ئیسلام وەسیلەیەکە لەپێناو خزمەتکردن بەو ئامانجەدا. لە میانەی پڕۆژەکەیدا بانگەشەی بۆ ڕەتکردنەوەی سەلەفییەت و پەیڕەونەکردنی کردووە، چونکە بەپێی تێڕوانینی جەمال بەنا سەلەفییەت بریتییە لە ڕابـردوویـەک ناتوانین لە ئێستاماندا تێیدا بژین. یەکێک لەو بیروڕایانەی جەمال بەنا کە مشتومڕ و قسەوباسێکی زۆری بەدوایخۆیدا هێناوەتەئارا، ئەوەیە کە پێیوایە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و چوونە سەر ئاینی مەسیحی یان جوولەکە، نابێت هۆی کوشتنی کەسی هەڵگەڕاوەکە! هەروەها بەلای ئەم بیرمەندەوە ماچکردنی نێوان دوو ڕەگەزەکە ڕێگەپێدراو بووە.

جەمال بەنا لە ساڵانی کۆتایی ژیانیدا، لەگەڵ کتێبخانە گەورەکەیدا، وەک ڕاهیبێک، لە میحرابی فیکری جیهانی بە گشتی و فقهی ئیسلامی بەتایبەتی دەژیا. ئەو هەرچەندە خوێندنێکی مامناوەندی خوێندبوو، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا توانی خۆی ڕۆشنبیر بکات و بەباشی فێری زمانی ئینگلیزی ببێت. ئەمەش دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساند سەرچاوەیەکی زۆر لە فیکری جیهانی بخوێنێتەوە، ئاشنایەتییەکی گەورە لەگەڵ ڕێباز و قوتابخانە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکاندا پەیدابکات. سەرسامبوونی خۆی بە حیزبی کرێکارانی بەریتانیا و سۆشیالیزمە میانڕەوەکەی نـەشـاردووەتـەوە. ئەم پیاوە لەم سی ساڵەی دوایـدا، چەندینجار لە ناوەندی (ئیبن خەلدون) وانەی وتووەتەوە و بە شێوازە سوک و ئاسانەکەی و بە تەوازوعە گەورەکەی و بە بیرکردنەوە قووڵەکەی، هەمو ئەوانەی سەرسامکردووە کە لەو ناوەندەدا گوێیان لێگرتووە. لێرەوە وەک ئەندامێک بۆ ئەنجومەنی ناوەندی ئیبن خەلدون دەستنیشانکرا، ئەویش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ڕازیبوو.

جەمال بەنا، تەمەنە درێژەکەی دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساند، بەرهەمێکی زۆری هەبێت و کتێبێکی زۆر بڵاوبکاتەوە. لەوانە: الحیجاب، سێ بەربەست لەبەردەم نەمریدا، دیموکراتیەکی تازە، پێشنوێژی ئافرەت بۆ پیاوان، ئیسلام و عەقڵانییەت، ئازادی باوەڕ لە ئیسلامدا، دوای ئیخوان موسلمین، نەخێر پاشان نەخێر، ڕیبا، مەسەلەی ئازادی لە ئیسلامدا، ئایا دەکرێ شەریعەت جێبەجێ بکرێت؟ ئیسلام و ئازادی بیرکردنەوە، جیهاد، ڕۆحی ئیسلام، ئیسلام دین و ئومەتە نەک دین و دەوڵەت... هتد

**سەرچاوە:**
الشرق الاوسط، ١ شوبات، ٢٠١٣
ماڵپەڕی ویکیبیدیا، المصری الیوم، الشرق

# براگەورەکەمان

نووسینی: فاضل السلطانی

و. لەعەرەبییەوە: باوکی پایان

چی ئەبوو ئەگەر "جۆرج ئۆرێل"ی ڕۆماننوس ساڵی ١٩٥٠ بە نەخۆشی سیل کۆچی دوایی نەکردایە، ساڵێک دوای بڵاوبونەوەی بەناوبانگترین ڕۆمانی (١٩٨٤)، ئەم ڕۆمانە بە کارەکتەرە سەرەکییەکەی (برا گەورە) دەناسرێتەوە. ئەم برا گەورەیە کە لە میانەی دەزگا ترسناکە بینراو و نەبینراوەکانییەوە، هەناسەکانمان دەژمێرێت و چاودێری تێڕامانە ناوەکییەکانیشمان دەکات؟ چی دەبوو گەر خۆڵ و تەپوتۆزی گۆڕەکەی لەخۆی بتەکاندایە و بگەڕایەتەوە بۆ ئەم سەردەمەمان؟ ئایا سەبارەت بە سەرکوتکردنی مۆدێرن، بەشێکی دیکەی بۆ ڕۆمانە ترسناکەکەی زیاد دەکرد؟ ئایا ئەم جارەیان لە ڕۆژنامەی (گاردیان)ی بەریتانی سەبارەت بە برا گەورەی دەنووسی؟ ئەم رۆژنامەیە هەفتەی ڕابردوو، وەک زۆربەی دەزگاکانی دیکەی بەریتانیا، یادی تێپەڕبونی ٦٣ ساڵ بەسەر کۆچی "جۆرج ئۆرێل"ی کردەوە.

"ستیوار جیفریس" دەپرسێت ئاخۆ ئەگەر خاوەنی (برا گەورە) بڕۆشتایە بۆ سوریا و لەوێوە بە سەلامەتی بگەڕایەتەوە، ئەوا تەنها بە نووسین وازی دەهێنا، یان ڕاستەوخۆ بەشداری لە جەنگەکەدا دەکرد؟ وەک چۆن پێشتر لە چوارچێوەی دەستەیەکی نێونەتەوەیی کە دەیان نووسەری ناسراوی لە هەمو لایەکی جیهانەوە لەخۆگرتبوو، شان بەشانی جەنگاوەرانی ئیسپانیا و لە نێوان ساڵانی ١٩٣٦- ١٩٣٩، دژ بە جەنەڕاڵ فرانکۆ بەشداری جەنگەکەی کرد. تۆ بڵێی وەک چۆن ساڵی ١٩٣٧ کتێبێکی (لە پێناو کەتەلۆنیا) نووسی، کاتێ لە ماوەی چەند ڕۆژێکی زۆر کەمدا و لە ئەنجامی بۆردومانی فڕۆکەوە، زیاد لە پێنج هەزار کەس گیانیان لەدەستدا، ئاوا بە هەمان شێوە کتێبێک (لەپێناو حەڵەب) بنوسێت؟

ڕەنگە وابکات و کتێبێک بنوسێت، "جۆرج ئۆرێل" ئەوە دەکات. چونکە ئەو بەدرێژایی ژیانی جیاوازی لەنێوان نووسەر و مرۆڤەکەی ناخی نەکردووە. ئەو بەپێچەوانەی زۆربەی نووسەرەکانەوە، نووسەرە جیهانی و عەرەبییەکان، بەتایبەتی نووسەرە عەرەبەکان کە تەواو پێچەوانەی ئەو شتە ڕەفتار دەکەن کە بانگەشەی بۆ دەکەن و ئەو شتانە دەڵێن کە خۆیان نایکەن. گرنگی ئەم پیاوە، واتە "جۆرج ئۆرێل"،



جۆرج ئۆروێل

بەچاوپۆشین لەو گۆڕانکارییانەی کە دواتر بەسەریدا دێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی دوچاری نەخۆشی سیل دەبێت، لە تێکۆشانە ڕاستەقینەکەیدایە دژ بە ستەم و سەرکوتکردن، لە هەرکوێیەکدا بێت. هەروەها گرنگی ئەم پیاوە لەوەدایە کە ئیمانێکی تەواوی بەوە هەبوو کە مرۆڤ بەشێوەیەکی ڕەها مافی هەبوونی حەقیقەتی هەیە. لێرەدا حەقیقەت ڕێژەیی نییە، بەڵکو حەقیقەت زۆر بە سادە و ساکاری، بریتییە لە (مافی ڕەهای هەڵبژاردن- الحق المطلق فی الاختیار) بەبێ ترس و تۆقاندن.

"جۆرج ئۆروێل" وەک پاڵەوانەکەی "وینستۆن سمیپ" لە ڕۆمانی ١٩٨٤ کە هەوڵێکی نائومێدانەی زۆر دەخاتەگەڕ تاکو حەقیقەت، لە شێواندنی دوژمنەکانی یان لەوەی بە هەوا و هەوەسی خۆیان خوێندنەوەی بۆ بکەن، ڕزگار بکات. بەڵام ستمگەرەکان ناتوانن لەگەڵ حەقیقەتدا هەڵبکەن، کوشتنی حەقیقەت یان چەواشەکردنی، دوو مەرجی بوون و مانەوەی ستمگەرەکانە، ئەم حاڵەتە لە ڕۆمانە نایابەکەی دیکەشیدا دەبینین، ڕۆمانی مەزرای ئاژەڵان. "جۆرج ئۆروێل" هەرگیز لەوە نائومێد نەبووە کە حەقیقەت لە توانایدا هەیە چۆک بە دیکتاتۆریەت دابدات. ڕۆمانەکەی، ١٩٨٤، لە بنچینەدا ناوی (دواهەمین پیاو لە ئەوروپا)دا بووە. ئەمەش وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی جەنگ دژ بە دیکتاتۆریەت، شکستناخوات و سەردەکەوێت، مادام تاقە کەسێک هەیە دژ بەم دیکتاتۆریەتە دەجەنگێت. "جۆرج ئۆروێل" کاتێ لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردوا ئەم ڕۆمانەی نووسی، هێشتا دیکتاتۆریەت وەک ئەوەی لە پەنجاکانی ئەو سەدەیەدا بینیمان، نەببوو بە مەنزومەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتوری کامڵ، هەرچەندە لە هەردوو زەمەنی فاشییەت و نازییەتدا، سەرکوتکردنێکی ناوخۆی ترسناک لەئارادابوو.

هەروەها جیهان لە چاوەڕوانی کۆنگرەی بیستەمی حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەتی پێشودا بوو کە لە ساڵی ١٩٥٦ ئەو کۆنگرەیەی بەست و قەسابخانە و کوشتوبڕەکانی ستالینی بۆ دەرکەوت. مەزنی "جۆرج ئۆروێل" ئالێرەدایە، ئەوەی ئەو بینی، کەسی دیکە جگە لەو نەیبینی، "جۆرج ئۆروێل" وەک هەموو داهێنەرە گەورە و مەزنەکان، بەو هەستە قووڵەی کە وەک ڕۆماننوسێک هەیبوو، هەروەها بەو خوێندنەوە وردانەی بۆ جووڵەی واقیع و کۆمەڵگا ئەوروپییەکانی ئەو سەردەمە هەیبوو، دەرکی بە هەموو ئەوەکرد کە دواتر ڕوودەدەن.

وەلێ "جۆرج ئۆروێل" کەمەکێک خۆشبین بوو، بەوەی پێشبینی کرد سەردەمی ترسناکی برا گەورە، لە ساڵی ١٩٨٤وە دەستپێدەکات. ئەو پێویست بوو لەسەری هەندێک بۆ دواوە بگەڕایەتەوە، بە شێوەیەکی تایبەت بگەڕایەتەوە بۆ شەستەکانی ئەو سەدەیە، چونکە لەو کاتەدا برا گەورە، وەک حەقیقەتێک لە حەقیقەتە گەورەکانی ژیان، لە زیاد لە شوێنێکدا دەرکەوت و تەمەنێکی درێژیشی هەیە و تا ئێستاش لێرە و لەوێ لە ژیاندایە. ڕۆمانی برا گەورە، بەداخەوە تاکو ئەم چرکەساتەی ئێستاش کۆتایی نەهاتووە، لانی کەم لە وڵاتانی عەرەبیدا. لەوانەیە ئێمە لە دواهەمین بەشیدا بین، وەلێ ستەمگەرەکان بە درێژایی مێژوو، پەند و عیبرەت لەیەکتروە فێرنابن.

**سەرچاوە**: الشرق الاوسط، ٢٥ شوباتی ١٠١٣.

# چیرۆکە سەیروسەمەرەکان لە مێژووی جیهاندا

و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ

دیدییە شیرات، مامۆستای جوگرافیا و مێژوو لە باکوری فەرەنسا، لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو چەندین چیرۆکی سەیروسەمەرە کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕویانداوە، بۆ خوێندکارەکانی بگێڕێتەوە، تاکو سەرنج و بایەخی خوێندکارەکانی بۆ ئەو وانەیە ڕاکێشێت کە دەیڵێتەوە. لەمەشدا سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێنا و بە پشتبەستن بەو سەرکەوتنە، بڕیاریدا ئەم ئەزمونەی بۆ ڕای گشتی بگوێزێتەوە، تاکو وەک دەوترێ (سودی بۆ هەموان هەبێت). بەم جۆرە یەکەم کتێبی خۆی بەم ناونیشانە بڵاوکردەوە: (چیرۆکە سەیروسەرەمەرەکان لە مێژوی جیهاندا).

هەموان ئەوە دەزانین مێژوی مرۆڤایەتی پڕە لە جەنگ و ململانێ کە تا ئاستێکی زۆر ڕێڕەوی مێژوو-یان دەستنیشان کـردووە. بەڵام هەندێ شت و ڕوداوی سەیروسەمەرەی دیکە هەیە، پەیوەندییان بە جەنگ و ململانێکانەوە نییە و پەیوەندییان بە (مەزنی مێژوو) وەوە نییە، گەرچی بـەردەوام لە خەیاڵدانی مرۆڤدا ئامادەییان هەیە. لێرەوە دەکرێ مرۆڤ لە میانەی گێڕانەوەی ئەو ڕوداوانەوە، (لە مێژووەوە فێربین) و لە هەمانکاتیشدا کاتێکی (خۆش) بەسەربەرن.

لە ڕاستیدا تێڕوانینی ئەو کەسانە ڕاستنییە کە پێیانوایە ئەوان مێژوو دەنووسنەوە و هەمیشە جێگا پەنجەی خۆیانی لەسەر بەجێدەهێڵن، هەربۆیە مرۆڤایەتی تەنها مەزنی ئەوان بە نەمری دەهێڵێتەوە. لە واقیعدا هیچ گومانێک لەوەدانییە ئەوانە لە لیستی مرۆڤایەتیدا کە پڕە لەو مرۆڤە مەزنانەی تاکو ئێستا لەبیرنەکراون و باس لە کارە نایابەکانیان دەکرێت، پێگەیەکی گەورەیان هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بەسەرهات و چیرۆکی سەیر هەیە کە لە خەیاڵدانی خەڵکیدا ماونەتەوە.

دانەری ئەم کتێبە، لە ڕەوتی قسەکردنیدا باس لەو قسەیەی "سیوران"ی فەیلەسوف دەکات کە وتویەتی: (پرنسیپەکان دەڕۆن، بەڵام بەسەرهات و چیرۆکە سەیروسەمەرەکان دەمێننەوە). دانەری کتێبەکەی بەو چیرۆکە مێژوییە سەیرە دەستپێدەکات کە (پاشای فارس دەریا دەداتە بەر قامچی). مەبەست لەو پاشایە "کیرکزیسی یەکەم"ە، ئەم پاشایە تەنها حەز و ویستی ئەوەبوو شارە لوتبەرزەکانی یۆنان لەناوببات کە لەو سەردەمەدا کەوتبوونە دەرەوەی حوکمڕانییەکەی و لە دەریای سپی ناوەڕاستەوە تاکو هند درێژببوونەوە. (سروشت شکستی) بە پلانی پاشای فارس هێنا،

چونکە ڕەشەبایەک هەڵیکرد و ئـەوەی فارسەکان ئامادەیان کـردبـوو، تێکیشکاند. بـەڵام فارسەکان کۆڵیاننەدا و سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی تۆکمەتر خۆیان ڕێکخستەوە. کەچی دەریا کە گوێ بە حەز و ویستی مرۆڤەکان نادات، جارێکی دیکە هەڵچووەوە و دەستیکرد بە هەڵکشان و داکشان و سەرلەنوێ ئـەو پـردەی لەسەری دروستکرابووەوە، تێکیشکاندەوە. پاشای فارس لەو کاتەدا هیچی لەدەستنەدەهات ئەوەنەبێت فەرمانیدا وەک سزایەک (سێ سەد قامچی لە دەریا بدەن). لەگەڵ پرۆسەی سزادانەکەدا چەندین قسە و پەرەگرافی توڕە دەوتران، وەک ئەوەی دانەری کتێبەکە لەسەر زمانی هێرودیۆت دەگوازێتەوە: (ئەی ئەو ئاوەی تامێکی تاڵت لێدێت، سەروەرەکەت بەم شێوەیە سزاتدەدا، چونکە تۆ بێ هیچ هۆیەک، بویتەتە بەربەست لەبەردەم ئیرادەی ئەودا. ئەی ئاوە تاڵەکە، تۆ هەرچییەک بکەیت و بەنیازی هەرچییەک بیت، ئەو هەر لێت دەپەڕێتەوە).

لە دەرئەنجامی کۆتاییدا، هەرچەند فارسەکان توانیان ئەو زمانە ئاوییە ببڕن و لێیەوە بگەنە خاکی یۆنان، وەلێ دواجار یۆنانییەکان سەرکەوتن، چونکە (دەریا حەزناکات قامچی لێبدرێت)، وەک ئـەوەی دانـەری کتێبەکە دەیڵێت.

لە بەشێکی دیکەی کتێبەکە و لەژێر ئەم ناونیشانەدا: (سواڵکەرێک ئەسکەندەری گەورە دەردەکات)، دانەری کتێبەکە دەنوسێت: (هەندێجار هەستدەکەن ئێوە پێچەوانەی بەها و نەریتە قبوڵکراوەکانی کۆمەڵگا ڕەفتار دەکەن). لێرەوە دانەر دێتە سەر قسەکردن دەربارەی "دیوجین"ی فەیلەسوف. ئەم فەیلەسوفە لە سەدەی چوارەمی پێش زایندا، شتێکی ئاوای وتووە: پێویستە لە ڕێگەی ئەو سیفەتانەی کە مرۆڤێک هەڵگریەتی، حوکم بەسەر ئەو مرۆڤەدا بدرێت، نەک لەڕێگەی ئەو سەروەت و سامانەی کە هەیەتی. ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەی کە دەڵێ سەروەت و سامانی (دەرەکی) شتێکی وەهمییە و دەکرێ قەدەر بەیەک لێدانی تەفروتونای بکات و نەیهێڵێت. بەڵام گرنگ (سەروەت و سامانی ناوەوە) و (زیرەکی)یە، بەو پێودانگەی ئەو دووانە لە قوڵایی ناخدا جێگیربوون و هیچ کەسێک ناتوانێ لە ڕەگ و ڕیشەوە دەریانبێنێت.

لێرەیە "دیوجین"ی فەیلەسوف گرنگی و بایەخی بە شتە ڕواڵەتییەکان نەدەدا و لە ئەسینای دەوڵەمەندا وەک (سواڵکەرێک) دەژیـا و خۆراکی بریتیبوو لە تۆزقاڵێک نان و کەمەکێک شۆربای نیسک. ڕۆژێکیان ئەم فەیلەسوفە کۆمەڵێ قەشە دەبینێ دزێکیان گرتووە کە هەندێ شتی زۆر سادە و ساکاری دزیبوو. بۆیە هاواردەکات و دەڵێ: (تەماشای ئەو دزە گەورانە بکەن کە دزێکی بچوکیان گرتووە و لێیدەدەن). ڕۆژێکی دیکە داوای بینینی مرۆڤێک دەکات و بە دەنگی بەرز هاوار دەکات و دەڵێ: (دەمەوێ مرۆڤێک ببینم نەک پاشماوەی مرۆڤ).

دانـــەری کتێبەکە لـەم سیـاقـەدا جـەخـت لەم ڕوداوەی خـوارەوە دەکـات: دیوجین لە هیچ کەسێک نەدەترسا، کاتێ ئەسکەندەری گەورە، کە سەرکردەی ئیمپراتۆریەتێکی پان و بـەرفـراوان بـوو، نـاوی ئەم فەیلەسوفە دەبیسێت، دەیەوێ ببینێت. دەڕوات بۆ لای و لە کوخەکەی خۆیدا دەیدۆزێتەوە و دەبینێ "دیوجین"ی فەیلەسوف لەبەرخۆرەتاوەکەدا خەریکی خۆشۆردنە. کاتێ ئەسکەندەر گوێی لە قسەکانی دەگرێت، زۆر بەو ئازایەتی و حیکمەتەی لە قسەکانیدا دەریدەبڕێت، پێی سەرسامدەبێت. بۆیە پێی دەڵێ: ئەو شتە چییە کە هەندێ خۆشی و کامەرانی پێدەبەخشێت. دیۆجین بە خوێنساردییەوە وەڵامی دەداتـەوە و دەڵێ: (تۆزێک برۆیتە ئەولاترە، چونکە بەری تیشکی خۆرەکەت لێ گرتووم).

ناوی کتێب: چیرۆکە سەیروسەمەرەکان لە مێژوی جیهاندا

نووسینی: دیدییە شیرات

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای لیبریری فۆییبێر–پاریس– ٢٠١٢

ژمارەی لاپەڕە: ١٦٠ لاپەڕەی بچوک

سەرچاوە:

البیان، مسارات، ٢٠١٢/٩/٣٠

# ئـــەوان کتێب دەسوتێنن

و. لە عەرەبییەوە: فرمێسک

لە ساڵی ١٢٥٨ زاینی، مەغۆلەکان بەغدادیان داگیرکرد و ٣٦ کتێبخانەیان ڕوخاند، لەوانە کتێبخانەی (بیت الحکمە) کە پڕ بوو لە کتێبی گرانبەهای فیکری مرۆڤایەتی، لە کتێبی ئەدەبییەوە بۆ کتێبی فقهی و فەلسەفی و کتێبی تەرجەمەکراو و دەستنوس و توێژینەوەی زانستی و گفتوگۆ، هەروەها ڕوانگەیەکی ئەستێرەناسیشی تێدابوو کە ئەویشان وردوخاشکرد.

بەڵام ئەو داگیرکەرانە، واتە مەغۆلەکەکان، لە شارستانییەت دابڕابوون، دوژمنێکی سەرسەختی فیکر بوون، بە دەستی ئەنقەست هەزاران کتێب و دەفتەر و دەستنوسی دەگمەن و ناوازەیان کۆکردەوە و فڕێیاندانە ڕووباری دیجلەوە و ئاوی ڕووبارەکە بە ڕەنگی مورەکەب، ڕەنگڕێژکرا و ڕەنگی ئاوەکە گۆڕا بۆ ڕەنگێکی ڕەش. مەغۆل ئەو کارەیان ئەنجامدا بێ ئەوەی کەسێک هەبێت بتوانێ لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات. وەلێ کاریگەری کوشندەی ئەو کارەیان، تا ڕۆژی ئەمڕۆ لەسەر سنگی عەرەب نیشتووە. چونکە ئەو کەلتورە مەزنەی، بەدرێژایی سەدەکان بونیاتیان نابوو، بووە خۆراکی ئاوی دیجلە، ئەمەش کەلێنێکی مەعریفی گەورەی لێکەوتەوە کە تائێستاش پڕنەکراوەتەوە.

بەڵام مەغۆلەکان، لەو سەردەمەدا، بانگەشەی ئەوەیان نەدەکرد کە هەڵگری شارستانیەتن.

خۆشبەختانە دروشمەکانی ڕۆشنگەری و دادپەروەری و دیموکراسی و ڕزگارکردنی میللەتان لە ستمگەری-یان بەرزنەکردبووەوە. یان بەخۆیان نەدەگوت نوێنەرانی ئازادی بۆ میللەتە چەوساوە و ژێردەستەکان. کارەکەی ئەوان کارێکی هەمەجی وەحشیگەرانەی بێ پاساو بوو، وەک پەڵەیەکی ڕەش بە تەوێڵیانەوە دەمێنێتەوە، گەرچی ئەو کارەی ئەوان، تەنها کارێک نەبووە. بەڵکو بە درێژایی سەدەکان، کۆمەڵێ تاریکبین هەبوون، چی توانا و لێهاتویی خۆیان هەیە، ئاراستەی کوژاندنەوەی ڕوناکی، کوشتنی حەقیقەت، کۆتوبەندکردنی عەقڵ -یان کردووە.

هەروەها مەغۆلەکان بانگەشەی ئەوەیان نەدەکرد گوایە ئەوان نوێنەرانی ڕێگای ڕاستن، سەربازی حەقن، موجاهیدەکانی سەرخستنی ڕێگای خودان، وەک ئەوەی هاوشێوەکانیان لە کۆماری مالی خۆرئاوای ئەفریقا، بانگەشەی بۆ دەکەن. چەکدارە ئیسلامییەکانی مالی، دواجار لە شاری (تمبکتۆ) لە باکوری مالی، ئاگریان بەردایە یەکێک لە گەورەترین و بەهادارترین گەنجینە فیکرییەکان. تا بیسەلمێنن جەنگی ئەوان لە بنەڕەتدا جەنگێکە دژ بە فیکر و ڕۆشنگەری و کتێب. لە گەرمەی ئەو جەنگەی لە کۆماری مالیدا بەرپابووە کە فەرەنسا بە پاڵپشتی ئەوروپا و لەژێر سایەی چەترێکی نێودەوڵەتیدا سەرکردایەتی دەکات، تاکو ڕێگە لەوە بگرن ئەم کۆمارە بکەوێتە ژێر چنگی ئیسلامییە توندڕەوەکانی نزیک لە قاعیدە. چەکدارە ئیسلامییەکان لە شاری تمبکتۆ (پەیمانگای ئەحمەد بابا بۆ بەدۆکیمێنتکردن و توێژینەوە)یان سوتاند کە یەکێکە لە گرنگترین دەزگا ڕۆشنبیرییەکانی مالی و چەندین دۆکیمێنتی کۆنی تێدایە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزەهەمی زاینی. جگە لەوە هەزاران دەستنوسی کۆنی تێدابووە.

ئەوەی لێرەدا جێگای ئاماژە پێدانە، ئەوەیە ئەو پەیمانگایەی چەکدارە ئیسلامییەکان گڕیان تێبەردا و سوتاندیان، دەوڵەتی باشوری ئەفریقا دروستیکردبوو، دەوڵەتێک لە کارەساتی ڕەگەزپەرستی ڕزگاری ببوو. بێگومان باشوری ئەفریقا دەوڵەتێکی فرە کەلتوورە، بۆیە ئەو پەیمانگایە وەک نمونەیەک بۆ پاڵپشت و کۆمەککردنی مەعریفە و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنگەری دروستکرا. هێرش و پەلاماردانی کتێبخانەکانی مالی و پێشتریش تێکشکاندنی گومەز و گۆڕی پیاوچاکان و شوێنەوارە مێژوییەکان، ئەوە ئاشکرا دەکەن کە ئەم فیکرە پەلاماردەرە لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێت و ناتوانێت خۆی لەگەڵ گەشە و پێشکەوتنەکانی ئایندەدا بسازێنێت و بەدەمیانەوە بچێت، لەبەرئەوە لە حاڵەتێ ڕووبەڕووبوونەوە و پێکداداندایە لەگەڵ جیهان.

سوتاندنی کتێبخانەکان، قەدەغەکردنی کتێب، قەدەغەکردنی تۆڕەکانی ئینتەرنێت، بڕینی پەیوەندییەکان، ڕێگری لە گەیاندنی زانیارییەکان، چاودێریکردنی فیکر و بیروڕاکان، هەوڵدان بۆ قەدەغەکردنی هونەرەکان، بەرتەسکردنەوەی دەرفەتی خوێندن لەبەردەم کچاندا، هەر هەمووی کۆمەڵێ کاڵای فیکرێکن ناتوانێ لەسەر زەوی شارستانیەتی ئێستادا، بە خۆڕاگری ڕاوەستێت و خۆشی ناتوانێت شارستانیەتێکی دیکە بونیادبنێت، ئەو فیکرە بەشێکە لە میراتی ڕابردوو نەک بەشێک بێت لە هیوا و ئاواتی دوارۆژ. پێغەمبەری مەزنمان فرمانی پێکردوین کە داوای زانست بکەین ئەگەر لە چین-یش بێت. کەچی ئەو چەکدارە ئیسلامییانە هاتن تاکو زانست بسڕنەوە و کتێبە دەگمەن و ناوازەکان بسوتێنن، لە وڵاتێکیشدا ئەو کارە دەکەن تا بڵێی پێویستی بە تروسکایی مەعریفە و ڕوناکی زانست هەیە، تاکو بتوانێت لەو هەژاری و پێویستییانەی کە بە دەستییەوە دەناڵێنێت، هەستێتەوە.

**سەرچاوە**: میرزا الخویلدی، الشرق الاوسط، ٢٠١٣/٢/٣

# بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی ڕەهەند

لە ماوەی دوو مانگی ڕابـردودا، دەزگـای سـەردەم وەك پیشەی هەمیشەیی، جگە لە گۆڤارە مانگانە و وەرزییەكانی، چەندین كتێبی قەبارە گـەورە و مامناوەندی و بچوكی چاپ و بڵاوكردووەتەوە و سوچێكی كتێبخانەی كوردی پێ دەوڵەمەند كردووە. كتێبەكانی ئەو دوو مانگە جۆراوجۆر و جیاوازن، لە ڕۆمان و چیرۆكی منداڵانەوە، بۆ بزوتنەوە كۆمەڵایەتیەكان و نوسین لەسەر بواری پەروەردە، لە كتێبی گفتوگۆ و چاوپێكەوتنەوە بۆ كتێب لەسەر كارەساتەكانی ڕوداوی ئۆتۆمۆبێل، لە پۆگاوە بۆ مێژووی ئەندێشە و قوتابخانە سیاسییەكان و لەوێشەوە بۆ مێژووی سەرهەڵدانی كتێبخانەكان و ناسینیان.

بە مانایەكیتر كتێبەكانی ئەم دوو مانگەی دەزگای سەردەم، گەلێك بواری جۆراوجۆری گرتووەتەوە، بێگومان ئەم فرە جۆرییەی چاپكردنی كتێب، یەكێكە لە هەنگاوە باش و سەركەوتووەكانی ئەم دەزگایە كە لە مێژووی چواردە ساڵەی تەمەنیدا گرتویەتییەبەر. واتە دەزگـای سەردەم هەوڵیداوە لە زۆربەی زۆری كایە ڕۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری و فەلسەفییەكاندا، كتێب بڵاوبكاتەوە و كەلێنێك پڕكاتەوە. ئێمە هەوڵدەدەین بە كورتی هەندێ لەو كتێبانە بخەینەڕوو تاكو بەخوێنەریان بناسێنین.

# بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان




ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە دەگمەن و کەمانەی کە بە زمانێکی زانستی و بەشێوەیەکی ئەکادیمی، باس لە سەرهەڵدان و چۆنیەتەی کارکردنی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دەکات. لای هەموان ئاشکرایە لەمرۆکەی جیهاندا، ڕۆڵی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، بۆ گۆڕینی دەسەڵاتی سیاسی یان بۆ ئەنجامدانی ڕیفۆرمی سیاسی، ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوە و ناکرێت پشتگوێبخرێت.

لە ئێستای جیهاندا، ئەو هێزە مەدەنی و ئاشتیخوازانەی کە توانایەکی گەورەی فشاریان هەیە بۆ سەر دەسەڵاتداران، بریتین لە بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان. بەتایبەت ئەو بزوتنەوانەی کە هەڵگری پەیامێکی ئاشتیانەی دوور لە توندوتیژین. لەمرۆدا مەسەلەی گۆڕانکارییەکان و چاکسازی لە تەواوی کایەکانی حوکمڕانیدا، هێندەی بە بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە مەدەنییەکان دەکرێت، هێندە بە چەک و بەرپاکردنی جەنگ ناکرێت. هێندەی لە ڕێگەی خۆپیشاندانی ئاشتیانە و مانگرتنی سەرتاسەری و پەکخستنی کاروباری دەزگا حکومییەکانەوە دەکرێت، هێندە لەڕێگەی تەقە و پەلاماردانی بنکە و بارەگا سەربازی و ئەمنییەکانەوە ناکرێت.

لێرەوە ئەم کتێبە ئەو ڕاستیانەی سەرەوە دووبارە دەکاتەوە و پێمان دەڵێ، بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان چەند کار لەسەر پەیامی ئاشتیانەی خۆیان بکەن، چەند بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان ڕێوشوێنی یاسایی و مەدەنییانە بگرنەبەر و چەند دووربن لە توندوتیژی و سوتاندن و نانەوەی پەشێوی، ئەوەندە لە ڕۆحی سەردەمەکەوە نزیکدەبن و پشتگیری ناوخۆیی و دەرەکیشیان زۆرتر دەبێت. بەمانایەکیتر ئەگەر هەموو ئەو داواکارییانەی کە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەرگری لێدەکات و دەیەوێت بەدەستیان بێنێت، چەند ڕەوا و چەند حەقانیش بێت، چەند داوایەکی سروشتی و چەند مافێکی ڕەوا بێت، ئەوا پێویست دەکات لەڕێگە یاسایی و مەدەنییەکانەوە داوایان بکات و هەر لەو ڕێگایانەشەوە هەوڵبدات بیانهێنێتەدی. چونکە هەرگیز داواکاری ڕەوا، مافە سروشتییەکان، پاساوی بەکارهێنانی توندوتیژی و نانەوەی پەشێوی نادەنبەدەستەوە. واتە ڕاستە زۆرجار داواکارییەکان داواکاری بەجێن، بەڵام شێوازی داواکردنیان و چۆنیەتی مامەڵەکردن بۆ گەیشتن بەو داواکاریانە، شێواز و مامەڵەکردنێکی مەدەنیانە نییە و دوورە لە ڕۆح و پەیامی ئاشتیانە.

لێرەوە ئەم کتێبە وەک وەرگێڕی کتێبەکە لە وتەیەکی کورتدا دەڵێ: پێویستییەکانی مرۆڤ بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی خولقاندوە تا لە ڕێگەی ئەو بزوتنەوانەوە پێداگری لەسەر داواکارییەکانیان بکەن و سازش لەسەر مافەکانی خۆیان نەکەن،

لە بەرامبەریشدا ئەو بزوتنەوانە کەس و کۆمەڵ و گروپەکان والێدەکەن لە کاتی گردبونەوە و خۆپیشاندان و مانگرتن و ڕێپێوان و پێشکەشکردنی سکاڵانامە و هیدی، واز لە عەقڵیەتی جەماوەریی و حەشامات بهێنن و بەرەو شێوازێکی مەدەنیانە هەنگاوبنێن و پەنا بۆ وێرانکردن و تاڵانکردن و سوتاندن و کوشتن و شتی دی نەبن و وڵات و سەرچاوەکانی نیشتیمان بە هی خۆیان بزانن.

بێگومان ئەم کتێبە بۆ ئەمڕۆی کوردستان، تابڵێی گرنگە و پێویستە هەموو ئەو کەسانەی کە بە جۆرێک لە جۆرەکان، لە یەکێک لە بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکاندا کاردەکەن، یان ئەوانەی کە دەیانەوێ لە کۆمەڵگای مەدەنی و چۆنیەتی کارکردنی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی تێبگەن، ئەم کتێبە بخوێننەوە. چونکە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ ئاشنابوون بە مێژووی دروستبوونی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتییەوە لە کۆنەوە تا ئێستا. بە دیاریکراوی لە سەدەی هەژدەهەمەوە تاکو کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیست و یەک.

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز کاک ئازاد بەرزنجییەوە پێشەکییەکی کورتی بۆ نوسراوە و تێیدا باس لە ناوەرۆکی کتێبەکە دەکات. لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بڵێین ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز کاک (حەمەڕەشید)ەوە بەسەرکەوتویی و بە کوردییەکی جوان کاری وەرگێڕانی بۆ کراوە. ئەوەشی وایکردووە وەرگێڕ لەم کارەیدا سەرکەوتبێت، جگە لە حەزی خۆی بۆ وەرگێڕانی کتێبەکە، تەرجەمە کوردییەکەی لەلایەن دوو بەڕێزی دیکەوە کاری بەراوردکردنی لەگەڵ هەردوو دەقە ئینگلیزی و عەرەبییەکەیدا بۆ کراوە. ئەو دوو بەڕێزە بریتین لە کاک سیامەند شاسواری کە دەقە کوردییەکە بە ئینگلیزییەکە بەراوردکردووە لەگەڵ کاک شوان ئەحمەد کە دەقە کوردییەکەی لەگەڵ دەقە عەرەبییەکەدا بەراورد کردووە. ئەم دوو هەوڵە بوونەتە هۆی ئەوەی دواجار کتێبەکە بە زمانێکی کوردی جوان و بێ کێشە بکەوێتە بەردەستی خوێنەر.

کتێبی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، کتێبێکە ژمارەی لاپەڕەکانی ٤٢٤ لاپەڕەی قەبارە گەورەیە، تیراژی حەوت سەد دانەیە و نرخی ٦٥٠٠ دینارە.

## نهێنیی کریسمس




نهێنیی کریسمس ناوی یەکێکە لە ڕۆمانەکانی ڕۆماننوس یۆستاین گاردەر، لای هەموان ئاشکرایە ئەم ڕۆماننوسە، تاڕادەیەکی باش و لەڕێگەی وەرگێڕانی ڕۆمانەکانییەوە بۆ زمانی کوردی، لای خوێنەری کورد ناسراوە. پێشتر چەند ڕۆمانێکی گرنگ و بایەخداری کراوە بە کوردی، لەوانە جیهانی

سۆفیا كە تا ئێستا لەلایەن چەند وەرگێڕێكەوە كراوە بە كوردی و چەندینجار چاپكراوەتەوە و یەكێكە لە شاكارەكانی ئەم نووسەرە. كچەی پرتەقاڵ ناونیشانی ڕۆمانێكی دیكەی ئەم نووسەرەیە كە لەكاتی دەرچوونییەوە تا ئێستا، پێشوازییەكی باشی لێكراوە. ئەم ڕۆمانەی، واتە نهێنیی كریسمس، وەك ڕۆمانەكانی دیكەی، كارەكتەری سەرەكی تێیدا دوو منداڵی بچوكن، یەكێكیان یۆكیم و ئەوی دیكەیان ئێلیسابێت -ە. ئەم دوو منداڵە لە دوو زەمەنی جیاوازدا و لە میانەی ڕۆژمێرێكی ئەفسوناوییەوە، بەسەرهاتی ئەم ڕۆمانە دەگێڕنەوە. منداڵی یەكەمیان یۆكین كە كوڕە و لەدەرەوەی ڕۆژمێرەكە و لە زەمەنی ئێستادایە، منداڵی دووەمیان ئێلیسابێت كە كچە و كاراكتەری سەرەكی ناو ڕۆژمێرە ئەفسوناوییەكەیە و لە زەمەنی ڕابردودایە.

بەواتایەكی دیكە، خوێنەری ئەم ڕۆمانە لەیەككاتدا، دوو زەمەنی تەواو جیاواز بەیەك دەژی. زەمەنێكیان لەمڕۆوە و لەكاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەكەوە دەستپێدەكات و بیست و چوار ڕۆژ دەخایەنێت. ئەم زەمەنەیان لەدەرەوەی لاپەڕەكانی ڕۆژمێرەكە ڕوودەدات، زەمەنێكە بەیانی و دوو بەیانی و هەفتەیەك و دواجار ٢٤ ڕۆژ دەخایەنێت. واتە زەمەنێكە ڕووی لە ئایندەیە. هەرچی زەمەنی ناو ڕۆژمێرەكەیە، ئەوا زەمەنێكە بۆ دواوە، بۆ ڕابردوو، بەڵام ڕابردوویەكی زۆر دوور، ڕابردویەك تەمەنی سەدان ساڵ زیاترە. هەندێ لاپەڕەی ناو ڕۆژمێرەكە، باس نەك لە سەدەیەك و دوان و سیان دەكات، بەڵكو باس لە سەد یان سێ سەد یان چوارسەد ساڵ دەكات. لە زەمەنی ناو ڕۆژمێرەكەدا، زۆر بەخێرایی سەدەكان دەبڕین و لە میانەی ئەو ٢٤ لاپەڕەیەدا، وەك وتم زیاد لە هەزار و پێنج سەد ساڵ دەبڕین و دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سەرەتاكان.

هێڵی سەرەكی ئەم ڕۆمانە بریتییە لە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، گەشتێكە لە ئێستاوە دەستپێدەكات و بەرەو زەمەنێكی زۆر كۆن دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەم گەشتە یان ئەم گەڕانەوەیە، لە میانەی ڕۆژمێرێكەوەیە كە لە بیست و چوار لاپەڕە پێكهاتووە. هەڵدانەوەی لاپەڕەكان لە هەڵدانەوەی هیچ ڕۆژمێرێكی دیكە ناچێت و هەڵدانەوەیەكی ئاسایی نییە، ئەمە جگە لەوەی ڕۆژمێرەكە وەك ڕۆژمێری دیكە لە دوانزە لاپەڕە پێكنەهاتووە، واتە ڕۆژمێرێك نییە بۆ ساڵێك یان بۆ دوانزە مانگ و بەس. بەڵكو وەك وتم لە بیست و چوار لاپەڕە پێكهاتووە كە تێیدا مێژوی زیاد لە هەزار و پێنج سەد ساڵی مرۆڤایەتی لەخۆگرتووە. هەر لاپەڕەیەكیش دەرگایەكی تایبەت بە خۆی هەیە، لەگەڵ كردنەوەی هەر دەرگایەكدا لاپەڕەیەكی ڕۆژمێرەكە دەردەكەوێت و پارچە كاغەزێك بە لوولیی دەكەوێتە خوارەوە، ئەم پارچە كاغەزە باس لە ناوەڕۆكی ئەو لاپەڕەیە و ئەو وێنانە دەكات كە لەو لاپەڕەیەدا هەیە.

خوێنەر لە میانەی خوێندنەوەی ئەو لاپەڕانەوە، دەچێتە ناو جیهانی ئەفسوناوی ڕۆژمێرەكە و تێدەگات ئەم گەشتە بەرەو ڕۆژگارە دێرینەكان، گەشتێكە بۆ ئاشنابوون بە یەكەم ڕۆژی لەدایكبوونی حەزرەتی مەسیح. واتە گەشتەكە لە ئەورووپای ئەمڕۆوە دەستپێدەكات و بەناو دەیان شاری كۆنی ئەورووپای ئەو ڕۆژگارەدا دەڕوات و لەوێشەوە دەپەڕێتەوە بۆ سەر كەنارەكانی دەریای سپی ناوەڕاست و پاشان دێتە سوریا و دواتر دەگاتە سەر ئەو ڕۆژەی كە بۆ یەكەمجار مەسیح لە بەیت لەحم و لە تەویلەیەكدا لەدایكدەبێت. خوێنەر لە میانەی ئەم گەشتەدا گەلێك ڕوداو بەسەرهاتی مێژووی دەخوێنێتەوە و هەست دەكات بەناو ئەو سەردەمە دێرینانەی مرۆڤایەتیدا، وردە وردە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەرەتاكان. بۆ ئەو كاتەی مەسیح بۆ یەكەمجار چاوی بە دونیا هەڵدەهێنێت.

گەشتی ناو ڕۆژمێرەکە لە سۆپەرمارکێتێکەوە دەستپێدەکات، کاتێ ئێلیسابێت لەو سۆپەرمارکێتە لە دایکی جیادەبێتەوە و لە کۆمەڵێ بوکە شوشە دەڕوانێت کە لەسەر شێوەی ئاژەڵی جۆراوجۆرن، لەناکاو لەناو ئەو بوکەشوشانەوە بەرخێکی گچکە دەردەپەڕێ و بازێک دەداتە سەر زەوییە و زەنگێکی لەملدایە. ئێلیسابێت بەم ڕوداوە دووچاری سەرسوڕمان دەبێت و دەستدەکات بە ڕاونانی بەرخەکە و لەبەرخۆیەوە دەڵێ: بەرخی بچووک، بەرخی بچووک. ئیدی هەر لەم ڕاکردنە ئاساییەوە ئەو گەشتە مەزنەی ناو مێژوو دەستپێدەکات. هەرچەندە دایکی بە دەنگی بەرز بانگی ئێلیسابێت دەکات تا بگەڕێتەوە، بەڵام شەیدابونی ئێلیسابێت بە بەرخەکە و سەرسوڕمانی لەوەی چۆن و بۆچی ئەم بەرخە زیندووە لەم کات و ساتەدا لەناو ئەو بوکەشوشانەوە بازیداوەتە خوارەوە، زۆر لەوە سەرنجڕاکێشتر و بەهێزترن کە ئاوڕ لە دایکی بداتەوە و بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی. ناچار وەک ئەوەی هێزێک لە غەیبەوە پاڵ بەم کچە بچوکەوە بنێت تاکو بکەوێتە دوای ئەو بەرخە کە خۆی کردبوو بە نهۆمی ژێرەوەدا، ئێلیسابێت بەردەوام دەبێت کە کەوتنەشوێنی بەرخەکە و لەوێوە هەم خۆی و هەم خوێنەر تێکەڵ بەو جیهانە سەیر و پڕ ئەفسوناوییە دەبێت، جیهانێک لە ئێستاوە دەمانباتەوە بۆ ناو مێژوو. بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی شارستانیەت و دروستبوونی شارەکان. لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێم ئەم گەشتە تەنها ئێلیسابێت و ئەو بەرخە ئەنجامینادەن، بەڵکو لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکانی ڕۆژمێرەکە و خوێندنەوەی پارچە کاغەکە لووکراوەکاندا هەندێ کەس و فریشتە و شوان و مەڕی دیکە دێنە ناو گەشتەکەوە و هەریەکەشیان سەرگوزشتەیەکی تایبەت بەخۆیان هەیە و لە میانەی ڕۆمانەکەدا دەیگێڕنەوە. لە کۆتایدا ئەوانەی دەگەنە بەیت لەحم و بینینی لەدایکبوونی مەسیح دەبینن، بریتیین لە چوار شوان و حەوت مەڕ و سێ زانا و چەند فریشتەیەک.

ئەم ڕۆمانە لەلایەن کاک سیروان مەحمودەوە کراوە بەکوردی، لە ٢٦٨ لاپەڕەی نیو ئەی فۆر پێکهاتووە، تیراژی ٦٠٠ دانەیە و نرخی چوار هەزار و پێنج سەد دینارە.

## گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوكم




ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێ گفتوگۆ لەنێوان شاعیر و نووسەری گەورەی عەرەب ئەدۆنیس، لەگەڵ کچەکەی خۆیدا، واتە گفتوگۆی نێوان باوک و کچێکە. بێگومان ئەم کتێبە پڕە لەو پرسیارە بوێر و ئازایانەی کە نینار، کچەکەی ئەدۆنیس، ئاراستەی باوکی کردووە. ئەدۆنیسی باوک، وەک پیشەی

هەمیشەیی بەوپەڕی بوێر و ڕاشکاوانەوە وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوە.

ئێمە لەمیانەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە، زۆر زیاتر و بەشێوەیەکی باشتر، جیهانی ناوەوە، واتە جیهانە تایبەتەکەی ئەدۆنیس دەناسین و باشتر لە فیکر و تێڕوانییەکانی ئەم پیاوە بۆ مرۆڤ و گەردون مەسەلەی باوکایەتی تێدەگەین. واتە ئەم کتێبە، لە بەشێکیدا، هەوڵێکە بۆ ناساندنی دیوی دووەمی ئەدۆنیس. ئەو دیوەی کە لە شیعر و نووسینەکانیدا لەوانەیە نەیدۆزیتەوە. چونکە پرسیارەکان سەبارەت بە شیعر و نوسینەکانی نییە، بەڵکو پرسیارەکان وەک ئینسان و باوک و وەک شاعیرێک ئاراستەی ئەدۆنیس کراوە. تەنانەت نینار لە پێشەکی کتێبەکەدا دەنوسێت: ئەوەی وای لە من کرد ئەم چاوپێکەوتنانە لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا بکەم پەیوەندی بەوەوە بوو کە خۆم پێویستم بەوە بوو بیناسم، هەروەها بە تایبەت پێویستیشم بەوە بوو هەردووکمان پێکەوە قسە بکەین و لەگەڵ یەکتریدا دابنیشین. من پرسیارەکانم وەک کچێکی خۆی لێکردووە، نەک وەک ڕۆژنامەنووسێک یان ڕۆشنبیرێک یاخود وەک نووسەرێک.

وەرگێڕی کتێبەکە بۆ ناساندنی کتێبەکەی بە خوێنەر، لە بەرگی پشتەوەی کتێبەکەدا پەیڤێکی جوانی لەسەر کتێبەکە و ناوەڕۆکی کتێبەکە نوسیوە کە لێرەدا وەک خۆی دەینوسینەوە: (خانمە هونەرمەند نینار ئیسبەر، کچی ئەدۆنیس، لەدایکبووی ١٩٧١، لە دە بەشی یەک لە دوای یەک و پێکەوە گرێدراودا، نزیکەی سەد پرسیار وەک باوک و شاعیر لە ئەدۆنیس ئەکات، پرسیارەکانی سەرەتا لەسەر دەستپێکردنی خوێندن و پەیوەندی ئەدۆنیس لەگەڵ ئیسلام، شیعر، سوریا وەک جێگای لەدایکبوونی و لوبنانیش وەک شوێنی نیشتەجێبوون، بەتایبەت لەو ساڵانەدا کە جەنگ هەموو شتێکی وێرانکردبوو. دواتر پرسیارەکانی نینار لە ئەدۆنیس ژن، لەچک، دینە تاکخواییەکان و تیرۆریزمە. ئەدۆنیسیش زۆر بە کراوەیی و بێ چەندوچوون وەڵامی پرسیارەکانی ئەداتەوە و باس لە وەفا، هاوڕێیەتی، هەوەسبازی و لایەنی داهێنان ئەکات. نیناریش وەک کچێکی گەنج کە خاوەن زمانێکی گوزارشتکەر و ئازادە ڕەخنەی توند لە تێڕوانینی پیاوەکان ئەگرێت لەسەر ژن لە وڵاتە عەرەبییەکاندا. ئەم کتێبە وانەیەکی دوولایەنەی گرنگە لەسەر ئازادی).

کتێبی گفتوگۆ لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکم، لەلایەن کاک هیوا قادرەوە بە زمانێکی کوردی پوخت کراوە بە کوردی و لە ٢٥٦ لاپەڕەی قەبارە بچوک پێکهاتووە، تیراژی ١٠٠٠ دانەیە و نرخی چوارهەزار و پێنج سەد دینارە.

## لەبارەی یۆگا و ڕۆحانییەتەوە



یۆگا یەکێکە لەو وەرزشە ڕۆحانییەی لە ئێستای هەرێمی کوردستاندا، برەوی هەیە و خەڵکانێک هەن ئـارەزوی ئەم جۆرە وەرزشـە ڕۆحییەن و کۆمەڵەی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز هاوبیر کامەران-ەوە نوسراوەتەوە کە خۆی بۆ ماوەی ١١ساڵ مامۆستای یۆگا بووە و زیاتر لە ٣٠٠ کتێبی لەسەر یۆگا خوێندوەتەوە و بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەیان وڵات و شار و گوند گەڕاوە.

لێرەوە ئەم کتێبە دەروازەیـەکـی گـەورە و فراوانە بۆ ناسینی یۆگا و مەسەلە ڕۆحانییەکان و نووسەری ئەم کتێبە لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بەوەی یۆگا چییە، ئاوا وەڵامدەداتەوە: یۆگا ئەو ڕێگەیەیە کە تۆ لە چوارچێوە ماددی و زهنییەکان دەردەهێنێت و ئاشنات دەکات بە ڕۆحانییەت. هەربۆیە ناتوانین بڵێین یۆگا فەلسەفەیەکی هیندییە، وەک ئەوەی کە زۆرینەی خەڵک دەیلێن، بەڵکو یۆگا زادەی هەوڵی هەموو مرۆڤایەتییە بۆ گەیشتن بە هەقیقەت کە لەودا نەمریی هەیە.

هەروەها نووسەری ئەم کتێبە لە بەشێکی دیکەی قسەکردنی لەسەر چییەتی یۆگا دەڵێت: یۆگا نە فەلسەفەیە نە دینە نە وەرزش و نە ڕێگەچارەسەرێکی نەخۆشییە دەروونییەکانە، بەڵکو یۆگا ڕێگایەکی (زانستی -کـرداری) عیرفانییە، واتە ڕێگەیەکە بە تیۆری و بە کرداری وامان لێ دەکات خۆمان بناسین. ڕێبازێکە ئێمە بەرەو حەقیقەت دەبات و لە ڕاستەقینەی خۆمان و لە ڕاستەقینەی بـوون و نەبوونمان نزیک دەکاتەوە. هەربۆیە یۆگا بە مانا گشتییەکەی ڕێگەیەکی عیرفانییە مرۆڤ لە هەقیقەت نزیک دەکاتەوە.

لێرەوە و لەبەر ڕۆشنایی قسەکانی نووسەری کتێبەکەدا، خوێنەر دەگاتە ئەو بڕوایەی یۆگا هەوڵێکە بۆ تێگەشتن لە خود و لە دونیا، هەوڵێکە بۆ فراوانکردنی مەودای بینینی ناوەوەی مرۆڤ و دەرەوەی کە خۆی لە گەردون و سروشت و تەواوی زیندەوەرەکانی دیکەدا دەبینێتەوە. یۆگا دێت تاکو هێزی خۆڕاگری و متمانە بەخۆکردنمان زیادبکات. دێت و پێمان دەڵێ مرۆڤ خاوەنی دەیـان هێزی شـاراوەیـە کە لەقوڵایی ناخیدا شاردراوەتەوە و لەناوەوەی دەرونیدا بەسەریەکدا کەڵەکەبووە. ئەم هێزە شاراوانە دەکرێ لە ڕێگەی ئەنجامدانی یۆگاوە بۆ سود و بەرژەوەندی گشتی بەکاربهێنرێن و مرۆڤایەتی بتوانێت کەڵکیان لێوە وەربگرێت.

سەرەڕای ئەوە، یۆگا هەوڵێکە بۆ دوورکەوتنەوە لـە جیهانی مـادیـی و بـەرخـۆری، هەوڵێکە بۆ کەمکردنەوەی ئەو هەڵپە نائاسایی و نا مرۆڤانەیەی کە لە ئێستادا ئادەمیزادی گیرۆدە کردووە و تەواوی ژیانی بۆ خستووەتە گەڕ و هیچ ڕەهەندێکی ڕۆحی و ناوەکی نەهێشتووە و ژیانی کردووە بە پارچەیەک لە بەرخۆری و مادییات و کڕینی کاڵا. ئەم کتێبە دێت تاکو پێمان بڵێت بۆ ئەوەی لەززەت لە جوانی و لە ژیان بکەیت، بۆ ساتێک لە دونیای مادییات و بەرخۆری دوورکەوەرەوە و دەستوپەنجەت لەگەڵ یۆگادا نەرم بکە، تا بزانیت چی لە دەروون و لە قوڵایی ناخدا دەگـوزەرێـت، ئەو شوێنەی پڕە لە جوانی و لێوانلێوە لە ڕۆح. واتە یۆگا دێت و لایەنی ڕۆحی و عیرفانی مرۆڤەکان دەوڵەمەند دەکات و بۆ ساتێک لەو جەنجاڵی و هەراوزەنایەی دەرەوە دووریاندەخاتەوە.

کتێبی لەبارەی یۆگا و ڕۆحانیەتەوە، لە ٣٨٨ لاپـەڕەی مامناوەندی پێک هاتووە. تیراژی ٧٥٠ دانەیە و نرخی ٦٠٠٠ دینارە.

# کتێبخانە.. لەنێوان سەرهەڵدانە و ناسینیدا




ئەم کتێبە باس لە مێژووی سەرهەڵدان و دروستبوونی کتێبخانە دەکات. بێگومان لای هەموان ئاشکرایە چۆنیەتی ڕێکخستن و چۆنیەتی تۆمارکردن و وەرگرتنی کتێب و بڵاوکراوەکان لە کتێبخانەیەکدا، زانستێکی سەربەخۆیە و پێویستی بە فێربوون و کاری بەردەوامە. واتە کتێبخانە تەنها ئەوە نییە لە چەند ڕەفەیەکی پڕ کتێب پێکهاتبێت و تەواو، بەڵکو کتێبخانە لەمڕۆکەدا بووە بە زانست و پێویستی بە خوێندن و شارەزایی و ڕاهێنان هەیە. بەتایبەت بۆ کتێبخانە گشتییەکان بە بە هـەزاران کتێب و بڵاوکراوە و ناویشان لەخۆدەگرن.

ئێمە لـەم کتێبەدا زانیارییەکی زۆر لەسەر چۆنیەتی سەرهەڵدانی کتێبخانە و بیرۆکەی دروستبوونی کتێبخانە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهاندا، دەخوێنینەوە. ئەمە جگە لەوەی چەندین ڕێنمایی سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کتێب و شێوازی وەرگرتنی و چۆنیەتی پۆلێنکردنی و دەیانی شتی دیکە دەخوێنینەوە کە هەر هەمویان پەیوەستن بە مەسەلەی کتێب و کتێبخانەوە.

واتە دەتوانین بڵێین ئەم کتێبە پانۆرامایەکی گشتیە سەبارەت بە سەرهەڵدانی کتێبخانە لە کۆنەوە بۆ ئێستا و باس لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کتێب و کتێبخانە دەکات، چ لە خۆرهەڵات و چ لە خۆرئاوادا. نووسەری ئەم کتێبە یەکێکە لەو بەڕێزانەی چەندین ساڵە سەروکاری لەگەڵ کتێبخانەدایە و نزیکەی بیست ساڵ زیاترە لە کتێبخانەی زانکۆدا کار دەکات. ئەم ماوە زۆرەی کارکردن لە کتێبخانەدا، دەرفەتێکی گەورەی بۆ ڕەخساندووە تا لە نزیکەوە لە تەواوی ئەو کێشە و کەموکوڕیانە تێبگات کە کتێبخانەکان بە دەستییەوە دەناڵێن.

لێرەوە نووسەری کتێبەکە بەڕێز جەزا ئەحمەد قادر، بیری لە نوسینەوەی ئەم کتێبە کردووە تا بتوانێت لەم ڕێگەیەوە و بەشێوەیەکی زانستی و وەک عیلمێک باس لە کتێبخانە و جۆرەکانی و چۆنیەتی ڕێکخستنی بکات. لە ڕاستیدا کتێبەکە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند و گرنگە بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی لە کتێبخانەکاندا کاردەکەن، چ کتێبخانە گشتییەکان بێت یـان کتێبخانە تایبەتییەکانی نووسەران و ڕۆشنبیران و چ ئەو کتێبخانانەی لە ماڵەکاندایە.

نووسەر بۆ ئەوەی بە ئاسانی خوێنەر لە کتێبەکەی تێبگات، کتێبەکەی کردووە بە دە بەشەوە و لە هەر بەشێکدا، قسە لەسەر لایەنێکی کتێبخانە دەکات. لە بەشی پێنجەمەوە بۆ بەشی دەیەم کە زۆرترین لاپەڕەی کتێبەکەی لەخۆگرتووە، باس لە جۆرەکانی کتێبخانە دەکات و بەم شێوەیە پۆلێنی کردووە:
کتێبخانەی گشتی، کتێبخانەی منداڵان، کتێبخانەی

نەخۆشخانە، کتێبخانەی قوتابخانە، کتێبخانەی تایبەت، کتێبخانەی نیشتیمانی. لەپاڵ هەر یەکێک لەو جۆرە کتێبخانانەدا، باس لە تایبەتمەندی و قەبارەو جۆرەکانی و ئامەنجەکانی و ڕێنمایی خواستنی کتێب و چەندین بابەتی دیکە کراوە.

لەم کتێبەدا زۆر بە وردی باس لە ڕۆڵ و کاری کتێبخانە کراوە و وەک زانستێک تەماشای کتێبخانە کراوە. بۆ نمونە لە کتێبخانەی منداڵاندا باس لە کتێبخانەی گەڕۆک کراوە و باس لە مێژووی سەرهەڵدانی کتێبخانەی گەڕۆک و تایبەتمەندییەکانی و ئامانجەکانی و پلانی کتێبخانە گەڕۆکەکە پێش ئەوەی بڕوات بۆ جێگاکانی دیکە. هەروەها لە کتێبخانەی نەخۆشخانە باس لە ئەرکەکانی کتێبخانە و کارمەندەکانی کتێبخانەکە کراون و باس لە ئامانجی کتێبخانەکە دەکات.

دواجار ئەم کتێبە بە زمانێکی کوردی جوان نوسراوەتەوە و خوێنەر بە ئاسانی لێیتێدەگات. کتێبەکە لە ٤٧٨ لاپەڕەی قەبارە گەورە پێکهاتووە، تیراژی ٥٠٠ دانەیە و نرخی هەشت هەزار دینارە.

## لەشم

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە بەسود و پڕ زانیاریانەی بۆ منداڵ نوسراوە. ڕاستە ئەم کتێبە تایبەتە بە منداڵ، بەڵام لەهەمانکاتدا بۆ مرۆڤی گەورەش سودێکی زۆری هەیە، بەتایبەت بۆ ئەو مامۆستایانەی لە قوتابخانەکاندا وانەی زانست بۆ هەموان دەڵێنەوە. چونکە کتێبەکە، لە ڕێگەی چەندین پرسیارەوە، باس لە جەستەی مرۆڤ دەکات. پرسیارەکانی ناو ئەم کتێبە، دەکرێ هەموو منداڵێک و هەمو کەسێکی گەورەش بیکات و بەدوای وەڵامەکانیدا بگەڕێت.

ئەم کتێبە وەک لە بەرگی یەکەمیدا نوسراوە:




(یەکەمین کتێبی زانیارییەکانم) لەلایەن بەڕێز د. ئارام عەلی، لە سویدییەوە کراوە بە کوردی. بەو مانایەبێت ئەم کتێبە کتێبی دیکەی هاوشێوەی ئەمەی بەدوادادێت. ئەمەش هەوڵێکی گرنگ و پڕ بایەخە بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی منداڵان لەم جۆرە کتێبانە. چونکە وەک لای هەموان ئاشکرایە، کتێبخانەی منداڵ یەکێکە لە هەژارترین کتێبخانەکانی ئێمە و زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێم ڕەنگە کتێبی لەم جۆرەی تێدانەبێت. لەمڕۆدا ئیشکردن لە بواری کتێبی منداڵان، کارێکی تابڵێی پێویستە و ناکرێت چیتر پشتگوێ بخرێت. لێرەوە هیوادارین تەواوی دەزگا ڕۆشنبیری و کەلتورییەکان و تەواوی ئەو ناوەندانەی کاری سەرەکییان چاپکردنی کتێبە، ئاوڕێکی جدیی لە کتێبی منداڵ بدەنەوە و تەکانێک بەم بوارەی کتێب بدەن.

ئەم کتێبە نرخی ٤٠٠٠ دینارە